پێش رووخاندنی سۆڤیەت لەئەنجامی پێشبڕکێی هەردوو بلۆکی سۆسیالیستی و ئیمپریالیستی بنبەستبونێك جێگای باس بوو. چونکە لەئەنجامی ئەو هاوسەنگیەی کە هەردوو بلۆك دروستیان کردبوو, هەموو هێز و وڵاتانی تر ناچار کران کە بچنە پاڵ یەکێك لەو دوو بلۆکە. سیاسەت و ستراتیژی ئەو دوو زلهێزە یاخود ئەو دوو بلۆکەش لەسەربنەمای خۆ بەهێزکردن و خۆ پڕچەك کردن دادەڕێژرا و بەرژەوەندی خۆیان لامەبەست بوو نەك بەرژەوەندی گەلان. ئەمەش لەئاستی نێو نەتەوەییدا پێشکەوتنەکانی دەخنکاند و بنبەستی دەکرد, کێشەی گەورەتری لەگەڵ خۆیدا دەهێنا و قووڵی دەکردنەوە.

دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت کۆتایی بەو جەمسەرگیرییە هات. ئەمەش رێگای لەبەردەم تێکۆشانی رزگاری گەلان کردەوە و توانستی زیاتر بۆ تێکۆشانی ئازادی و دەرفەتی سەرکەوتنیش زیاتر فەراهەم بوو. ئەگەر بێت و ئیمپریالیزم لەمیانەی هەوڵ و کۆششە هەمەلایەنەکانیدا سیاسەت و ستراتیژێکی جیاوازی پێش نەخستبایە, ئەوا لەدژی ئیمپریالیزم پێشکەوتنی زۆر جددی دەردەکەوتنە مەیدان. لەڕاستیدا بانگەشەکردن بۆ سیستەمی جیهانی نوێ و دارشتنی سیاسەتێکی وەها بەئامانجی کۆنترۆڵ کردنی پێشکەوتنەکان و پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە بوو کە لەدوای رووخانی سۆڤیەت هاتە ئاراوە. بەڵام ئەوەی ئیمپریالیزم هیوای دەکرد پێك نەهات, چونکە کەوتە نێو هەندێك حسابی هەڵە و وای لێکدەدایەوە کە لەبەرامبەر بلۆکی سۆسیالیزمی بونیادنراو سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. کەچی لەڕاستیدا هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو بەواتای سەرکەوتنی بلۆکی ئیمپریالیستی نەدەهات. بەڵکو بەواتای دەرکەوتنی ئەو بزمارە دەهات کە هاوسەنگی دنیای پێوە بەندبوو. چونکە لەهاوسەنگی کۆندا، سۆڤیەت و وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا, دوو هێزی ناوەندی بوون و بەهەردووکیان هاوسەنگییەکیان لەجیهاندا دروست کردبوو، بەنەمانی سۆڤیەت ئەم هاوسەنگییە نەما و کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم و بەکەوتنە نێو سەدەی بیست و یەکەم، بەئامانجی لێگەڕین بۆ هاوسەنگی, سیستەمێکی نوێ لەئارادایە و بۆ ئەمەش هەموو هێزێك لەنێو تێکۆشاندایە. نەك تەنها لەگۆڕەپانی سۆڤیەت بەڵکو لەهەموو شوێنێکی جیهان هێزەکان

لەنوێوە خۆیان بونیاد دەنێنەوە و هێزی نوێتر دروست دەبن. لەساڵانی 90 بەدواوە شەڕ و دۆستایەتی و دوژمنایەتی نوێ دەرکەوتنە مەیدان, ئەمەش بەواتای ئامادەکاری هاوسەنگی نوێ دێت. هەڵبەتە لەڕەوشێکی وەهادا ئاساییە کە شەڕ لەنێوان ئەو هێزانەدا دەربکەوێت کە دەیانەوێ ببنە هێز و مەزن ببن. لەم پێکدادانەشدا هەموو شێوازێکی ئاشکرا, نهێنی, سیاسی, دیپلۆماسی و... هتد بەکار دەهێنرێت و هەموو کەسێکیش دەیەوێت سود لەم قۆناخە وەربگرێت و پێش ئەوەی هاوسەنگی نوێ دروست بێت جێگە و پێگەیەکی بەهێز بۆ خۆی مسۆگەر بکات. چونکە هەر هێز و وڵاتێك ئەو راستییە باش دەزانن کە ئەگەر هاتوو هاوسەنگی نوێ دروست بوو ئەوا زەحمەتە بتوانرێت ئەو هاوسەنگیە بەئاسانی خەراپ بکرێت و ماوەیەکی درێژ بەردەوام دەبێت. ئەمە نەك تەنها بۆ هاوسەنگی جیهان بەڵکو بۆ هاوسەنگییە هەرێمییەکانیش راستە.

ئەمرۆ پێشبڕکێیەك لەنێوان وولاتە سەرمایەدارە گەورەکاندا هەیە, بۆ ئەوەی خۆیان بەهێز و باڵادەست بکەن, ئەم راستییەش لەسیاسەتی ئەو هێزانەدا سەبارەت بەڕۆژهەڵاتی ناوین و بەڵکان و قەفقاسیا و رۆژهەڵاتی ئەوروپا... هتد بەئاشکرا دیار دەبێت.

بەتایبەت ئەمرۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەهۆی گرنگی مێژوویی و ژیۆستراتیژییەکەی بۆتە ناوەندی ئەو تێکۆشانەی نێوان هێزەکان. لەدوای رووداوی 11 ی ئەیلول و دەستێوەردانی ئەفغانستان و هەوڵ و کۆششەکان بۆ دەستێوەردانی ئێراق. تێکۆشانی ئەو هێزانە زیاتر لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست چڕبۆتەوە.

لێرەدا "هەرچۆنێك بێت ئەمڕۆ بەشی هەرە زۆری مرۆڤایەتی لەنێو ئاگردا ژیانی خۆیان بەڕێوە دەبەن، ئەمریکای لاتین، باشووری ئاسیا، قەفقاسیا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کیشوەری ئەفریقیا، بەشێکی زۆری وڵاتانی سۆسیالیستی کۆن لەنێو قەیرانێکی گەورەی ئابووریدا دەژین، بەڵام ئەمریکا و ئەوروپا لەنێو گڕی ئاگری دنیادا وەك بڵێی دوو دورگەی بەهەشتین. لەهەموو جیهاندا دواکەوتنێکی خێرا لەئارادایە، وەك بڵێی رووداوەکە بەرەو لێکدانەوەیەکی مەزن دەچێت.

پێشتر ئەمریکا لەبەرامبەر سۆسیالیزمی بونیادنراو نوێنەرایەتی هێزی ناوەندی ئیمپریالیستی دەکرد, ئەمە لەهەموو روویەکەوە بەم شێوەیە بوو. سەرۆکایەتی کردنی ئەمریکا لەڕووی ئابووری و سەربازی و تەکنیك و هەڵمەتی سیاسی، گفتوگۆی لەسەر نەدەکرا. بەڵام لەناوەڕاستی ساڵانی 70 دا ئەم رەوشە تاڕادەیەك گۆڕانکاری بەسەردا هات, بەبلاوبوونەوەی سۆڤیەتیش ئەو گۆڕانکارییە خێراتر بوو. بۆیە ئەمریکا ناچاربوو هێزی خۆی دابەش بکات.

ئەمرۆ دەتوانرێت باس لەسێ دەوڵەتی ئیمپریالیستی بکرێت ئەمریکا، ژاپۆن، ئەورووپا، بێگومان لەنێوان ئەمانەشدا تائێستا ئەمریکا لەهەمووویان بەهێزترە. واتە ئەمریکا لەئاستی یەکسانی لەگەڵ ئەمانەدا یەکەمە. ئەگەرنا وەکو پێشتر سەرۆکێکی وانییە کە گفتوگۆی لەسەر نەکرێت. لەداهاتوویەکی نزیکیشدا دوو هێزی تر لەسەر ئەوانە زیاد دەبن ئەویش چین و روسیان. هێزە ئیمپریالیستییەکان پێشتر لەبەرامبەر سۆڤیەت سیاسەت و ستراتیژێکی هاوبەشیان دادەڕشت و لەسەر ئەو بنەمایە دەهاتنە لای یەکتری, بەڵام لەڕۆژی ئەمڕۆدا ناکەونە نێو هەمان هەڵوێستی هاوبەش. هەڵبەتە ئەمەش گەلێك هۆکاری خۆی هەیە. هێزەکان بەگوێرەی یەکتری تا بڵێی رەوشیان جیاوازە، ئەو جیاوازیە چی دەبێت بابێت قۆناخ لەناوەندی هێزدا بەئاراستەی بڵاوبوونەوە و دابەشبوونی هێزدا پێشدەکەوێت".

هێزە ئیمپریالیستیەکان بۆ ئەوەی بازاڕی باشتر و باڵادەستی سیاسی خۆیان فەراهەم بکەن, کەوتونەتە نێو پێشبڕکێیەك. ئەو پێشبڕکێیەش ناکۆکی لێدەکەوێتەوە و تادەچێتیش ناکۆکییەکان قووڵتر دەبنەوە. بەدرێژایی سەدەی 21میش دەبینە هێزی ئەو تێکۆشانەی کە ئەو هێزانە لەبەرامبەر یەکتری بەڕێوەی ببەن.

ئەگەر بێت و رێباز و شێوازی نوێی تێکۆشان پێش نەخرێت ئەوا زەحمەتە بتوانرێت رێگا لەبەردەم ئەو مەترسیانە بگیردرێت کە ئەو هێزانە دروستی دەکەن، دەیانەوێت، داگیرکردنی بەناهەق دەستێوەردانەکان، لەژێر ناوی دیموکراسی و مافی مرۆڤ، "هیومانیزم" و دەستەواژەی هاوشێوەی ئەمانە رەوا بکەن. بەڵام هەڵبەتە ئەمەش وەکو پێشوو بەئاسانی بۆیان مەیسەر نابێت. چونکە ئەو وڵاتانەی تووشی فشار و گوشار و هەڕەشەی دەستێوەردان دەبن، بەئاسانی ئەوەی کە بەسەریاندا دەسەپێنرێت پەسند ناکەن و لەمەش زیاتر بەپشت بەستن بەهێزی خۆیی رێگای بەرخۆدان و تێکۆشانێکی بەشەرف هەڵبژێرن.

ئەو ژیانەی کە ئەو هێزانە پێی دەڵێن ئازادی، ژیانێکی بێ ناوەڕۆك و گرێدراوە بەتەکنیك و بەنج کردنی راستی یەکان و هێزی گەوهەری مرۆڤی وەکو ئامرازێك لێکردووە. لەفکر و رۆحدا مرۆڤی دیل کردووە. ئەو پروپاگەندانەی کە لەدەزگاکانی راگەیاندن و تەلەفزیۆن و سینەما و رۆژنامەکانیشدا ئەنجامی دەدەن جگە لەساختەیی ئەو ژیانە گوزارە لەهیچ شتێکی تر ناکات.

پێشتر ئیمپریالیزم لەرێگای ئەو پروپاگەندانەی مرۆڤەکانی لەبەرامبەر کۆمۆنیزم و سۆسیالیزم دەخستە بزاوتن و لەبەرئەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو مرۆڤەکانی خۆی لەبەرامبەر مرۆڤی گۆشکراو بەشێوە ژیانی کاپیتالیستانە وەکو ئەلتەرناتیف پێش نەخست و شێوە و ناوەڕۆکی سۆسیالیستانەی زانستی پێ نەدا، رێگای بۆ هەوڵ و کۆششەکانی ئیمپریالیستی ئاسان کرد, تاوەکو بتوانێت بەئاسانی بەئامانجەکانی خۆی بگات. هەروەکو

ئەوەی کە بەئاشکراش لەئەزموونی سۆڤیەتدا بینیمان، ئەگەر بێت و مرۆڤی سۆسیالیستی ئاوا نەکرێت، ئەوا ئەو کۆمەڵگا و دەوڵەتە، هەرچی ئەنجامیشی بدات، لەئەنجامدا مەحکومی بن کەوتنە. سۆسیالیستی بونیادنراو, لەجیاتی ئەوەی لەرێگای پرۆلیتاریاوە دەوڵەت سنووردار بکات و ئازادی تاك و کۆمەڵ فەراهەم بکات و دینامیکییەتی کۆمەڵگا بخاتە گەڕ کەچی بەپێچەوانەی گەوهەری سۆسیالیسم هەموو کارێکی بۆ بەهێز کردنی دەوڵەت بوو. پارتی و کەسایەتی حوکمیان دەکرد ئەمەش هۆکارێکی تری هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت بوو.

فەرامۆشکردنی لایەنی رۆحی و مۆراڵی مرۆڤ، لەسۆسیالیزمی بونیادنراودا، لاوازییەکی مەزن بوو لەگەوهەری سۆسیالیزمی زانستی. بۆیە لەبەرامبەر ئاکارەکانی ئیمپریالیستی کە بەشێوەی چاوسورانە پێشکەوتنی تەکنیك لەبەرامبەر مرۆڤایەتی بەکار دەهێنێت و لەرێگای زانستەوە مرۆڤ بەنج دەکات و بێ هێزی دەکات و دەیگەیەنێتە ئاستی ئاژەڵێکی بەکاربەر و سفری دەکات، پێویستە دووبارە بگەڕێینەوە و سەرلە سۆسیالیزم بدەین.

ئیمپریالیزم بێ ئاگایە لەو راستییەی کە ئەو دەستێوەردان و وێرانکارییەی کە لەهەموو شوێنێکی جیهاندا ئەنجامی دەدات، دەبێتە زەمینەی شۆڕشێکی سەرتاپاگیر, کە خاوەنی رێنماییەکی یەکجار قووڵ و مەزن دەبێت. بۆیە لێرەدا هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی ئیمپریالیزم بەپشت بەستن بەئەزموونی سۆڤیەت و تیۆری سۆسیالیزمی زانستی و خوڵقاندنی شێوە ژیانێکی نوێ بۆ مرۆڤایەتی ناچاریەکە.

رێگای رزگارکردنی ئەو مرۆڤەی کە لەژێر باری تەکنیك و ئاکارە نابەجێکانی ئیمپریالیزمدا خراپ بووە. بەدەرخستنە پێشی لایەنی مرۆڤایەتی و رۆحی مۆرالی و بەچالاك کردنی ئەمانەدا دەرباز دەبێت, خودی سۆسیالیزمیش شتێکی لەمە بەدەری نییە. هەروەکو لەو پەرتوکەی کە لەبەردەستاندایە سەرۆك ئاپۆش دەڵێت "سۆسیالیزم؛ زانستی مرۆڤە. زانستێکە کە بەردەوام باوەڕی و هیوا و مۆراڵ بەمرۆڤ دەبەخشێت. لەڕاستیدا تایبەتبوونی گەوهەری سۆسیالیزمی PKK ش لەم خاڵەدا سەرچاوە دەگرێت, هەر ئەو تایبەتمەندیەشە کە PKK ی والێکردووە هیچ کاتێك بن نەکەوێت. ئیمپریالیزم مرۆڤی دابڕاندووە و خستویەتە رەوشێك بەکەڵکی هیچ نەیەت و ببێتە بەڵا. ئەوەی کە مرۆڤ لەقاڵبە کۆنەکانیش رزگار دەکات سۆسیالیزمی زانستییە, کە لەقسەی مرۆڤ زیاتر گەوهەر و چالاکی مرۆڤ بەبنەما دەگرێت. PKK لەسەرەتاوە مرۆڤێکی پەسند نەکردووە کە لەمیانەی چەمك و تایبەتمەندیە کۆنەکان نوێنەرایەتی ژیانێکی پووچ دەکات و دەیەوێت بەردەوامیان پێ بدات، بەڵکو لەمیانی تێکۆشانێکی چڕی ئایدیۆلۆژی و رێکخستنی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووری و ... هتد بەردەوام لەهەوڵی گۆڕینی ئەو کەسایەتی و ژیانە کۆنەدا بووە. لەمیانی پەیڕەوکردنی

ڕێبازێکی ڕاستی سۆسیالیستی لەو تێکۆشانەدا، ئەوەی سەلماندووە کە سۆسیالیزم تا چ ڕادەیەك توانای گۆڕینی مرۆڤی هەیە.

لەدونیایەکدا کە بەتەکنیك دەوری دراوە. لەهەلومەرجێکدا کە دەیەوێت گەوهەری پێشکەوتنی مرۆڤایەتی بخنکێنرێت. پەیڕەوکردنی ئایدیۆلۆژیا و ڕێبازی سۆسیالیزمی زانستی لەلایەن PKK وە بێ ئەوەی ڕێگا بەهیچ لادانێك بدات، لەتێکۆشانی سۆسیالیزمی نوێدا هەناسەی قۆناخێکی نوێیە.

ئەمە نەك لەئاست سنووری نەتەوەیی و چینایەتی، بەڵکو لەئاست و سنوری نێو نەتەوەییشدا وەکو هێزی بانگەشەی سۆسیالیزمێکی نوێ دەرکەوتە مەیدان. هەرلەبەر ئەوەشە نەك تەنها تورکیا بەڵکو تەواوی وڵاتانی ئیمپریالیزمیش, PKK وەکو هێزێکی مەترسیدار دەبینین بۆ خۆیان و هەرلەبەرئەوەشە پەسندی ناکەن.

PKK لەمیانی ئەو تێکۆشانەی کە بۆ خوڵقاندنی مرۆڤ و ژیانی نوێ بەڕێوەی دەبات. جارێکی تر چەمکەکانی ئازادی و یەکسانی گەڕاندەوە پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان و پێوانەی نوێ و تۆکمەی لەنێوان مرۆڤەکان جێگیر کرد.

لەوەڵامی پرسیاری ئایا ئێوە لەو هەلومەرجانەدا زەحمەتی نابینن" کە لەلایەن پەیامنێرێکی تەلەفزیۆنی ئەلمانیەوە ئاراستەی کچە گەریلایەکی ئەڵمانی کرابوو، "گوتبوی بۆ من پەیوەندی ساردی مرۆڤی ئەوروپا لەهەلومەرجی ئەو ژیانە گەلێك زەحمەتترە" بەڵێ هێز و واتای وەڵامێکی بەم شێوەیە ڕووناکی خۆی لەم ڕاستییەوە دەگرێت کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد.

باش دەزانرێت ئەوەی لەمێژوو و ئەمڕۆدا ئاراستەی بەسەرکەوتن و بن کەوتنی شەڕەکان داوە چین؟ هەڵبەتە ئەوەی لەسەر بنکەوتن و جێگە نەگرتن بەگوێرەی ستراتیژی و تاکتیکی دوژمن قووڵ نەبێتەوە، ئەوا لەبنکەوتن ڕزگاری نابێت. پێویستە ئەو مرۆڤە بخوڵقێنرێت کە ڕۆڵ بگێڕێت و قەدەر دیاری بکات، مەرجی سەرکەوتن پێك بهێنێت و هەلومەرجی بنکەوتن هەرەس پێ بێنێ. مرۆڤ و باوەڕی سۆسیالیستانەن کە ئاراستەی پێشکەوتن دیاری دەکەن و بەلای سەرکەوتندا دەیشکێنێتەوە. مەگەر تەکنیك لەو جێگایەدا ئەنجام بگرێت کە مرۆڤی ئازاد و بەهێزی تیانەبێت. لەم چوارچێوەیەشدا دەتوانرێت وەڵامی پرسیارەکانی وەکو سۆسیالیزمی بونیادنراو چۆن ڕوخا؟ PKK چۆن قازانج دەکات بدەینەوە.

لەمیانی بەکارهێنانی ئەو تەکنیکەی کە لەئەوروپای ڕۆژئاوا پێشکەوتووە بەشێوەیەکی چەوت و نامرۆڤانە، بۆتە هۆی لەنێوبردنی ئیرادە و باوەڕی و مۆراڵی مرۆڤ, تەکنیکی دەستی سەردەستەکان مرۆڤی تێك شکاندووە. یەکێك لەهۆکارەکانی ئەو تاکڕەوییە بێ سنوورەی کە لەئەوروپای ڕۆژئاوا پێشکەوتووە و وای لەمرۆڤ کردووە کە بەهیچ شێوەیەك بەکێشەکانی

مرۆڤایەتییەوە خەریك نەبێت، ئەمەیە، کە ئەو تەکنیکەی لەلایەن سەردەستەکانەوە پێش دەخرێت. روخساری مرۆڤی هەنوکەیی حوکم دەکات و بێ ئیرادەی دەکات.

تەنها بەگوتنی بەسە و بەشێوازی قەبە ناتوانین کۆکوژی ئیمپریالیزم و داگیرکەری بەربەست بکەین، چونکە شێواز و رێبازی ئیمپریالیستی و داگیرکەری قەبە ئاشکرابووە و بێ ئەنجام ماوەتەوە. ئیمپریالیزمیش بۆ گەیشتن بەئامانجەکانی رێبازی جیاجیا پەیڕەو دەکات. لێرەدا ئەوەی گرنگە بینینی شێواز و رێبازە وردەکانە. لێرەدا بەئاسانی دەتوانرێت دەرك بەوە بکرێت کە بەئەندازەی پێویستی مرۆڤ بۆ نان و ئاو پێویستی بەسۆسیالیزم هەیە. واتە " تاکە ئاییندەی مرۆڤایەتی سۆسیالیزمە" ئامانجی هەرە بنچینەیی PKK ئەوەیە کە مرۆڤێکی نوێ و ژیانێکی نوێ بخولقێنێ. هەڵبەتە خودی ئەو ژیانەش لەلایەن مرۆڤەوە ئاوا دەکرێت.

ئەو تایبەتمەندییانە بەرِوونی لەو تێکۆشانەدا دەبینرێت کە لەکوردستاندا بەرِێوە دەبرێت. ئەو شەڕ و تێکۆشانەی کە هەیە لەپێناو ژیاندا بەرِێوە دەبرێت، لەم رێگایەوە ژیانێکی نوێ و ئازاد دەردەخرێتە مەیدان. سەرکەوتن و پێشکەوتنەکانیش لەسەر ئەم بنەمایە پێك دێت.

PKK بەتایبەتیش سەرۆکایەتییەکەی لەدوژمن زیاتر لەو گۆڕەپانە قاڵ دەبنەوە، شیکردنەوە لەدوای شیکردنەوە ئەنجام دەدات. بێگومان قووڵ بوونەوە لەگۆڕەپانی مرۆڤ و ژیان، باشترین رێگای شەڕە لەبەرامبەر ئیمپریالیزم و داگیرکەران. بەردەوام بوونی ئەو شەڕ و تێکۆشانەش بێ هیچ گومانێك سەرکەوتن مسۆگەر دەکات.

سەرۆك ئاپۆ گەلێك شیکردنەوەی سەبارەت بەمرۆڤی نوێ و ژیانی نوێ و ژن و پیاوی نوێ ئەنجام داوە، ئەو شیکردنەوانە بەسن بۆ ئەوەی کە کەسایەتێك بخولقێنرێت لەرِووی هزر و پراکتیکدا بتوانێت سەرکەوتنی مەزن بەدەست بهێنێت. سەد ساڵی تریش تێپەرِێت تێکۆشانی خولقاندنی مرۆڤی نوێ و نوێبوونەوە بەگوێرەی تایبەتمەندی هەر قۆناخێك و وەرچەرخاندنی، لەشۆڕشی کوردستاندا پێویستییەکی ژیانییە. لەدەرەوەی ئەمەش زەحمەتە باس لەسەرکەوتنی بکرێت.

PKK نە موڵکی هەیە، نەدەبێتە موڵکیش " بەخولقاندنی مرۆڤی بەباوەڕ و خاوەن مۆراڵ و کەسایەتی سۆسیالیستی، سەرەڕای هەموو بەربەستێکی ئیمپریالیزم و داگیرکەران؛ شۆڕشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و مرۆڤایەتی و سۆسیالیستی بەسەرکەوتن دەگەیەنێت، کە دونیا بهەژێنێت و بەرەو پێشەوە بچێت. ژیانێکی نوێ بۆ تەواوی مرۆڤایەتی فەراهەم بکات، بەمەش دەگوترێت سەرکەوتنی سۆسیالیزمی زانستی کە بەربەست ناکرێت.

ئەم پەرتووکەش کە بریتییە لەکۆکراوەی شیکردنەوەکانی سەرۆك ئاپۆ سەبارەت بەسۆسیالیزم، پێش پیلانگێڕی نێودەوڵەتی لەدژی سەرۆك ئاپۆ، لەشوباتی ساڵی 1998

ئامادە کراوە و چاپی یەکەمی بەزمانی تورکی بلاو کراوەتەوە. بۆ وەی بتوانیّ ئاسۆی گەلەکەمان و مرۆڤایەتی بەتیشکی رووناکی هزر و ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزمی زانستی, زیاتر رۆشن بکەینەوە, وەرگێڕانی ئەم پەرتووکەمان وەکو ئەرك و پێویستییەکی ژیانی بینی و دڵنیاین کە دەبێتە یەکێك لەو پەرتووکانەی کە بەشێوەیەکی زیندوو دەمێنێتەوە، لەتێکۆشانی مرۆڤایەتی پێشکەوتووخوازدا، دەبێتە وزەی رووناکی و سەرچاوەی باوەڕی و ئیرادە. رێبازێکە بۆ گەلی کورد و گەلانی ناوچەکە و مرۆڤایەتی, ئازادی و دیموکراسی و خۆشگوزەرانی دەئافرێنیّ. قاڵبە دۆگما و زهنییەتە پاشفەڕۆکانی ناوچەکە بیّ کاریگەر دەکات و لەدژی ئیمپریالیزمی چەوسێنەرانەی رۆژئاواش دەبێتە هێزێکی وەڵامدەرەوە. ئەم پەرتووکە لەپەرتووکخانەی مرۆڤایەتیدا جێگایەکی بڵندی قازانج کرد. بووە ناسنامەیەك بۆ مرۆڤایەتیش. ئەمڕۆش لەهەر کاتێك زیاتر مرۆڤایەتی پێویستی بەساڕێژکردنی برینەکانی هەیە, کە چینی باڵادەست و شارستانییەتی چینایەتی دروستیان کردووە، سۆسیالیزم خەون و خەیاڵە پاك و جوانەکانی مرۆڤایەتییە، بۆ گەیشتن بەوانەش چەکی هەرە کاریگەر تێکۆشانی سۆسیالیستییە, گشت بەهاکانی مرۆڤایەتیش لەم رێگەیەوە دەپارێزرێت و ئاییندەی شکۆمەندی مرۆڤایەتیش گەرەنتی دەکات.

***ناوەندی راگەیاندنی PÇDK***

# سۆسیالیزم تاکە ئاییندەی مرۆڤایەتییە

بێگومان لینین بۆ تەواوی زەحمەتکێشان لەمێژوودا خاوەنی جێگا و رۆڵ و چالاکییەکی مەزنە. لەمیانی مەیل و چالاکی ئەم پارتییەی کە وەکو ئەنجامێکی رەوشی سیستەمی ئیمپریالیستی ـ سەرمایەداری لەسەر بنەمای مارکسیزمێکی بەگوێرەی هەلومەرجی روسیا دەرکەوت، سیستەمی دووچاری تەنگەتاوی کرد. لێرەدا ئەمە لێکردنەوەی پارچەیەکی ئەم

سیستەمەیە و یەکەمین جار و یەکەمین شوێن بوو کە شۆڕشی تێدا ئەنجامدرا هەربۆیە بەواتای هەنگاوێکی سەرەتایی دێت لەسۆسیالیزمدا.

لەڕاستیدا هەموو شۆڕشەکان تا رادەیەك لەیەکدەچن هەربۆیە مۆدێل و شێوازی پارتی بەلشەفیك بەرامبەر ئەمە بەرپرسیارە, ئەگەر نا ئاماژەکردن بەهەندێ شتی تر مەسەلەکە رۆشن ناکاتەوە. شێوازی پەیڕەوکردنی توندوتیژی لەشۆڕشی فەرەنسا لەهی بەلشەفیکەکان کەمتر نەبوو. جگە لەمەش گەلێك شۆڕشی بۆرژوازی بەشێوازێکی هۆڤانەتر ئەنجامدراون. هەروەها پەیڕەوکردنی توندوتیژی لەقۆناخەکانی کۆیلایەتی و فیودالی لەئاستێکی زۆر بەرزدایە.

هەروەکو هەندێ کەس مەزەندە دەکەن ئەم هەڵوەشانەوەیە سەرچاوەی خۆی لەچەمکی پارتی لینینیستی ناگرێت. هەربۆیە ناتوانرێت مۆدێلی پارتی بەلشەفیك بەرامبەر بەم هەڵوەشانەوەیە بەرپرسیار ببینرێت. وەکو چۆن دەتوانرێ لەڕێگای ئەم مۆدێلەی پارتایەتی سۆسیالیزمێکی زۆرباش ئاوا بکرێ, بەهەمان شێوە کاتێك پێداویستییەکانی جێبەجێ نەکرێت شیمانەی ئەوە هەیە تەواو پێچەوانە بێتەوە. زۆر بەسانایی و بەشێوەیەکی ئاشکرا دەتوانم بڵێم کە: مارکس و ئەنگلس باشترین زانایانی کۆمەڵایەتی و باشترین گوزارشتی پێشکەوتنی زانستییانەی کۆمەڵگا بوون لەقۆناخی خۆیاندا. تائەو قۆناخەش تیۆرییەکی بەمجۆرە دەرنەکەوتبوو کە بەشێوەیەکی زانستییانە گوزارشت لەکۆمەڵگا بکات. شیکردنەوە و شرۆڤە سەبارەت بەفەلسەفە و سۆسیالیزم و ئابووری هەبوو, بەڵام بۆ یەکەمینجار گەیشتن بەتیۆرییەکی بەمجۆرە بەدیهات کە لەنێوخۆیدا یەك پارچە و تەواوکار بێت و تا ئەم رادەیەش جێگیربێت, لینینیش تیۆری شۆڕش و سیاسەتی پارتی و شۆڕشی سۆسیالیستی و تاکتیکەکانی دەستنیشان کرد و خستییە سەر داهێنانەکانی تر. ئێمە ئەم رووخاندنە, لەرووخاندنی سۆسیالیزمی بونیادنراو زیاتر, بەرووخانی یەکەمین ئەزموون دەبینین کە لەنێو ئابلۆقەی ئیمپریالیزمدا بوو و لەوڵاتێکدا هاتە ئاراوە کە هێشتا پێشکەوتنی سەرمایەداری بەرچاوی لێ بەدی نەهاتبوو, لەنێو کاریگەری بەهێزی فیودالی و چینەکانی ناویندا بوو. رەنگدانەوەی تایبەتمەندییە توندەکانی ناسنامەی روسی و شێوازەکەی بەسەر کۆمەڵگاوە هەبوو, تەنانەت کاتێك ئەم سیستەمەش رووخا, بەلشەفیکەکان پشتیان بەم پاشماوانەی دەوڵەت بەست و تەنانەت ناچار بوو لەسیاسەتی ئابووریدا تاڕادەیەك ئابووری سەرمایەداری پەیڕەو بکات و لەخۆوە بگرێت. هەروەها گەلێك شت سەبارەت بەرەخنەکانی ترۆتسکی و پراکتیکی ستالین دەگوترێت کە دوایی پێشکەوتن, گفتوگۆیەکی زۆریان سەبارەت دەکرێت کە تا چ ڕادەیەك بەرپرسیارن بەرامبەر بەم هەڵوەشانەوەیە. بەگوێرەی من کێشەی سەرەکی ئەمە نییە.

لەبواری ئابوورییەوە ئەم هەنگاوانەی کە هەڵێنراون, بۆ ئەوەی دواکەوتووترین ئابووری بگاتە ئاستی پێشکەوتووترین ئابووری سەرمایەداری و تەنانەت بگات بەهێزێك کە بتوانێ تێپەڕی بکات, هێندە جێگای ڕەخنەکردن نییە. جگە لەوە هۆکاری هەڵوەشانەوەی بۆ ئەمە ناگەڕێتەوە بەڵام لەهەمانکاتدا ناتوانین بڵێین ئەم ئابوورییە ئابورییەکی سۆسیالیستی بوو.

رووبەڕووی دەوڵەتێکی کاپیتالیستین کە پێشکەوتووە.

هەروەکو دەزانرێ سەرمایەداری دەوڵەتی شێوازی کۆمەڵکاری سەرمایەداری ئەو دەوڵەتە پاشکەوتووانەیە کە پەنای بۆ دەبەن لەپێناو بەپەلە خۆیان بگەیەننە سیستەمێکی سەرمایەداری بەشێوەیەکی چڕوپڕ ئەم مۆدێلە پیادە دەکرێت. ئەوەی لەتورکیاش پەیڕەوی لێکراوە شتێکی لەمە جیاوازتر نییە. تاوەکو ئێستاکەش سەرمایەی دەوڵەتی بەشی هەرە زۆری ئابووری رووسیا پێکدێنێ. سەرمایەداری تایبەتیش لەئاکامی ئەم رەوشە دێنە ئاراوە. نموونەی بەمجۆرە لەگەڵێك وڵاتانی جیهان بینراوە ــ ئەمەش بەشێوەیەکی بەرفراوانتر لەروسیا دەبینرێت.

ئەگەر بهاتایە و ئەم سەرمایەدارییەمان پێش خستبا ئایا بەمانای سۆسیالیزمێکی باش دەهات؟ تەنانەت ئەگەر کرابوایە ئابوورییەکی "سۆسیالیستی ـ گشتی" ئەوا دەتوانرا بەتەواوی سۆسیالیزم ئاوا بکرێت؟ ئەمەش پێویستی بەگفتوگۆ هەیە. ئایا ئەو ئابوورییەی بەرەو سۆسیالیزممان دەبات سەرمایەداری دەوڵەتییە؟ دەتوانین گفتوگۆ سەبارەت بەمەش بکەین. ئایا ئەمە خودی سۆسیالیزمە؟ گەلێك نیشانەی پرسیار هەن و ئایا ئەوەی لەبنچینەدا سۆسیالیزم دیاریدەکات ژێرخانی سەرمایەدارییە؟

**"پێویستی بەمۆدیلێك هەیە کە لەرەنج نامۆ نەبووبێت".**

ئەمە زۆر روون و ئاشکرایە کە: سۆسیالیزم ئەو کەسە بەدز رادەگەیەنێ کە جگە لەرەنجی تاکەکەسی خۆی, ئامانجی ئەوەیە بەرێچکە و شێوازی جیاجیا چەوسانەوە پێشبخات. تیۆرییەکی کەڵەکەکردنی سەرمایە هەیە. ئەگەر لەشوێنێکدا سەرمایەی کۆکراوە بەشێوەیەکی راست دابەش نەکرێت ئەمە دزییە, ئەمەش چی بەدەستی دەوڵەتەوە یان لەرێگای دەستی تایبەتەوە بێت, هێندە جیاوازییان نییە. لێرەدا گرنگ ئەوەیە کە لەسەر بنەمای گرێدان بەبەرهەمەکانی رەنج دابەشکردنێك بەگوێرەی رادەی رەنجدان پێش بکەوێت ئینجا چ بەدەستی دەوڵەتەوە بکرێت یاخود لەمیانی هەرەوەزی و رێچکەکانی تر. دەتوانرێت گەلێك شێواز لەم پێناوەدا تاقی بکرێتەوە. هێندەی ئابوورییەکی گشتی لەوانەیە ئابوورییەکی تایبەتیش نزیکی سۆسیالیزم بێت. بەئەندازەی ئابووری گروپەکان دەتوانرێت ئابووری چەند کەسێتییەکی سنووردار و ئابوورییەکی موڵکی گشتی لەنێو مودێلی سۆسیالیستیدا جێی خۆی بگرێت. لێرەدا پێویستە بەشێوەیەکی قاڵب و بەستەڵەکی هەڵوێستە نەکرێت.

ئەوە نابێتە سۆسیالیزم کە هەموو کەسێك بکاتە کارکەری سەرمایەداری دەوڵەتی. خاوەنداریێتی و موڵکداری ئامرازەکانی بەرهەمهێنان لەلایەن تاکەکەساندا لەژێر هەموو هەلومەرجێکدا سەرمایەداری نییە. خاوەنداریێتی زەوی و زارێکی کەم و ئامرازەکانیش و بەکارهێنانیان بەرەنجی خۆیی دەبێ سۆسیالیزم بێت.

دەستبەسەراگرتنی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و کردنی بەموڵکی گشتی سۆسیالیزم نییە. تەنانەت هەروەکو لەنموونە و ئەزموونی روسیاشدا دەبینرێت کاتێك بکەوێتە دەستی توێژێکی بیروکرات و تەسك, رێگای لەپێش پێکهاتنی چینێکی نوێی بۆرژوازی دەکاتەوە, هەربۆیە مەترسیدارە. لەوانەیە لەسەرمایەداری تایبەتیش مەترسیدارتر بێت. هەروەها وا بیر دەکەمەوە کە دەتوانرێ لەسۆسیالیزمدا بەگوێرەی رادەی رەنجدان تاکەکەس و گروپەکان بەرادەیەکی کەم خاوەنی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان بن. هەروەکو دەزانرێ سۆسیالیزم تەنیا بەرهەمهێنان نییە, بەڵکو پەیوەندییەکی بەهێز و چڕوپڕ لەنێوان ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و بەرهەمهێناندا هەیە.

بۆچی دابەشکردنی بەرهەم بەشێوازی دابەشکردنی ئامرازەکان نەبێت؟ سۆسیالیزمێکی خراپ نییە ئەگەر هەم خاوەنداریێتی ئامرازەکان و هەم خاوەنداریێتی بەرهەم بکات. لێرەدا گرنگ ئەوەیە باشترین ئاستی بەرهەمهێنان دیاری بکرێت. ئەگەر پێکهاتەیەکی 10 کەسی بەگوێرەی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی لەدەستیاندایە رەنج بدەن و بەرهەم بەدەست بێنن ئەوە دەتوانێ ببێتە یەکینەیەکی سۆسیالیستی. ئامرازەکان و بەرهەمەکەش هی ئەوانە. ئەمەش لەگەڵ یەکینەکانی تر قۆناخی گۆڕانکارییان دەبێت.

وای بۆ دەچم لەمیانەی راوەستان لەسەر ئەم شێوازانە روونکردنەوە و یەکلاکردنەوەیەکی زیاتر بۆ ئابووری سۆسیالیستی بەدیدێنێ. هەروەکو لە نموونەی کرداریدا دەبینرێت کە " سەرەتا زەوی و ئامرازەکانی بەرهەمهێنان بکەین بەموڵکی گەل و دوایی دابەشی بکەین " ئەنجامی گەلێك مەترسیداری لێکەوتۆتەوە. لەجیاتی ئەمە پێویستە مۆدێلێك بدۆزرێتەوە کە مسۆگەر زیادبوونی بەرهەمهێنان بەبنەما بگرێت و شارەزایی لەهەندێ ئامرازی بەرهەمهێناندا تێدا هەبێت و لەرەنج نامۆ نەبووبێت.

خۆی لەڕاستیدا هۆکاری ئاوانەکردن و پێکنەهێنانی سۆسیالیزم بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە سەرەتا پارتی و دواییش دەوڵەت خۆی نامۆ کرد. دوای ئەوەی هەڵایسانێکی دیاریکراو لەژێرخاندا دێتە ئاراوە کاتێك دەتەوێ ئەمە بکەیتە شێوازی سۆسیالیستی یان ئەوەتا بەناچاری ئایدیۆلۆژی پارتی و دەوڵەت بەرەو بیرۆکراسییەتێکی نەزۆکانە دەچن یاخود دەبێتە خاوەنی سەرمایە و توانستێکی زۆر و ئەمەش دەبێتە چینێکی ژووری سەرمایەداری, لەڕاستیدا ئەوەی روویداوە هەر ئەوەیە.

هەرلەبەر ئەوەی بەرهەم و دابەشکردن لەمیانی رەنجەوە نەبوو, رەنجیش خاوەنی دەربڕین و گوزارشتێکی دیموکراسییانە نەبووە, بیروکراتی لەپارتیدا پێشکەوتووە و ئەو هێزەی لەدەستی ژمارەیەکی زۆر کەمدا کۆبۆتەوە و لەدەوڵەتدا بۆتە باڵادەستییەکی رەها لەئەنجامدا شانبەشانی ئەوەی تەواوی کۆمەڵگای سیستەمی سۆڤیەت بوو بەکارکەر, لەهەمانکاتدا لەئاستێکی زۆر بەرزدا بورژوازیەکی بەکۆمەڵ هاتە ئاراوە, ئۆرگانێکیش نەبوو کۆنترۆڵ و چاودێری ئەم رەوشە بکات. بەمجۆرەش ئایدیۆلۆژی سۆسیالیستی, سیاسەتی سۆسیالیستی و دیموکراسی سۆسیالیستی کەوتە رەوشێك کە لەپێوانە سەرمایەدارەکان پاشکەوتووتر بێت یاخود کەوتە نێو رەوشێك کە هیچ پێشکەوتنێك بەخۆیەوە نەبینێ.

لەدەرەوە هەرەشەی سیستەمی ئیمپریالیستی و لەنێوخۆشدا بەهۆی گرنگی دان و گرانیدان بەلایەنی ئابووری, تەنیا خەڵکی دەخستە نێو کار و بەها مۆراڵی و دیموکراسییەکانی پێشنەدەخست و نەمانی رۆڵ و کاریگەری سەندیکا و رێکخراوەکانی تر, گەندەڵ بوون و بیرۆکراتیەت و بۆرژوازییەتی لەگەڵ خۆیدا هێنا. ئەمەش زۆر مەترسیدار و بەشێوازێکی مشەخۆری بوو. چونکە سەرمایەدارە تایبەتەکان زۆر گرێدراوی ئەو کارەن کە پێیەوە خەریکن و پەیوەستی ئاکامەکەینە. لێرەدا ئەمەش نییە, تەنیا زەوتکردنی دەسەڵات و دەستبەسەردا گرتنی ئەم بەهایانە لەئارادایە کە خوڵقێنراون و کۆبۆتەوە. پێشبڕکێ بەمجۆرە بوو, ئەوەی روویدا ئەوەبوو.

بەمجۆرەش تەواوی پرەنسیپەکانی سۆسیالیزم لەبەرچاوان کەوت و, بووە ئامرازی دەستی توێژێکی بیروکراتی کە لەنێو دەوڵەتدا چڕببوونەوە. نەتوانرا رێگا لەپێش نامۆ بوونی رەنج و زەحمەتەکێشان بگیرێ و نە ئەنتەرناسیۆنالیزم و نەشۆڕشەکان لەبەرچاو نەگیران. بەردەوام دەیانگوت: " بەرژەوەندییەکانی سۆڤیەت " بەرژەوەندییەکانی سۆڤیەتیش بەرژەوەندی چەند تەکنۆکرات و بیرۆکراتێکی پارتییە. ئەمڕۆش ئەم سەرمایەیە لەنێوان خۆیاندا دابەش دەکەن. توێژی بیرۆکرات ئەم توانست و هەلایسانە مەزنە دەخۆن و بەکاری دەبەن, ئەمەش بەشێوەیەکی مشەخۆری و گەندەڵی ئەنجام دەدەن.

کاتێك ئەزموونی خۆمان بێنینە بەرچاوان دەتوانین ئاماژە بەگەلێك پێشکەوتنی دیار و بەرچاو بکەین: PKK وەکو جۆر و مۆدیلی کامە پارت هەڵسەنگێنرێ با هەڵسەنگێنرێ, لەدوا هەڵسەنگاندندا هەر پارتێك جوڵانەوەی رەنجە. هێزی هزری چەند کەسانێك دێتە لای یەکتر؛ئیتر بەناوی ئەم چینە بێت یان ئەو چین چ بەناوی نەتەوەیەك و کەمە نەتەوەیەك بێت دەربازی نێو پراکتیك دەبێت.

بۆ نموونە ئەگەر بەناوی بۆرژواکان شۆڕش بکات ئەوا پارتێکی بەرهەم هێنەرە, لەلایەنی چینەکەی خۆیەوە بەرەو ئاسمان بەرزدەکرێتەوە. رۆڵی مێژوویی خۆی دەبینێ و پارتی

بەمجۆرە زۆرن. هەندێك لەم پارتانە بەبێ ئەوەی خزمەتی ناکۆکیە چینایەتیەکانیان بکەن و شۆڕش بگەیەننە سەرکەوتن دەبنە گروپێکی تەسکی چەتەگەری و بەرژەوەندیخواز و بەشێوەیەکی خەمناك کۆتاییان پێدێت.

بێگومان پارتی رەنج زۆر جیاوازە. بەتایبەتی لەشوێنێك کە هەژاری هەبێت و هەلومەرجی نەتەوەیی و کۆمەڵگا لەبار نەبێت, بۆ نموونە وەکو واقیعی کوردستانی ئێمە ئەگەر بتەوێت گەوهەری زەحمەتکێشی تێکنەچێت ئەوا ناچاری هەروەکو چۆن دانەوێڵەیەك ئاو دەدرێت دوو رۆژ جارێك ئاوی دەیت و ژیانی بخەیتە ژێر گەرەنتیەوە, پێویستە سەیری بکەیت و ئاگاداری بیت. بەپێچەوانەی ئەوە ئەو پارتیە لەدەستت دەردەکەوێ و دژت دەوەستێ. ئەمەش یاسایەکی گشتییە.

لەشۆڕشی ئیسلامیەتدا بۆ ئەوەی گەندەڵ بوون دروست نەبێت گوزارشتێك بەنێوی تێکۆشانی مەزنی نەفس هاتۆتە ئاراوە, ئاستی مەزنبوونی ئەولیا و عاتیفەکان هەیە, کەسایەتی بەمجۆرە هەن کە تەواوی تەمەنیان لەخانەقا و تەکیەکان بەسەربردووە.

ئەمەش ئەو مانایە دەبەخشێ کە تێربوونی ئایدیۆلۆژی بەدیبێت. ئەگەر کاریگەری ئەم شۆڕشانە تاوەکو رۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوام بووە, سەرچاوەی خۆی لە پێشخستنی ئەم جۆرە شێوازانە وەردەگرێت, جگە لەدەوڵەت گەلێك تەکیە و خانەقای ئایدیۆلۆژی بەمجۆرە هەن. هەر ئەم تەکیە و خانەقایانەش بوون شۆڕشی ئێرانیان پێشخست. تاوەکو ئێستاش گەلێك خانەقا بەشێوەیەکی زۆر ئاسایی دەکەوێتە خزمەتی شۆڕش. ئەم جێگایانە ئەو شوێنانەن کە تێربوونی ئایدیۆلۆژییان تێدایە. دژی ماڵی دونیان و چاوی تێنابرن. بەردەوام بەگوێرەی پرەنسیپەکان دەژین. لەنێو ئایینی مەسیحیشدا ئەمە بەربڵاوە. دەزگای بەمجۆرە لەنێو سۆسیالیزمدا پێشنەخراوە. هەموو شتێك لەخزمەتی پارتیدا, لەنێو پارتیشدا هەموو شتێك لەخزمەت و لەژێر فەرمانی گروپێکی تەسکدا بووە. هەربۆیە ئایدیۆلۆژیا لەنێوبردراوە.

ئەگەر هەموو شتێك لەخزمەتی سیاسەتی ئابووری و رۆژانەدا بێت, پرەنسیپ و یاسا لەئارادا نامێنێ. تەنانەت لەئیسلامییەتیشدا بەشێوەیەکی سەربەست و جیا لەدەوڵەت شێخی موسوڵمانان هەیە. بەڵام لەئەزموونی سۆڤیەتدا رێگا بەشتێکی لەمجۆرە نەدراوە. تەنانەت وای لێهاتووە کاتێك رەخنەیەکی جیاواز هاتووە بەتاوانێکی مەزن دانراوە و بەشێوازێکی زۆر لەشێوازەکانی چەرخی ناوین دژوارتر و بێ بەزەییانەتر هێرشیان کردۆتە سەر, تا گەیشتۆتە رادەیەك گفتۆگۆی ئایدیۆلۆژی کۆتایی پێبهێنرێت. تا گەیشتۆتە ئاستێك کەزۆر لە گفتوگۆکانی ئایینزایی (مەزهەبی ) سەردەمەکانی چەرخی ناوین پاشکەوتووتر بێت. تەنانەت گفتو گۆ وەستێنراوە و کەوتۆتە نێو بەستەڵەکییەوە. تەنیا یەك دەنگ و یەك ئیرادە دەرکەوتۆتە مەیدان. بێگومان ئەمەش لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا ناکۆکە.

ئەگەر ئێستاکەش تاڕادەیەك سەرمایەداری لەپێش بێت هۆکاری سەرەکی ئەمە بۆ رەخنەکردنی "دیموکراسییانە" پێشیخستووە. بۆ نموونە سەرمایەداری فاشیزمی پێشخست, بەڵام هێندە پشتی پێنەبەست چونکە لەسایەی پەیڕەوکردنی فاشیزمدا سەرمایەداری هێندە خاوەنی دەرفەت و شانسی ژیان نەبوو. هەرچەندە لەقۆناخێکی تایبەتی مێژوودا لەپێناو ئامانجی تایبەتی سەریهەڵداوە, بەڵام دوایی لەرێ دەرکەوتووە و بەلاوە نراوە. هەرچەندە دیموکراسی سەرمایەداری سنوورداریش بێت پێوانەکانی بەبنەما دەگیردرێت. ئەمەش درێژە بەبەردەوامبوونی سەرمایەداری دەدات. هۆکەشی ئەمەیە: کەمێك مافی قسەکردن بەزەحمەتکێشان دەدات, ئەمەش رێگا لەبەردەم پێشبڕکێ دەکاتەوە و درێژە بەسیستەم دەدات. بەڵام ئەمە لەسۆسیالیزمدا روویندا. تەنانەت هیچ بیر لەدیموکراسی و پێشبڕکێی سۆسیالیستیانە نەکراوە. پێویست بوو لەسەرمایەداری زیاتر لەنێو سۆسیالیزمدا پەرە بەدیموکراسی بدرێت.

دیموکراسی چییە؟ ئاستی خۆگوزارشتکردنی گەلە, پێویست بوو لەبواری هزری و سیاسیدا گەل چەندین دامودەزگای جیاوازی هەبێت. پێویست بوو تەواوی ئەم دامودەزگایانە سەبارەت بەم مەسەلانە بەشێوازێك بوونایە کەپارتی تێپەڕ بکەن, تەنانەت نکوڵیشی لێبکەن. چونکە لەسۆسیالیزمی زانستیدا دوای قۆناخێك پارتی ئامرازێکە پێویستە بەلاوە بنرێت. هەر لەکام لایەنەوە سەیری تیۆری سۆسیالیستی بکرێت و هەڵسەنگێنرێت, پێشکەوتنی دەوڵەت تا ئەم رادەیە رەوشێکە پەسند ناکرێ.

دەوڵەتی سۆڤیەتی تەنیا خانەیەکیش نەما دزە نەکاتە ناویەوە, ئەمەش نامۆبوونێکی مەترسیدار و لەرێ لادانە. بەهێز بوونی پارتیش تا ئەم ئاستە بەرزە تەواو مانای رەتکردنەوەی تیۆری سۆسیالیزمە. بیربکەنەوە رەوش وایلێهاتووە کە مرۆڤ لەسکی بەولاوە شتێك نەمابوو بیری لێبکاتەوە. ناچارە تەنیا بەرەش یاخود سپی سەیری جیهان بکات. هەمەڕەنگی و ئومێد و پێشبڕکێ نەماوە. ئەمەش هێزی کار و خەبات ئیفلیج دەکات. ئەنجامیش رزین و پوکانەوەیە.

بەڵێ, خەبات لەسەر بنەمای کۆمەڵکاری و ئیرادەی هاوبەش لەجێی خۆیدایە, بەڵام هێندەی ئەمەش دەستپێشخەری تاکەکەس و گروپ پێویستە. ئەگەر نا لەرێی گوتنی " هەستە, دانیشە " قسە بکەن یان بێ دەنگ بن ئەم کارە نابێت, مسۆگەر ئەمە لەبەرچاو نەگیراوە و پەیڕەوی لێنەکراوە. بەردەوام داخوازی ملکەچی کراوە, بەردەوام گوتراوە: " بەشێوەیەکی رەها گوێڕایەڵی دەوڵەت بە, هیچ دەنگ هەڵمەبڕە! باشترین هاوڵاتی ئەو هاوڵاتییەیە کە تاڕادەی هەرە بەرز پابەندی دەوڵەتە ئیتر دەوڵەت راست بێ یان چەوت! " ئەم سیاسەتانەش دژی گەلان و زەحمەتکێشانن و بەشێوەیەکی رەها و تەواو جێبەجێکراوە. لێرەدا

ئایدیۆلۆژیای کۆیلایەتی زاڵە و هەرکۆمەڵگایەك لەنێو ئەم رەوشەشدا بژیت مسۆگەر نابێتە کۆمەڵگایەکی سۆسیالیستی.

هەرچەندە لەئاستێکی خوازراو و پێویستدا نەبێت بەڵام دەتوانرێ بگوترێ کە لینین کەسایەتییەك بوو لایەنی سۆسیالیستی لەپێش بوو. سەرۆکەکان تەنانەت لەم ئایینانەشدا زۆر گرنگە کە لەسەر بنەمای رێبەری رۆحییە. ئەگەر " پیر, رێبەر " نەبێت نازانم گروپەکەی چیدەکات. " ئیمام چی بکات, خەڵك ئەمە دەکات ". بەگوێرەی من لێرەشدا رەوشێکی بەمجۆرە لەئارادایە. ستالین پەیڕەوکارێکی کرداری رەها و توندە. یەکێك بوو بەپێی راستییە گشتییەکان دەجوڵایەوە, بەڵام لق و پۆپ و قووڵایی شتەکانی رەچاو نەدەکرد. کەسایەتییەکە نەزانراوە تا چ رادەیەك دەرکی بەبنەما سۆسیالیستییەکان کردووە و تا چ رادەیەك کەسایەتی خۆی شیکردۆتەوە و تا چ رادەیەك خۆی لەتایبەتمەندێتییە فیوداڵییەکان پاکژ و یەکلاکردۆتەوە.

لەراستیدا لەهەلومەرجی ئەو سەردەمەشدا نەدەکرا شتێکی تر لەستالین چاوەڕوان بکرێت. ستالین لەسەر دیموکراسی سۆسیالیزمی رانەوەستا. تەنانەت ــ ئەوەی لەسەردەمی لینین ئەنجامدرابوون ــ وەکو شتێکی لۆکس و نایاب بینی. دەرکەوتنی دەنگی جیاوازی لەنێو هەمئاهەنگی دیموکراسی سۆسیالیزمدا نەکردە یەك و گوتی: " بێ دەنگ بن ! " لەوانەیە لەسەرەتا وەکو ئامانجێکی تەکتیکی بێت. بێگومان تەواوی هەنگاوەکانی ستالین سەرەتا وەکو تەکتیکێکە, بەڵام دوایی دەیکاتە پرەنسیپێك و نەیتوانی لەژێر باری دەربکەوێت. دەست لەخۆبەردان بەمجۆرە دەستپێکردووە. گوزارشتی بەمجۆرەی لینینیش سەبارەت بەجێگرەکەی هەیە. لینین رێککەوتنە شاراوەکانی نەهێشت هەروەها گوتوویەتی پێویستە ئەم ئامرازانە تێك بشکێنرێ کەبەسەر ئیرادەی مرۆڤەوە زاڵە و بەکرداریش جێبەجێی کردووە. فشاری سەرگەلانی تێکشکاندووە و ئازادی بەهەژاران و نەداران بەخشیوە. فەلسەفەکەی تاوەکو دوایی بۆ ئەم ئامانجە کراوەیە و لەبواری پراکتیزەکردنیشدا ئەم راستینەیەی تارادەیەکی بەرز نیشانداوە. سەرکەوتنیشی بەدەستهێناوە, بەڵام ئەمە نەکراوەتە دەزگایەك, دیموکراسی نەبووە بەموڵکی دەوڵەت یاخود دەتوانین بڵێین: دەوڵەت لەسەر بنەمایەکی دیموکراسییانە پێك نەهات. "بەڵام لەبنچینەدا بەگوێرەی گوتنی لینین: دیموکراسی و دەوڵەت یەك شتن".

**"لەجیاتی کەسایەتییەکی لاسایی کەرەوە و کۆیلە**
**پێویستی بەکەسایەتییەك هەیە کە بیر بکاتەوە و بڕیار بدات"**

بۆ نموونە کوردستان زۆر پاشکەوتووە. هەر لەبەر ئەوەی دەرەبەگایەتیەکەی سەد جار لەهی روسیای قەیسەری پاشڤەڕۆترە, تەنانەت بەواتای خێڵایەتی و سەرمایەداری زۆر پاشکەوتوە و سەرمایەداری لەڕێگای داگیرکارییەکی مەترسیدار کە گەیشتۆتە سنووری

کۆمەڵکوژی, خوێنمژییەکی وەها ژیان دەکات, ئەوا دەتوانم ئەو راستییانە بەشێوەیەکی زۆر روون و ئاشکراتر ببینم. بۆ نموونە زاراوەیەکمان لەژێر ناوی " کاریگەریەکانی کەمالیزم " هێنایە ئاراوە. شانبەشانی ئەمەش بەشێوەیەکی بەردەوام زاراوەی "کاریگەریەکانی خێڵایەتی و دەرەبەگایەتی " بەکار دێنین. تەنانەت من ئەم مەسەلەیەم هێندە قووڵکردەوە, ئیتر وایلێهات لەنێو مارکسیزمدا چۆنی بتەوێت بەمجۆرە پەیڕەوی لەبواری سایکۆلۆژی بکەیت. پێویستی ئەوەم بینی کە شێوازی سایکۆلۆژی سۆسیالیستی بەشێوەیەکی قووڵ و فراوان پراکتیزە بکەین. چونکە ئەگەر بێتو مەسەلەی کادیرانی سۆسیالیستی چارەسەر نەکرێت و ئامادە نەکرێن, ئەوا هەرچەندە بەسەرکەوتن بگەیت یاخود چالاکییەکی سنورداری سیاسی و سەربازی پێش بخەیت, لەساتێکدا شیمانەی ئەوە هەیە بەپێچەوانە هەڵگەڕێتەوە. ئەگەر بێتو بەشێوەیەکی رۆژانە هەڵوێستە لەسەر کەسایەتی سۆسیالیستی خەباتگێڕان نەکرێت, ئەوا ئەو کەسە ئامادەیە لەئان و ساتێکدا ئەم پارتییە مەزنە بکاتە ئامرازێکی توندی دەرەبەگایەتی.

نموونەی تاك و کەسایەتی خێزانی ئەرستۆکرات و لەخاك دابڕاو لەکوردستاندا زۆرن. خێزان لەسەر بنەمای بیرۆکەی " باکوڕەکەم گەورە بێت و ببێتە پادشا " پەروەردەی دەکات. پەروەردەی هەژارترین و نەدارترین خێزانیش بەمجۆرەیە. ئەوەی بەگوێرەی دابو نەریتەکانی خێڵ بە نموونە دادەنرێت ئەم جۆرە پەروەردەیەیە. ئەگەر بێتو ئەم رەوشە شینەکەینەوە و بەشێوازی گونجاو پەروەردەی نەکەین, ئەوا ئەو پادشایەتیەی پەیڕەوی لێدەکات لەشێوەی نموونەی "ئەو قەرەجە دەبێت کە بووە پادشا و سەرەتا باوکی خۆی لەسێدارەدا". کەسایەتییەکی بەمجۆرە کاتێك هێز و دەسەڵاتی دەکەوێتە دەست لەناوبردنی ئەو کەسانە وەك پرەنسیپێك دەبینێ کە تەنانەت رەخنەیەکی ئاسایی ئاراستە بکەن.

لەتورکیادا کەمالیزم بەشێوەیەکی زۆر جیاوازتر ئەنجامیدەدات. ئەوانەی دیکەش بەشێوەی کۆیلەی گەندەڵ و بێناوەڕۆك ملکەچ دەکەن و لەکاتێکی کورتدا و بەخێرایی دەکەونە نێو رەوشی کۆیلایەتی. هەربۆیە هەموو ساڵێك لەنێو ئێمەدا هەوڵێکی پاکتاوکاری و گێرەشێوێنی دەردەکەوێت و ناچارین سنووری بۆ دابنێین. ئەمەش PKK بەرەو پێشەوە دەبات. هەموو کەسێك دەڵێ ئەگەر سەرۆکایەتی نەبوایە ئەو گێرەشێوێنیە " هەموومانی سەرکوتدەکرد, تەنانەت بێ بەزەییانە سزای دەدایـن". بێگومان لەسەدا حەفتاوپێنجی ئەوانەی دیکەش کەوتوونەتە نێو رەوشی کۆیلایەتی. هەر لەبەر ئەوەی ئاستی هێزی شەڕی تایبەتی لایەنی بەرامبەر زۆر لەپێشە تەنیا دەتوانێ بۆ چەند مانگێك لەنێوماندا بمێنێ. بێگومان بەخێرایی لەنێوخۆیدا گەندەڵ دەبێت. ئەم کەسایەتییە خاوەنی ئاسۆیەکی سیاسی و کولتوورێکی دیموکراسی نییە. کەسایەتییەکی زۆر ئۆگۆیستە و هەموو شتێك لەخۆیدا بەسەنتەر دەکات هەربۆیە دەڵێ " مردن بۆ ئەو کەسەی کەمنی خۆش ناوێت ". تەنانەت لەپەیڕەوکردنی

خۆشەویستیشدا پەنا دەباتە بەر توند و تیژی. هیچ لایەنێکی داهێنان و خولقاندنی تێدا نییە. تەواوی ئەو کارەی دەیتوانێ بیکات ئەوەیە کە لەمیانی بەکارهێنانی شێوازی ترساندن و فشار ئەو بەهایانەی پارتی بخاتە ژێر دەستی خۆی کە لەئەنجامی رەنجی ملیۆنان کەس خولقێنراوە و بەرهەمی مێژووە! ئەوەی ببێتە کۆسپ و رێگر لەپێش ئەم هەولانەی, ئەوا بەگوێرەی شێوازی پیلانگێڕانەی خۆی لەناوی ببات! لەئەنجامیشدا لەماوەیەکی کورتدا خۆی بکاتە تاکە بالادەستی سەر رەنجی ملیۆنان کەس.

ئەمە چییە؟ ئەگەر تەماشای رەوشی ئەم کەسایەتییە بکرێت دەبینرێ کە دەشێ تەنیا فێودالێکی توند و تیژی دەستەڕۆبێت. تەنانەت ناتوانێ ببێتە رێبەرێکی سیاسی بورژوازی و سەرمایەداریش. چونکە لەویش دواکەوتووترە. بەهیچ جۆرێك نابێتە دیموکراتیخوازێکی بۆرژوازی و لەهەمان کاتدا نابێتە گوندییەکی دیموکراتیش. بۆچی وای لێهات؟ لەهەر بوارێکەوە سەیری بکەین دەڵێین ئایا ئەمە سیخوڕێکی رێکخراوە یان نا, سیخوڕی داگیرکارانە یان نا؟ لەتەمەنی حەوت سالان بەدواوە بەمجۆرە بەخێوکراوە و مەزنکراوە. ئەو هێزە و جێگا و شوێنەی لەنێو خێزاندا نەیبوو پێی نەگەیشت, لەنێو پارتیدا پێی دەگات.

ئەوەی لەنێو پارتی بەلشەفیکدا پێشکەوت شتێکی لەمە جیاوازتر نەبوو. مرۆڤ دەتوانێ بەمانە بڵێ " ستالینە بچووکەکان ". ئەمە راستینەیەکی بەربلاو بوو لەجیهاندا پەیڕەوی لێکرا. لەڕاستیدا پێویست بوو بەرامبەر بەمە قۆناخێکی سەرکەوتووانە پەرەی پێبدرێت. لەکام لایەن و گۆشە نیگاوە سەیر بکرێت دەبینرێت کە ئەم کەسایەتیانە یەکتریان بەخێو کرد. هەر بۆیە لەسەردەمی ستالیندا سەبارەت بەپارتی بەلشەفیك دەگوترێ " پارتی مرۆڤە دوو رووەکان ". بەرەو ڕوو چەپڵەی بۆ لێدەدات و بەشانوباڵیدا دەڵێت, بەلام لەناوخۆیشیدا لێی نیگەرانە. لەمەسەلەی چاوشیسکۆدا ئەمە بەشێوەیەکی زۆر روون و بەرچاو ئاشکرا بوو. شتی هەرە راست ئەوەیە ئەم کەسایەتیانە بەمونافیق ناوبرێن. لەلای ئەو چەپڵەڕێزانی بۆ دەکات. کاتێکیش دەکەوێتە نێو زۆری و زەحمەتی, تاوەکو دوایی خیانەتی لێدەکات... پێویستە ئەمە رێی لێبگیرێت. لەمەسەلەی خۆمدا دەخوازم ئەمە پەیڕەو بکەم و رێ لەڕوودانی مەسەلەیەکی بەمجۆرە بگرم. زۆربەی زۆری گرێدان و پەیوەندیەکان بەمجۆرەن.

دژی گرێدان و پەیوەندییەکی بەمجۆرەم. هەموویان دڵسۆزن, لەپێناو مونافیقی و دوو روویی پەیوەندی پێشناخەن. بەلام کەسایەتییەکەیان تا ئەم رادەیە بەرگەی گرێدان و پەیوەندی دەگرێت. پەیوەندییەك سەرچاوەکەی لەگوندێتیەوە هاتبێت تا چ رادەیەك بەهای دەبێت. لە90٪ لەدڵی خۆیدا خۆی دەژێنێ, لە10٪شی ئەگەر هەبێت بۆ دایکیەتی یاخود خوداکەیەتی. بەلام بەشێوەیەکی بنچینەیی لەسەر بنەمای پشت بەستن بە موڵکێکی بچووك سەودای خۆیەتی. ئەمە سۆسیالیزم نییە بەڵکو شێوازی گرێدان و وابەستەیی بۆرژوازی

بچووکە و هەموو ساتێك شیمانەی گۆڕانی هەیە. دەشێ سەرەتا بەشان و باڵی خودایەکەیدا بڵێ و دواییش خیانەتی لێبکات, هەروەها لەبواری کرداریدا ئەمە روودەدات.

ئەو شێوازانەی من پەیڕەوم کردووە چارەسەرییە لەپێناو بەلاوەنانی ئەم جۆرە کەسایەتییە. ئەمەش تەگبیرە لەپێناو بەسۆسیالیست کردنی پارتی و قوولکردنەوەی ئازادی. پێویستە کەسایەتییەکی بەمجۆرە بخولقێنرێ کە کەسایەتییەکی بەرجەستە بێت, نابێت کەسایەتییەکی لاسایی کەرەوە و کۆیلە بێت, بەڵکو پێویستە کەسایەتییەك بێت کە بتوانێ بیربکاتەوە و بڕیار بدات و ئەم کەسایەتییەش نە دەبێ کۆیلە و نەدەبێ خۆ خۆیی و تاکڕەو بێت, دەبێ کەسایەتیەك بێ کە لەنێو گشتدا نکوڵی لەخۆی نەکات و خۆشی بەخاوەنی هەموو شتێك نەبینێ.

چارەسەری لێرەدا دەبینم و ئەمەش کار و کردەوەیەکی سانایی نییە, لە90٪ی هەوڵ و کۆششەکانم لەم پێناوەدایە. ئەو هەوڵەی لەشەڕی ئاشکرای دژ بەدەوڵەتی تورکیا دەیدەم لەئاستێکی هێندە نزم دایە کە دەتوانرێ بگوترێ نییە. بەلام ئەگەر پێشکەوتنی گەوهەری کادیر نەبێت PKK کۆتایی پێدێت.

**"ئەگەر هەبوونی سوپا هەر بەردەوام بێت**

**ئەوا دەبێتە چینێکی بالادەست و چەوسێنەر"**

تێکۆشانی سۆسیالیزم لەهەمانکاتدا تێکۆشانێکە بەرامبەر بەئاژەڵبوونی سەردەمی سیستەمی ئیمپریالیستی.

کامە ئاژەڵ هێندەی لەرەچەڵەکی خۆی کوشتووە؟ هێندە مرۆڤەی کوشتووە؟ ئەوە هۆڤێتی هەرە مەزنە! هیچ شتێکی تر ناتوانێ گوزارشت لەمە بکات و روونی بکاتەوە, ئەمە مەترسیدارترین ئاژەڵێتی یە. ئەگەر بمانەوێتێکۆشانێکی کۆمەلایەتی و سۆسیالیستی پێشبخەین مسۆگەر پێویستە بەرامبەر تاکڕەوێتی و بەئاژەڵبوونێکی بەمجۆرە خەبات بکەین. لەهەموو ئایینەکاندا بەمجۆرەیە. مەسیحییەت و ئیسلامیەت و گەلێك ئایینی دیکەش بۆ ئەوەی ئامانجێکی بەمجۆرە بەدی بێت خەبات دەکەن. بەردەوام بەرامبەر بەزۆردار و دز و خوێن ڕێژەکان و بێدادی خەبات دەکەن.

بەڵێ سۆسیالیزم پێشکەوتووترین شێوەی ئەمانەیە. پارتی سۆسیالیستیش ئامرازی هەرە پێشخراویەتی. ئەمە بەتەنیا ئەنجام نادەم و هەروەها لەگەڵ گروپێکی سنورداریشدا ئەنجامی نادەم, بەڵکو لەگەڵ پارتییەکی هەرە پێشکەوتوودا ئەنجامی دەدەم, تەنانەت ئەگەر پێویست بکات لەگەڵ دەوڵەتدا ئەنجامی دەدەم. ئەگەر لایەنێکی دەوڵەت هەبێت کە بپارێزرێت ئەویش لەپێناو شەڕکردن دژی تاکڕەوی و دەسەلاتدارە بێداد و نایەکسانەکان پێویستە. لەمە بەولاوە بەهیچ شێوەیەك دەوڵەت ناپارێزرێت. خۆی لەخۆیدا لەتیۆری سۆسیالیستیدا ئەم راستییە

دەستنیشانکراوە, دەڵێ کاتێك " چەوسێنەر و زۆردار لەئارادابن " " زەبر " بەکاربێنە. لەمە بەولاوە بەکارهێنانی زەبر کردەوەیەکی لۆژیکی نییە. سەیرە ئەو سوپایە بۆچییە؟ سوپا لەوانەیە بۆ سەرکەوتن پێویست بێت, بەلاّم دوای ئەوە بلاّوەی پێ بکە. سەرکەوتنت بەدەست هێنا بۆچی سوپا دەهێڵێتەوە و بەخێوی دەکەیت؟

ئەگەر سوپا وەکو ئامرازێکی تایبەت بەردەوام بێت, ئەوا دەبێتە چینێکی بالاّدەست و چەوسێنەر. سوپاکان ئەم جۆرە هەڕەشە و مەترسییە لەخۆوە دەگرن. بەکاریگەرترین تەگبیر ئەوەیە بەرامبەر بەشێوازی داگیرکار و زۆرداران گەل بگەیێنرێتە ئاستێك کە هەموو ساتێك ئامادە بێت ببێتە سوپا؛ سوپا هەڵوەشێنەوە, بیروکراتیەت و دەزگای تایبەتی سیخوڕی هەڵوەشێنەوە و گەل و تاکەکانی کۆمەڵگا بەهێز بکە, " لەوانەیە بڵێن مەترسی و هەڕەشە لەئارادایە ", تاکەکانی نێو کۆمەڵگا هێندە بەهێز بکە کاتێك گوتت "هەڵسن ولاّت بپارێزن " ئەو هێزەی پاراستن بەبناخە بگرن, لەپێکهاتەی سوپاو باوەڕپێکراوترین بیرۆکرات زیاتر جەماوەری گەل پاراستنی ڕەنج و ولاّت دەکەن, ئەمە لەیەکیەتی سۆڤیەت ئەنجام نەدرا. ئامرازی تایبەت پێشخراوە, دەزگای سیخوڕی KGB بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بەهێزکراوە. سوپای سووریش بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بەهێزکراوە, بەگشتی بیرۆکراسییەتی سۆڤیەتی بەشێوەیەکی سەیر پێشخراوە و بەهێزکراوە. ئێستا دەڵێن سوپای سوور بۆتە " سوپایەکی بەلاّ " تەنانەت پاشماوەکانیشی بەلاّیە. ئاشکرابوو کە لە ئەنجامدا وای لێدێت, چونکە لەگەڵ سیستەمدا ناگونجێ و نابێت. ئەمە بۆ بۆرژوا و دەرەبەگەکان جیاوازە. ئەوان دەترسێن, هەرلەبەر ئەوەی بەشێوەیەکی ڕۆژانە و بەردەوام پەیڕەوی لەزۆرداری و چەوسانەوە دەکەن, بەشێوەیەکی ڕۆژانەش پێویستیان بە ئامراز و ڕێکخراوێکی فشار هەیە. بەلاّم سۆسیالیستەکان پێویستیان بەمە نییە. ئەگەر ڕێبەرێکی سۆسیالیستی لەشوێنێکدا ئامرازەکانی بەمجۆرە پتەو و بەهێز بکات پێویستە لێی بترسێین. ئەمە پێچەوانەی تیۆری سۆسیالیستییە.

ئایا نابێ هیچ خۆپاراستنێك هەبێت؟ دەبێ پاراستن هەبێ بەلاّم بەشێوەی ئامرازی تایبەتی نابێت. نابێ بیدەیتە دەستی فەرماندەی تایبەتی, ئەگەر بیاندەیتە دەست, ئەوا وەکو ئەو میلیتانە نوێ و ناتەواوانەی نێو پارتی ئێمەیان لێدێت کە دەسەلاّت دەگرنە دەست.

شیاوترین مۆدێل کە من بەباشی دەبینم ئەوەیە: ڕەوشێکی بەمجۆرە دەخوڵقێنم کە PKK ببێت بەهی هەموو کەسێك, کەسیش نەڵێ PKK هی منە, بەلاّم لەهەمان کاتدا تەواوی PKK هی تۆیە. هەموو شتێکی PKK هی منە, بەلاّم لەهەمانکاتدا هیچ شتێکی هی من نییە. ئەمەش بەواتای ئەوە دێت کە PKK بەئامراز و موڵکێکی تایبەت نابینرێت.

کاتێك لەشوێنێك ئەرك و لێپرسراوێتی بەیەکێك دەدرێت ئەو دەسەڵاتە بۆ ئەوەیە کە لەم ناوچەیەدا شۆڕش پێش بخات. ئەم بەرپرسیارێتی و دەسەڵاتە بۆ ئەوەیە لەماوەی ئەم شەش مانگەدا لەم بارەیەوە یان سەبارەت بەفڵان مەسەلە سەرکەوتن بەدەست بێنێ، دەسەڵات و ئەرك بەتۆ نەدراوە بۆ ئەوەی میرنشین ئاوا بکەیت. بەگوێرەی من پێویستە چەمکی دەسەڵات و بەرپرسیارێتی سۆسیالیستی بەمجۆرە بێت. بۆ جێبەجێکردنی ئەرکێکی پێویست ئامرازێکی دیاریکراوی رێکخراو بەکار دێنێ و دوایی هەم ئامرازەکە و بەرپرسیارەکەشی بەلاوە دەنێ و ئەرکی لێ دەسەنیەوە. بۆ نموونە ئەگەر بێتو بەدرێژایی تەمەن ئەرکی سکرتێری گشتی بەکەسێك بدرێت، ئەوە کۆتایی پێهاتووە و لەنێوچووە، بێگومان نەگۆڕینی سکرتێر و نەگۆڕانی ئامرازەکان، کاریگەری شێوازی چینە باڵادەست و چەوسێنەرەکانە. بەداخەوە ئەمانە لەنێو سۆسیالیزمی بونیادنراو ئاواکراوە و پەیڕەوی لێکراوە. ئەوەی پێویستە ئەنجامبدرێت بەلاوەنانی ئەو رەوشەیە، بەلاوەنانیشی شتێکی مەحاڵ نییە.

ئەگەر ئاورێك لەئەزموونی گەلان بدەینەوە دەبینین کە تائەو رادەیە گرێدراوی ئامرازی تایبەتی بەمجۆرە نین. ئەگەر بێت و دەستەڕۆ و ستەمکار و چەوسێنەرەکان نەبن، ئەوا هیچ کاتێك پێویستی بە چەك هەڵگرتن و خۆ پڕچەككردن نابینن. پێویستی ئەوە نابینن کە ئامرازی تایبەت و رێکخستنی تایبەت و رێکخستنی نهێنی ئاوا بکەن. رێکخراوی نهێنی کاری کێیە؟ ئامرازە تایبەتیەکانی فشار کاری کێیە؟ قسەیەکی پێشینان هەیە دەڵێ: " کوردی خائین ". واتە کاری ئەو کەسانەیە کە لەخۆیان دەترسن. چونکە ناهەقی لەهەندێ کەسی دیکە کردووە. کەمینەیە و هەروەها لەبەرئەوەی دوژمنیان زۆرە. بۆچی؟ چونکە دوژمنیان بۆ خۆیان خوڵقاندووە. مرۆڤێکی سۆسیالیست واناکات. پێویست بەوە ناکات سۆسیالیستێك خۆی لەگەڵ دووربخات و بپارێزێت.

کەس ناتوانێ بڵێ کە هێندە پێشخستنی سوپا و ئامرازی بیرۆکراسی لەسۆڤیەت بەئامانجی خۆپاراستن بووە بەرامبەر بە ئیمپریالیزمی ئەمریکی. نەخێر لە90٪ی ئەمانە بەرامبەر بەکۆمەڵگای خۆیان پێشخراون. تەواوی ئەم پێکهاتانە لەکۆمەڵگای سۆڤیەت شاراوە بوون. رێکخراوی سیخوڕی و سوپا تاڕادەیەك جیاببوونەوە.

ئەنجامیش؛ پوکانەوەی گەندەڵبوونە... تەواوی ئەمانەش هەڵەن.

هەرچەندە لەنێو هەلومەرجی باڵادەستی ئیمپریالیستیشدا بێت ئێمە PKK وەکو مۆدێلێك پێشدەخەین. هیچ کاتێك لەسەر بنەمای ئەو شێوازانە ناجوڵێینەوە کە مۆدێلی سۆسیالیزمی بونیادنراو پەرەی پێدا و پەیڕەوی کرد. ئەگەر ئەو شێوازانە پەیڕەو بکەین ناشێ و مەحاڵە لەسەرپێیان بمێنین. تەنیا چارەسەریم لەوەدا بینی کە تاکە کەس هەم لەبواری ئایدیۆلۆژی و هەم وەکو شۆڕشگێڕێك بەهێز بکەین. چونکە پارەی هەرە زیادە لای

سەرمایەدارانە و زۆرترین رادەی تاکڕەوێتی دەبەخشن. بەڵێ پێویستە تۆ مۆدێلێکی بەمجۆرە پێشبخەیت کە شکۆمەند بێت و زۆر لەپارە و تاکڕەوێتی بەرزتر بێت. هەربۆیە PKK توانی بۆ تاکی کورد و کۆمەڵگای کوردستان بسەلمێنێ کە؛ هەرشێوازێکی نەتەوەپەرستی و دەرەبەگایەتی کە پەیڕەوی لێکراوە، هیچ سوودێکی بۆ گەلی کورد نەبووە و شتێکی پێشکەش نەکردووە. بەلام مۆدێلی PKK یەکێتی و وورە و مرۆڤی بەهێزی بەخشیوە و مرۆڤی قارەمانی پێشکەش کردووە. بەڵێ بەهێزبوونی PKK سەرچاوەی خۆی لێرە وەردەگرێت.

باس لەزۆرینە دەکەن، بەلام من باس لە خوڵقاندنی ئاستی بەدەزگابوون دەکەم کە بۆ کۆمەڵگا زۆر پێویستە. مسۆگەر پێویستە دەزگای ئایدیۆلۆژی و مۆراڵ هەبێت. دەزگای مۆراڵ و ئایدیۆلۆژی چییە؟ هەرچی ناوێکی لێ بنرێت ئەمە دەزگایەکە بەرامبەر بەپێشخستن و چاودێریکردنی بەها و داب و نەریتە بنچینەییەکانی کۆمەڵگا بەرپرسیارە. سیستەمێکمان لەسەر ئەو بنەمایە ئاواکردووە، دەتوانین بڵێین تارادەیەکیش سەرکەوتن بەدەست هێنراوە. ئێستا پێویستی بەدەزگابوونە. ئەمە یەکەمیان بوو، دووەمیان؛ بۆ نموونە دەشێ دەستەیەکی بەرگری بێت. پێویستە باش تێبگەین و ئاگاداربین دەزگای پاراستن واتای سوپا نییە، دەتوانرێ لەچەند کەسانێکی شارەزای سنوردار پێکبهێنرێ. چل ـ پەنجا کەسێك دەتوانن بەردەوام چاودێری رەوشی بەرگری و پاراستن بکەن.

بۆ نموونە ئەگەر پێویست بکات لەماوەی بیست و چوار کاتژمێردا سوپاکە کۆبکاتەوە. بەلام سوپا و ئامرازی تایبەتی لەئارادا نییە تەنیا دەزگا هەیە. دەشێ دەستەی ئابووری یان ئەنجوومەن هەبێ. هەروەها دەشێ دەستە و ئەنجوومەنی تایبەت بە کولتوور و ژینگە هەبێت. بەلام دەزگایەکن کە ئیش و کاری راستەقینەیان هەیە. باش سەیر بکەن لێرەدا دەوڵەتێك بەمانا کلاسیکییەکەی لەئارادا نییە. واتە دەسەلات و سەرمایەیەکی ئەوتۆی بەدەستەوە نییە. مسۆگەر پێویستە هێز و سەرمایەیەکی مەزن و کەسانێکی زۆریان نەدەیتە دەست. پێویستە خوڵقێنەر بێت، تەنیا پارەیەکی هێندە کەمی پێدەدەی کە بتوانێ خۆی بژێنێ و بەپێی پێویست چەند کەسانێکی دەدەیتە پاڵ. بەم شێوەیە ئەگەر یەکێك بخوازێ دیکتاتۆریەت ئاوا بکات ناتوانێ، چونکە هێزی نییە. کۆمیتەی پاراستن تەنیا بە چل ـ پەنجا کەس سنوردارە و ناتوانێ کودەتا ئەنجامبدات. هەروەها دەزگای مۆراڵیش هاوسەنگراوە و هێزەکەی سنوردارە. دیموکراسی سۆسیالیزمی و دیموکراسی زۆرینە کە باسی لێوە دەکەین ئەوەیە. پێویستە بەمە بگوترێ " پێشبڕکێی سۆسیالیستی ". لەمەیلی جیاواز بەولاوە، تاکە عەقڵیەتی مۆنۆلۆتیکی لەجێگای خۆیدا نییە. سروشت مەسەلەیەکی زۆر تێکەلاو و ئالۆزە، سروشتی مرۆڤ زۆر لەوە ئالۆزتر و تێکچڕژاوترە.

هەڵبەتە باوەڕ بەوە دەکەم کە لەسەرمایەداری زیاتر پێویستە لەنێو سۆسیالیزمدا پێشبڕکێ و ئازادی رادەربڕین و پێکهێنانی گروپ و کۆمەڵە هەبێت. چونکە ئەم دەزگایانە بۆ ئەوەیە کەببنە زامنی بەرژەوەندیەکانی گەل. با تاك خاوەنی دەستپێشخەری بێت. بۆ ئەوە پێویستی بەم دەزگایانە بینراوە تاوەکو تاك خولقێنەر بێت. ئەگەر نا نەخێر نابێ بڵێی " گوێڕایەڵی هەموو شتێکی رێنیشاندەر دەکەی" نەخێر ئەگەر بێتو زێدە بەهێز بێت لەخۆبایی دەبێت و دەبێتە گرێدانێکی وشك و کوێرانە. لێرەدا هاوسەنگی ئەمەش رەچاوکراوە. پێویستە مۆدێلێکی بەمجۆرە پێشبخەیت کە نەك تەنیا دەستپێشخەری دەزگاکان سەرکوت نەکات بەڵکو خاوەنی تایبەتمەندی پێشخستنی دەستپێشخەری و تاك بێت. دیموکراسی سۆسیالیزم تەنیا دەشێ بەم شێوەیە پێشبکەوێت.

بەلاوەنان و تێپەڕکردنی سەرمایەداری تەنیا لەمیانی مۆدیلێکی بەمجۆرە دەبێت. مەزنترین درندەی رۆژگاری ئەمرۆمان سەرمایەداری خۆیەتی. بێگومان هەر ئەم سیستەمەیە کە ناکۆکییەکانی نێو کۆمەڵگای مەزن کردووە.

**"درزێکی مەزن لەنێوان کۆمەڵگا و سروشتدا هەیە"**

لەرۆژگاری ئەمرۆماندا ناکۆکییەکان لەنێو چوارچێوەی کۆمەڵگاکان دەرچوونە و بوونەتە ناکۆکییەك لەگەڵ سروشتدا. شتی هەرە ترسناکیش ئەمەیە. هەروەها ناکۆکییەکان بەتەنیا لەنێوان چینەکاندا نەماوە و تەواوی کۆمەڵگای سەرمایەداری لەخۆوە گرتووە و, بەرەو سروشت ئاراستەیان گرتووە. ئەم درندەیە تەنیا بەوە نەوەستاوە کە جیاوازی چینایەتی و چەوسانەوە پێشبخات, بەڵکو سروشتیش تێکدەدات, تەنانەت پەردەی ئاسمانیشی کونکرد. بەمجۆرەش هاوسەنگی سروشت سەراوبن دەبێت و کۆمەڵگا دەگەیەنرێتە خاڵی لەنێوچوون. هەموو شوێنێك چیمەنتۆکراوە و شوێنێك نامێنی کە مرۆڤ تێیدا بژیت. لەوانەیە تەقینەوەی ژمارەی دانیشتوان رەوشێکی وەها بێنێتە ئاراوە کە لەزەوی و ئاسمان جێگای مرۆڤ نەمێنێ. هەندێ نەخۆشی سەیر دەردەکەون و بەردەوامیش ئاستی تەشەنەکردن و بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشیانە لەزیادبووندایە کە هەرەشە لەتەواوی مرۆڤایەتی دەکات, تەواوی ئەمانەش ئەو ناکۆکیانەن کە سەرمایەداری هۆڤ خولقاندویەتی.

ناکۆکییەکان زۆر لەسنووری ناکۆکییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و تەنانەت سەرەتای سەدەی بیستەمیشی تێپەڕکرد. ناکۆکییەکانی سەرمایەداری لەسەدەی نۆزدەهەمدا ناکۆکی رەنج ــ سەرمایە یان ناکۆکی پرۆلیتاریا ـ بۆرژوازی بوو, تاڕادەیەکیش ناکۆکی نێوان گەلانی چەوساوە و دەوڵەتە داگیرکەرەکان بوو.

ئەگەر تەماشای نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بکەین, دەبینن کە رەوشێکی وەها هاتۆتە ئاراوە کە هیچ مانایەکی نەبێت. ئیتر مەترسی چینایەتی هێندە گرنگ نییە. هەروەها

داگیرکاریش لەڕەوشێکی بەوجۆرەدا نییە کە زێدە بەجددی وەربگیردرێت, ئەگەر هەشبێت سنوورداره. ناکۆکی گشتگیرتربووه و شێوەی نوێی لەخۆوە گرتووە. بەگوێرەی من مەترسیدارترین لایەنەکانی سیستەمی ئیمپریالیستی ـ سەرمایەداری لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ئەوەیە کە ئەو ناکۆکیانەی خولڤاندوویەتی تەواوی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بە ئامانج دەگرێت. لەئاکامی پێشخستنی چەوسانەوە, شێوازەکانی تەکنۆلۆژیا تا ئاستێکی هێندە سەرسوڕهێنەر پێشکەوت کە؛ بۆ نموونە وای لێهات ئاستی پێشکەوتنی پاوانخوازی و مۆڵکایەتی و پێشکەوتنی شێوازی بەدەستهێنانی زانیاری ببنە تەکنۆلۆژیای زۆر ترسناك.

ڕەوشێکی بەمجۆرە هاتۆتە ئاراوە کە ئیرادەی تەواوی کۆمەڵگا تەسلیم گیراوە. کاتێك دەڵێین کۆمەڵگا بێگومان هەموو چینەکان لەخۆوە دەگرێت. بەشێوازە جیاجیاکان یاری بەهەر چینێك دەکات. بەشێوازێك یاری بە ڕەگەز دەکات و بەشێوازێك سەرسوڕهێنەر گەمە بە منداڵان دەکات. بەشێوەیەکی سەیر و سەرسوڕهێنەر ژن بەکاردێنێ. تەنانەت چینی سەرمایەداری ناوین بەشێوەیەکی زۆر جیاوازتر بەکاردێنن. لەم چوارچێوەیەشدا ناکۆکییەکان هەم گشتگیربوون و هەم قەبارەیان زۆر مەزن بووە.

کاتێك دەڵێین جیهانگیری بەواتای ئەوە دێت کە سیستەمی سەرمایەداری ـ ئیمپریالیستی وەکو ئەختەبوتێك تەواوی جیهان لەسەر پەنجەکانیەوە دەسوڕێنێ. وەکو باگوردان هەموو شتێك دەپلیشێنێتەوە و بەسەریدا تێپەڕ دەبێت. بێگومان ئەوەی ڕێگای لەپێش ڕەوشێکی بەمجۆرە کردەوە پێشکەوتنە تەکنۆلۆژیاکان بوو. هەروەها لەم پەنجا ساڵەی دواییدا لەڕێگای دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە کاریگەری ئاراستەکردنێکی بێ سنوور پێشکەوتووە. هەروەکو مەزەندە دەکرێ ئەمە هێندە لەخزمەتی مرۆڤایەتیدا نییە, بەڵکو گەلێك هەڕەشە و مەترسی لەگەڵ خۆیدا هێناوە.

دەتوانین ناکۆکییەکان بەم جۆرە دابڕژرێن لەجیاتی گوتنی, ئەم ناکۆکیانە لەنێوانی چینی چەوساوە و چینە چەوسێنەرەکاندایە یاخود لەنێوان گەلانی ژێردەست و دەوڵەتە داگیرکارەکاندایە, بڵێین ئەم ناکۆکیە لەنێوان هێزی کۆمەڵگا و ئەو کەمینە بچووکەدایە کە دەزگا نائاساییەکانی میدیا و ڕاگەیاندن لەگەڵ توانستە تەکنۆلۆژییەکان کردۆتە یەك و بوونەتە هێزێکی بەڕێوەبەری باڵادەست.

لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا زاراوەیەکی بەمجۆرە هاتۆتە ئاراوە کە گوایە ئەمریکا هێزێکی سوپەرە. لەڕاستیدا لەژێر ناوی سیستەمی نوێی جیهانی تەواوی مرۆڤایەتی لەژێر هەڕەشە و مەترسییەکی مەزندایە, ناکۆکی یەکەم ئەمەیە. دووەمین ناکۆکی ئەوەیە کەلێنێکی مەزن لەنێوان کۆمەڵگا و سروشت هاتۆتە ئاراوە.

وابزانم ئەو تێکدان و خراپەکارییانەی لەم پەنجا ساڵەی دوایی ئەنجامدراون گەلێك لەو خراپەکارییانە زیاترە کە لەسەرەتای دەرکەوتنی مرۆڤایەتییەوە تاکو رۆژگاری ئەمڕۆمان دەرکەوتوون. لەهیچ قۆناخێکی مێژوودا پیسکردنی ژینگە بەم ئاستە نەگەیشتووە. تەنیا پیسکردنی ژینگە لەئارادا نییە, بەڵکو مەترسی لەدەستدانی سروشت هەیە. هەمەڕەنگی لەنێودەچێ, بەشێوەیەکی خێرا و سەرسوڕهێنەر دانەوێڵە و ئاژەڵ کەم دەبنەوە و لەنێودەچن. هەوا پیس دەبێت و بەستەڵەکەکان دەتوێنەوە و بەپێی تێپەڕبوونی کات و بەردەوام, پلەی گەرمای سەر رووی گۆی زەوی بەرز دەبێتەوە. ئیتر وابروات و بەردەوام بێت ئەو شوێنانەی تێیدا دەژین دەبێتە چۆڵەوانی. تەواوی ئەمانەش بەمانای هەڕەشە و مەترسییەکی بچووك نایەت.

ئەم هەڕەشانە چل جار زیاتر لەهەڕەشەی چینایەتی مەترسیدارترە. بەر لەهەموو شتێك تایبەتمەندییەکانی بەرگری و بەرخۆدانی مرۆڤ لەنێو دەبرێت و ئاستی ورە و مۆراڵ دادەبەزێنرێت. ژیانی نێو خانوو شوێنی چیمەنتۆ لەکۆتاییدا مرۆڤ وەکو مێروولە لێدەکات. بەڵێ سەرمایەداری مرۆڤی کردووە بەمێروولە. ئەمە تەنیا لەسیستەمی سەرمایەداری چاوەڕوان دەکرێ. هەربۆیە لەکاتێکدا بەرنامە و تیۆری سۆسیالیستی نوێ دادەڕێژرێت, مسۆگەر پێویستە گفتوگۆ سەبارەت بەم مەسەلانە بکرێ.

ئەگەر سەرنجی ئەم مەسەلانە بدەین بۆمان دەردەکەوێت کە, پێویستە هەتا دەکرێت مۆدێلی سۆسیالیستی پێشبخرێت, ئەمەش مۆدێلی پێشخستنی مرۆڤە. بەمەزەندەی من لە ئاکامی ئەم مۆدێلە مرۆڤ دەتوانێ هەموو شتێك کۆنترۆڵ بکات. دەتوانێ کێشەی ژمارەی دانیشتوان کۆنترۆڵ بکات و چاودێری بکات. بێگومان دەتوانین لەم لایەنەوە باوەڕی بەکۆمەڵگا بهێنین. سەرمایەداری کۆمەڵگا ئیقناع ناکات, بەڵکو دەیخەڵەتێنێ و بەلاڕێیدا دەبات و بەکاری دێنێ. بەڵام سۆسیالیزم بەمجۆرە نییە, کۆمەڵگا ئیقناع دەکات و شێوازی کاری خۆبەختانە پیادە دەکات. مەترسی مەزنە, بۆ نموونە کاتێك دەڵێن ئۆکسی کاربۆنات کەم بکەینەوە هەموو کەسێك گوێڕایەڵی دەکات, چونکە دەڵێ بالەلایەك ژمارەی دانیشتوان کەم بێتەوە, لەلایەکی تریش با لەڕێگەی ئەو داهاتانەی بەدەست دێت بۆ خۆمان بیگوزەرێنین.

کۆمەڵگایەکی مشەخۆر و بەرخۆری زۆر سەرسوڕهێنەر خوڵقێنراوە. هەرکەسە دەیەوێ زیاتر بخوات و بەرخۆری و مشەخۆری زێدەتر پەیڕەو بکات. ئەگەر لەئاییندەیەکی نزیکدا هەموو کەسێك بووە مشەخۆر و بەرخۆرێکی هۆڤ و دڕندە, ئەو کاتە شتێك لەدنیادا نامێنێ بەکاری بێنن و یەکتری دەخۆن.

بەڵێ لەئاکامی مۆدێلی سۆسیالیستی زانستی, تێکدانی سروشت و ئێش و ئازارەکانی نێو کۆمەڵگاش روونادات و نامێنێ. ئەوکاتە دەتوانرێت پلانێك بۆ کێشەی ژمارەی دانیشتوان

دابنرێت. بەشێوەیەکی زۆر پلان و بەرنامەڕێژ دەتوانرێ هاوسەنگی ئابووری رابگیرێت. بەڵێ لە رۆژگاری ئەمرۆماندا سۆسالیزم ناوی ئەو تێکۆشانەیە کە بەرامبەر تێکدانی سروشت و مشەخۆری و بەدیلگرتنی کۆمەڵگا لەلایەن راگەیاندنی جیهانگیری و گەلێك دیاردە و نەخۆشی دیکە پەیڕەو دەکرێت.

بێگومان چەمکی سۆسیالیستی سەدەی نۆزدەهەم تێر ناکات, چونکە زیاتر چەمکێکی رەها توندە و لەسەربنەمای " شەڕی چینێك دژ بە چینێکی دیکە یان, رزگاری نەتەوەیی دژی داگیرکەران " بەڕێوەچووە, ئەمانە تا ئاست و رادەیەك پێویستن, بەڵام ئەو لایەنەی بەشێوەیەکی سەرەکی دەرکەوتۆتە پێش چۆنیەتی پێشخستنی دیموکراسیەتی سۆسیالیزمییە. خەباتی بنچینەیی خۆی لەتێکۆشان دژی تێکدانی ژینگە و مەترسی مشەخۆری و بەرخۆری دەبینێتەوە. دەشێ ئەمە ببێتە بەرنامەیەکی نوێی سۆسیالیزم. بەرنامەڕێژیەکی بەمجۆرەش هەم دەبێتە گوزارشتی سۆسیالیزم و لەهەمان کاتیشدا دەبێتە رزگاری خودی مرۆڤایەتی.

لەم چوارچێوەیەشدا سۆسیالیزم تاکە ئاییندەی مرۆڤایەتییە.

لەڕابردوو باسی بەکۆمەڵایەتیبوون دەکرا. ئێمە ئێستا بەسۆسیالیزم ناوی دەبەین. ئەگەر بەکۆمەڵایەتیبوون راوەستا, ئاژەڵێتی دەست پێدەکات و لەهەلومەرجی سەرمایەداریشدا مەترسیدارترین درندە پێدەگەن. هەربۆیە لەم قۆناخەی سیستەمی سەرمایەداری ئیمپریالیستی, تێکۆشانی سۆسیالیستیانە تاکە رێگای رزگاریە, واتە بەبێ ئەو ژیان نابێت. ئەگەر بێتو ئەم ئاژەڵێتیە گشتگیرییە بەربەست نەکرێت ئەوا مرۆڤایەتی کۆتایی پێدێت. لەم چوارچێوەیەشدا سووربوون لەسەر سۆسیالیزم سووربوونە لەسەر بەردەوامبوونی مرۆڤایەتی.

# هەندێك لەتایبەتمەندییە نوێیەكانی هەڵمەتی سۆسیالیستی لەرۆژگاری ئەمرۆماندا

واتادارترین وەڵام بۆ 1ی مایس كە بۆتە كولتوور و دابونەریتێك و رۆژی یەكێتی و هاوكاری و تێكۆشانی چینی زەحمەتكێش، ئەوەیە كە سەبارەت بە وەڵامدانەوەی پێداویستیەكانی تێروانینی جیهان و پراكتیزەكردنی تایبەت بەم چینە، خاوەنی هەڵوێستێكی

بنچینەیی و ئاشکرا و بەبڕیار بین. گەیشتن بەهێزی بەرجەستەکردن و بەدیهێنانی ئەمەش وەکو ئەرکێك رووبەڕوومان دەبێتەوە.

یادکردنەوە و پیرۆزکردنی ئەم رۆژە بەشێوەیەکی واتادار و رێ و رەسمی چڕ و پڕی جەماوەری و بەخشینی واتایەکی تۆکمە و پوخت؛ پێویستیەکی دەست لێبەرنەدراوە بۆ سەرخستنی ئەم ئەرکە و بۆ ئەو رەوشەی کە دوای هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو هاتە ئاراوە و خواستیان سۆسیالیزم لەبەرچاوان بخەن و بێواتای بکەن. کاتێك ئەمە ئەنجام دەدەین هەروەکو چۆن کێشە سەرەکییەکانی تایبەت بەمرۆڤ دەبینرێت, ئەوا بینینی رێگا چارەی ئەم کێشە مێژوویی و رۆژانەییە و بەدیهێنانی هێزی پراکتیزەکردنی هیچ گرنگییەکی خۆی لەدەست نەداوە و, بەڵکو رۆژ بەدوای رۆژ زیاتر دەرکی پێدەکرێت و دەکەوێتە پێشەوەی هەموو ئەرکەکان و, تەنانەت دەکەوێتە پێشەوەی هەموو ئەو ئەرکانەی کە بەکاری بەپەلە و دوانەخراو لەقەڵەمی دەدەین.

بێگومان هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو کێشەکانی سەرمایەداری کەم نەکردۆتەوە, یاخود بەواتای سەرکەوتنی سەرمایەداریش نییە, هەروەکو بانگەشەی بۆ دەکرێت. بەپێچەوانەوە باری زۆر گرانتر بووە و رووبەڕووی کێشەی هێندە سەختی کردۆتەوە کە ناتوانێ بەرگەی بگرێ و لەبن باری دەربکەوێ.

باس لەوە دەکرێت کە لەرۆژگاری ئەمرۆماندا سەرمایەداری بەشێوەیەك نیشانەکانی پووکانەوە و رزینی نیشانداوە, لەگەڵ هیچ قۆناخێکدا بەراورد و پێوانە ناکرێ و تەنانەت گەشبینترین شیکەرەوە و بیریاران دەتوانن باس لەوە بکەن کە مێژوو وەستاوە. لەوانەیە هەندێکیان بڵێن:" سەرکەوتنی یەکجارەکی سەرمایەدارییە " بەڵام تەواوی نیشانە و سەرەداوەکان ئاماژە بەوە دەکەن, کە ئەم رەوشە نزیك لەقیامەتە و وەکو راستینەیەك پەسندی دەکەن. بەمجۆرە مرۆڤایەتی خستە نێو ئاستێکی مشەخۆری وەها کە هاوتای نەبینراوە, لەمیانی پێشبڕکێ و خێرایی بوونێکی بەمجۆرە هەناسەی لەبەرمرۆڤایەتی بڕی و خستیە نێو رەوشێکەوە کە پێشبینی و مەزندەی ئەوە نەکرێ خۆی لەکوێ دەبینێتەوە و چۆن لەنێو دەچێ. بناخەی رەشبینی و تەنگژە ئەمەیە.

بەشێوەیەکی گشتی تەواوی چینە چەوسێنەر و فشار هێنەرەکان بەتایبەتیش بێ بەزەییانەترین چین کەسیستەمی سەرمایەداری ـ بۆرژوازی پشتی پێدەبەستێت, هەرچەندە شێوە و روخساری خۆی گۆڕیبێت, بەڵام هەر لەزووەوە کەوتۆتە نێو رەوشێك کە بۆتە بەڵا بەسەر کۆمەڵگاوە.

گەلێك جار دەگوترێ كە شۆڕشی ئۆكتۆبەر شۆڕشێك بوو بەرلەكاتی خۆی واتە زوو لەدایك بوو, هەربۆیە رێگای لەپێش شێوەیەكی سۆسیالیزمی وەها كردەوە كە لەسەربنەمای پێكهاتەی نەخۆش بونیاد بنرێ و لەهەڵوەشانەوە رزگاری نەبێت.

دەتوانین ئەم راستینەیە لەسەر ئەو شۆڕشانەش پەیڕەو بكەین كە لەقۆناخە كۆن و دوورەكانی مێژوودا روویانداوە. لەهەر سەراوبن بوونێكی گرنگ یاخود شۆڕشێكدا ئەو چینەی كەم ـ زۆر پێكهاتەی سەرەكی دەسەڵاتێكی شۆڕشگێڕی پێكدێنێت, ئەو چینەیە كە لەنزمترین ئاست و سەختترین هەلومەرجدا كاردەكات. كۆیلەكان و دوایش جوتیار و, دوای ئەمەش كاركەران و چینی زەحمەتكێشن كە رووخساری خۆیان گۆڕیوە.

هەروەكو دەزانین چینە باڵادەستەكانیش لەمیانی گۆڕینی روخساردا تاوەكو رۆژگاری ئەمرۆمان هاتوون. سیستەمی سەرمایەداری ـــ ئیمپریالیستیش لەمیانی بەكارهێنانی پێشكەوتنەكانی تەكنەلۆژیا و راگەیاندن و بڵاوكردنەوە بەشێوەیەكی بەربڵاو و سیستەماتیك شەرێكی سایكۆلۆژی, ئایدیۆلۆژی, كولتووری پەیڕەو كردووە و راستینەی چینەكانی شێواندووە و خستونیەتە نێو رەوشێك كە ناتوانن ململانێ و تێكۆشان بكەن. هەروەها لەمیانی ئەو هێرشەی دەیكاتە سەر كۆمەڵگا هەناسەی لەبەربڕیوە و ئەم شاڵاوەی خۆی پەیڕەو دەكات.

شتێكی سەیرە؛ لەڕابردوودا چینە باڵادەستەكان لەمیانی چەكی ئاگرین و بۆمباكانەوە هەوڵیاندەدا چۆك بەكۆمەڵگاكان دابدەن, وەلێ لەرۆژگاری ئەمرۆماندا پێویستیان بەمجۆرە شەرە نییە, لەجیاتی ئەمە شەڕی دەروونی, ئایدیۆلۆژی, كولتووری زۆر كاریگەر بووە. ئەو تەكنەلۆژیایەی كە لەئاراشدایە دەرفەتێكی مەزن بۆ ئەمە دەڕەخسێنێ. لەڕەوشێكی بەمجۆرەدا جیاوازی چینەكان تێكەڵ بەیەك دەبێت و لەمیانی ئەمەشدا دەرفەت دەڕەخسێ كە هەموو شتێك بەشێوەیەكی زۆر ورد بەفێڵبازی و چەوەساندنەوە و فشارێكی شاراوە بكەوێتە ژێر فەرمانی چینێك.

كاتێ لەرۆژگاری ئەمرۆماندا لەچوارچێوەی سنووری ئاشكرا و نەخشە بۆكێشراودا باس لەچینێك ناكەین, یەكێك لەهۆكارە سەرەكییەكانی ئەوەیە كە ئاماژەمان پێكرد. لەڕاستیدا هەرچەندە مەسەلەی رەنج و ئەو چینەی سەرچاوەی خۆی لێوە دەگرێت, دووچاری گۆڕانكاری شێوە و ناوەرۆك هاتبن, وەلێ دیسان چینی زەحمەتكێشن. بەڵام پێویست دەكات چینی باڵادەست بەشێوەیەكی باش و تەواو پێناسە بكرێت كە زێدەتر شێوەی خۆی گۆڕیوە و بەواتایەك خۆی گشتگیر كردووە و بۆ نێو تەواوی كۆمەڵگا تەشەنەی كردووە.

پێناسە كۆنەكانی لەجۆری: خاوەن كۆیلەكان ( كۆیلەدارەكان ), خاوەن زەویەكان (ئاغاكان), خاوەن كارگەكان ( سەرمایەدارەكان ) بەش ناكات و نابێتە وەڵام هەروەها زاراوەكانی بۆرژوازی

ـ ناوین, بۆرژوازی ـ بچووك یش بەش ناكات. ئەگەر بمانەوێ باش لەسۆسیالیزم تێبگەین, پێویست دەكات لەسەربنەمای لەبەرچاوگرتنی ئەو واقیعەی كە لەئارادایە شیكردنەوە و هەڵسەنگاندنی چینەكان ئەنجام بدرێت. بەتایبەتیش لەوڵاتێكی وەكو توركیا ئەگەر هەر لەسەرەتای ئاواكردنی رژێمەوە بڵێین " ئێمە گەلێكی بێ چین و بێ جیاوازین " و هەنگاوی سەرەتا لەمیانی ئایدیۆلۆژیایەكی بەمجۆرە هاوێشترا بێ, ئەوا ئەم رەوشە نوێیە گرنگییەكی مەزن لەخۆوە دەگرێت.

شێوازە توند و رەهاكانی فشار جێگای خۆیان بۆ فشاری ئایدیۆلۆژی و سایكۆلۆژی بەجێهێشتووە, رۆژانەش قووڵتر دەبنەوە. كۆمپانیاكانی راگەیاندن, بڵاو كردنەوە كە بەئیمبراتۆریەتی " میدیا " راگەیاندن ناوزەد دەكرێ, لەحكومەت زیاتر بەدەسەڵاتن و بەشێوەیەكی مەترسیدار كۆمەڵگا بەرێوە دەبات و ئاراستەی دەكات. جێگای تەكنەلۆژیا لەبەرهەمهێناندا زیاتر بووە و پێشكەوتووە. لەجیاتی رەنجی رەهای هزر ـ بازوو ( هەرچەندە لەبناخەدا پشت بەمە دەبەسترێ) وەلێ لەمیانی بەكارهێنانی شێوازەكانی تەكنۆلۆژیا لەبەرهەمهێناندا توانیویەتی رەنجی هزر ـ بازوو بێ كاریگەر بكات. واتە لاوازبوونی لایەنی رەنجی هزر و بازوو جێگای باسە كە مرۆڤی زەحمەتكێش پشتی پێدەبەستێ.

لەمیانی ئەو شۆڕشە زانستی ـ تەكنۆلۆژیەی كە كۆمپانیا و پاوانخوازی ئەمڕۆ پێشیان خستووە بەمرۆڤ دەڵێن: "تۆ هێندە پێویست نیت" بێكارییەكی لەڕادەبەدەر و تاڕادەیەك گرێدراوی ئەم تایبەتمەندییەی سەرمایەداری هاتۆتە ئاراوە. ئیتر بۆرژوازی وای لێهاتووە كۆمەڵگا بەشتێكی ناپێویست و بێ واتا لەقەڵەم بدات. لەڕاستیدا ئەوەی بێ واتایە خودی سەرمایەداری خۆیەتی. بەڵام بەهۆی ئەو ئامرازە مەزنانەی باڵادەستی كە بەدەستیەوەیە و لەمیانی شێوازی كاریگەركردن, دەتوانێ ئەمە بەكۆمەڵگا بە پەسندكردن بدات و پێی بڵێت: "تۆ بێ واتای".

لەمەش زیاتر دەست درێژی كردۆتە سەر هەسارەكەمان و دەیەوێ بۆری هەناسەی ببڕێ. هەڵبەتە لەناوبردنی سەوزایی لەڕوویەكەوە بەواتای بڕینی هەناسەی مرۆڤ دێت.

دەیانەوێ چەتری هەسارەكەمان بفڕێنن

لەمیانی كونكردنی پەردەی ئۆزۆن دونیایان رووبەڕووی هەموو جۆرە مەترسیەك بەكراوەیی هێشتۆتەوە و لەلایەكی دیكەشەوە دەشێ هەڕەشە و مەترسی چەكی ئەتۆمی هەركات و ساتێك مەرگەساتێك بنێتەوە. هەڵبەتە گومان لەوەدا نییە كە سەرمایەداری بەرامبەر بەبڵاوبوونەوەی گەلێ نەخۆشی لەجۆری ـ شێرپەنجە و ئایدز ـ و زیادبوونی بێ سنوور و ناهاوسەنگی ژمارەی دانیشتووان بەرپرسیارە كە دیارنییە جیهان بەرەو چ رەوشێك دەبەن. بەشێوەیەكی بەردەوام ئەم كێشانە سەختتر و دژوارتر دەكات و دەیگەیەنێتە ئاستی

تەنگەژەیەکی سەخت و چڕ و پڕ. لێرەدا بڕینی هەناسەی مرۆڤایەتی لەواری رۆحی و جەستەیی جێگای باسە.

سەرچاوە سەرەکییەکانی ژیانی مرۆڤ وێران دەکرێت و لەناو دەچێت, ئەستاتیك (جوانی) لەنێو دەبردرێت, رۆڵی ئایین و فەلسەفە کۆتاییان پێدەهێنرێت. رەوشی بەکۆیلەبوون, ئاپوورەی مرۆڤە گرگن و بستە باڵاکان لەڕاستیدا هەڕەشە و مەترسییەکی جددییە.

**"پێویستی بەئایدیۆلۆژیایەکی نوێ و فەلسەفەیەکی بنچینەیی هەیە"**

سۆسیالیزمیش کە رەقیبێکی خاوەن بانگەشەی سەرمایەداری بوو کەوتە نێو کەم و کورتی. ئێستا هۆکارەکانی ئەمە تاوتوێ دەکەین. چۆن دەتوانین پوختە بوون و تۆکمەبوونێکی بەمجۆرە بێنینە ئاراوە کە لەهەق سیستەمی ئیمپریالیستی ـ سەرمایەداری دەربکەوێت؟

لەڕاستیدا ئەو بوارەی کە پێویستی بەقاڵبوون هەیە پاراستنی سەرمایەداری رۆژگاری ئەمڕۆ بەواتای پەسندکردنی مەرگەساتی مرۆڤایەتی و لەناوبردنی ئایندەی دێت, بەواتای مەحکومکردنی دێت بەژیانێك, کە تەنانەت هێندەی ژیانی مرۆڤە سەرەتاییەکانیش پێگەیشتوو نییە و, بگرە خراپتریشە. هۆڤێتی و راستینەی کۆمەڵگای مشەخۆری کە لەئارادایە پێشخستنی پێناسەیەکی بەمجۆرە سانایی تر دەکات. ئەگەر مرۆڤایەتی بەردەوام بێت ئەوا بەلایەنی کەم بەگوێرەی یاساکانی سروشت و یاساکانی مرۆڤایەتیش رەوشێکی بەمجۆرە پەسند ناکرێت. بۆ تاوتوێکردنی رەوش و گەیشتن بەرێگەی چارەسەری, پێویستی بە ئایدیۆلۆژیایەك و فەلسەفەیەکی سەرەکی و پراکتیزەکردنیان هەیە, ئنجا ئەمە چ بەسۆسیالیزمی زانستی ناوزەدی بکەین یاخود بەسۆسیالیزمێك کە تاڕادەیەکی دیاریکراو, بونیادنراوەتەوە.

زۆر باش دەزانین کە سۆسیالیزمی زانستی لەڕۆژێکدا سەری هەڵنەدا و لەدایك نەبوو و, بەرهەمی ئەزموونی تاکە وڵاتێك نییە. تەنانەت بەرهەمی سەرمایەداری ئەورووپاش نییە. لەتەواوی قۆناخەکانی کۆمەڵگا و بەکۆمەڵایەتی بووندا, بەتایبەتیش چالاکییەکانی ئەو توێژانەی کە لەسەراوژێر بوونە شۆڕشگێڕیەکاندا خاوەنی رادیکاڵترین وەرچەرخان بوون, سەبارەت بەپێشخستنی سۆسیالیزم هزر و چالاکییان پێشخستووە. هەربۆیە هزر و پراکتیکێکە کە شانبەشانی بەکۆمەڵگابوونەوە پێشکەوتووە. قۆناخی سەرمایەداری واتا و هێزێکی زانستی بەم هزر و چالاکییە بەخشیوە و, بەپێی تێپەڕبوونی کات بەفۆرمیلی سۆسیالیزمی زانستی گەیشتووە.

بێگومان هەروەکو چۆن لەسیستەمە کۆمەڵایەتییەکاندا دەبینرێ, دەشێ کەموکورتی و چەوتی سۆسیالیزمی زانستیش هەبێ. لەسەردەمی هۆڤێتی سەرمایەداریشدا لەنێو شۆڕشی فەرەنسادا رادیکاڵترین چین بەکۆمۆنیستەکان ناوزەد دەکران. قۆناخەکانی دوای ئەوەش

بەردەوام لایەنە چەپڕەوەکانی شۆڕشە بۆرژوازییەکان، سۆسیالیست و کۆمۆنیستەکان بوو. ئەم قۆناخە تادەگاتە ئەزموونی کۆمۆنەی پاریس، واتە 1848 , 1870 کۆمۆنیستەکان تێیدا بەکاریگەر بوون. لەشۆڕشی ئۆکتۆبەریشدا دەسەڵاتیان گرتەدەست، پاشان ئەمە دەبێتە جولانەوەیەکی جەماوەری مەزن. بێگومان سۆسیالیزم لەم قۆناخەدا زیاتر هەنگاوی بەرەو زانستی بوون هاویشتووە، بەڵام ناتوانرێ بگوترێ کە ئەمە دوا گووتەی سۆسیالیزمە. زاراوەی " زوو گەیشتن بەکۆمۆنیزم "ی وڵاتەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو واقیعی نییە.

ئێستاکە باشتر لەوە تێدەگەین: لەتەواوی شۆڕشە سەرەکیەکاندا هەر جولانەوەیەکی گەیشتبێتە لوتکە و لایەنگری ڕەنج بوو بێت، ناوەڕۆکێکی سۆسیالیستی لەخۆوە دەگرێت یاخود ئامادەکارییەکە بۆ سۆسیالیزم. هەر لەڕاپەڕینی سپارتاکۆسەوە، کە سەرەکیترین سەرهەڵدانی سەردەمی کۆیلایەتییە تا دەگاتە تەواوی قۆناخە شۆڕشگێڕییە گرنگەکان، دەبینین گشتیان بەشداربوونێکیان بۆ تێکۆشان، واتە بۆ مێژووی تێکۆشانی سۆسیالیستی هەیە.

تەنانەت لەنێو شۆڕشی ئیسلامیەتیشدا، ململانێی نێوان ئیسلامیەتی فەرمی و ئیسلامیەتی ڕکەبەر تایبەتمەندێتی بەمجۆرە لەخۆوە دەگرێت. دەکرێ ئەمە بەململانێی سونی ـ عەلەوی ناوزەد بکرێت. بۆ نموونە رادیکاڵترین چین واتە لایەنگرانی حەزرەتی عەلی بەگوێرەی ئەو قۆناخە چینێکی سۆسیالیست یان چەپڕەو بوون. ئەو ئیسلامیەتەی بونیادنراوە ئیسلامیەتی فەرمی یان ئیسلامیەتی سونی یە. بەگوێرەی خۆی زۆر بەسانایی دەکەوێتە نێو جیاوازیەکی بەم شێوەیە.

لەچین و توێژە ڕاستڕەوەکانەوە تاوەکو رادیکاڵترین چینی چەپڕەو، لەشۆڕشی ئۆکتۆبەر و شۆڕشی فەرەنساشدا بەمجۆرەیە. هەروەها ڕاستڕەو و هێڵە ناوینەکان لەشۆڕشی ئۆکتۆبەریشدا هەیە. رادیکاڵترین توێژیان ئەو کۆمۆنیستانەن کە بەپارتی بەلشەفیك ناوزەد دەکرێن.

لێرەدا ئەمە دەردەکەوێتەڕوو: هێندەی مێژووی مرۆڤایەتی تێکۆشانی سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم ڕاستینەیەکە. بەڵام بەشێوەیەکی دووبارە دەکەونە نێو هەڵوێستی زێدەڕۆیی، بۆ نموونە کەوتنە نێو هەڵسەنگاندنێکی چەوتی بەمجۆرە کە لەماوەیەکی زۆر کورتدا لێشاوی هێزی خۆیان وەکو لێشاوێکی باڵادەست و سەرکەوتوو لەسەرانسەری جیهاندا لەقەڵەم دا. تەنانەت تاڕادەیەکیش وەکو پێخەمبەران هەڵسەنگاندنی لەشێوەی ئایینی هەرەدوایی، دوا گووتە، هەڵسەنگاندن ئەنجام دەدرێت. هەروەکو چۆن پێشکەوتنی کۆمەڵگا بەردەوام دەبێت گرنگی هەر قۆناخێك بەگوێرەی پێشکەوتنە نوێیەکان بەلاوە دەنرێت. نەك تەنیا وەکو گووتەیەکی بێ کۆتایی بەڵکو وەکو زاراوەیەکی کۆن و بەسەرچوو دەمێنێتەوە. بەڵام ئەو واتایە نادات کە ئەو گووتانەی گوتراوە گرنگی و واتای نییە. چونکە هەروەکو دەبینین

ئیسلامیەت, لیبرالیزمی بۆرژوازیەت, یاخود سۆسیالیزم بەگوێرەی کات و شوێن و سەردەمی خۆیان ڕێگایان لەپێش گەلێك پێشکەوتن کردۆتەوە و, شوێن پەنجە و میراسی گرنگیان بۆ مێژوو بەجێهێشتووە. لەم بوارەدا بەفیڕۆ نەچوون و پێشکەوتنی کۆمەڵگا و ئازادی تاڕادەیەك لەژێر سایەی ئەم تێکۆشانانە بەدیهاتووە. بەتایبەتیش تێکۆشانی سۆسیالیزم لەم بوارەدا ناوی سەرەکیترین پێشکەوتنە. ئەم پێشکەوتنانەی لایەنگری ڕەنج و بەرهەمهێنان و داهێنانە لەئاستێکی هەرە بڵنددا لەژێر سایەی تێڕوانینێکی ئایدیۆلۆژی بەمجۆرەدا مرۆڤایەتی بەرەو پێشەوە بردووە.

دەتوانین بڵێین " لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا ئاڵۆزی و تەنگژەیەکی چڕ و پڕ لەئارادایە. سەرمایەداری هەروەکو چۆن لەڕابردوو بانگەشەی دەکرد, ئەمڕۆکەش بانگەشەی ئەوە دەکات کە لەئاستێکی گەردوونیدا خاوەنی سیستەمێکی گشتگیرە. هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو لەئەنجامی کەموکورتی و لاوازییەکانی, دەرفەتێکی زیاتری دا بەسەرمایەداری تاوەکو ئەم بانگەشەیەی بەهێزتر بکات. بەڵام هەروەکو لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد ڕەوشێکی پێچەوانەی ئەم بانگەشەیە جێگای باسە.

ئەو قەیرانانەی بەشێوەیەکی رۆژانە سەختتر دەبن, پێویستی زیاتر بە سۆسیالیزم دەکات. دابڕان لەسۆسیالیزم واتای دابڕانە لەهەناسەدان.

لەهەموو کاتێك زیاتر چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی لەئەنجامی ئەو تەنگژە و قەیرانە سەخت و دژوارانە دەردەکەون لەمیانی سۆسیالیزمدا دەبێت کە گوزارشت لەئاستی وشیاری و زانستی بوونی کۆمەڵگا و بەکۆمەڵایەتیبوون بکرێت, چونکە لەنێو ئاستێکی هێندە مەزنی وێرانکاری و کێشە سەخت و دژوارەکاندا ناشێ سەرمایەداری لەناوخۆیدا چارەسەری بدۆزێتەوە.

لەمیانی شۆڕشی زانستی ـ تەکنۆلۆژی بەمجۆرە کێشەکان چارەسەر ناکرێن. سیستەمی شۆڕشی زانستی ـ تەکنۆلۆژی کە لەخزمەتی سەرمایەداریدایە لەقوڵکردنەوەی ئەم تەنگژانەی لەئارادایە زیاتر هیچ ئەنجامێکی دیکەی نییە.

دیسان چارەسەری لەڕاستینەی کۆمەڵایەتی سۆسیالیزمدا بەدی دەکرێ, بەڵام چۆن سۆسیالیزمێك؟ پێویست دەکات سۆسیالیزم پوخت و تۆکمە بکرێت ئینجا چ لەبواری تیۆریەوە بێت یاخود لەبواری ئاواکردنەوە. بەئەندازەی ئەوەی پێویست دەکات کەموکورتیەکانی مێژووی رابردووی دەرباز بکات و بەلاوەیان بنێت, لەهەمان کاتدا پێویستی بەوە هەیە بەشێوەیەکی واقیعبینانە قەیرانە ئاڵۆز و تێکچڕژاوەکانی رۆژگاری ئەمڕۆمان هەڵسەنگێنێ و هێزی چارەسەری خۆی بسەپێنێ. ئەگەر بێتو سیاسەتی تایبەت بەسەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی ئابووری و میتۆدی سیاسی و هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی هزری پێشنەخرێت, تادەگاتە

هەڵوێستێ کە وەڵامی سایکۆلۆژیا و مۆراڵ دەداتەوە, ئەوا ناتوانین وەڵامێکی بەجێ بۆ پرسی " چۆن سۆسیالیزمێك " بدەینەوە.

هەروەکو لەسەرەتاش ئاماژەمان پێکرد لەمیانی ئەو کێشانەی کە سەرچاوەی خۆی لەسەرمایەداری دەگرێت دەیانەوێ دونیا بێهەناسەدان بهێڵن, پەردەکەی کون دەکرێ. ئەو هەڕەشە و مەترسییەی کە سیمای مەعشەری پێوە دیارە, لەئەنجامدا مرۆڤێکی وای هێناوەتە ئاراوە کە گرگن و بستە باڵا و زۆر بچوك بۆتەوە.

پێویستی بەراسپاردە و هەڵوێستی سۆسیالیستی بەمجۆرە هەیە کە سەرلەنوێ ئیعتبار بەمرۆڤ ببەخشێتەوە و تێگەیشتن و رەوشتەکەی لەگەڵ سروشتدا ئاشت بکاتەوە و لەهەمانکاتدا دەرفەت و زەمینەی ئەوەش بدات کە ناکۆکییەکانی لەگەڵ سروشتدا قوڵبێتەوە.

لەهەمووو کاتێك زیاتر دەتوانین بڵێین: هەروەکو چۆن سیستەمی ئیمپریالیستی سەرمایەداری ئەو هاوسەنگییەی کە مرۆڤ لەنێوان خۆی و سروشتدا بونیادیناوە گۆڕیویەتی بۆ ناکۆکی زۆر مەترسیداری رووخاندن, لەهەمانکاتدا رێکخستنە کۆمەڵایەتییەکەشی مرۆڤایەتی تاکو رادەی پەیوەندی مشەخۆری بردووە. واتە رێگای لەبەردەم ئەم دوو ناکۆکیە جیهانگیریە کردۆتەوە.

بەڵێ سۆسیالیزم لەمیانی وەڵامدانەوەی ئەم دوو ناکۆکیە سەرەکیە دەتوانێ بەشێوەیەکی راست, خۆی پێناسە بکات. مەرجە کە شیکردنەوەیەکی راستی پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ سروشتدا ئەنجامبدرێت و دەتوانرێ بەپەیوەندی لەگەڵ ژینگەشدا ناوزەد بکرێت. چارەسەری شۆڕشگێڕانە بۆ ئەم کێشەیە بسەپێنرێت کە رێکخراوەکانی ژینگە و سەوزایی بەزمانێکی ریفۆرمیستانە ئاماژەی پێدەکەن. هەروەها پێویست دەکات بەرامبەر بەمۆدێلی کۆمەڵگا ئیمپریالیستی کە لەناوخۆیدا بچووك بۆتەوە, هەر لەپلاننامەی ژمارەی دانیشتوانەوە بگرە تاوەکو دەگاتە پلاننامەی بەرهەم هێنان و سەرلەنوێ رێکخستنەوەی سەرخان و هەروەها سەرلەنوێ پێناسەکردنی مرۆڤ لەلایەنی دەروونی و رەوشتییەوە ئەنجامبدرێ. بوون بەهێزی چارەسەری بۆ ناکۆکییەکی چڕو پڕی بەمجۆرە دەشێ سۆسیالیزم بکات بەرۆژەڤ و راستییەکی هەنوکەیی. چونکە پێناسەیەکی تەسکی چینایەتی تێر ناکات.

**"چینی کارکەر وەکو سەدەی نۆزدەهەم نەماوە"**

بنبەستبوونێکی سۆسیالیزمی لەئارادایە, کە لەسەربنەمای شیکردنەوەکانی سەدەی نۆزدەهەم لەکێشەکان نزیك دەبێتەوە و تاوتوێیان دەکات, دەڵێن "چینێکی کارکەری بەمجۆرە " لەڕاستیدا چینێکی بەمجۆرە نەماوە, یاخود دەتوانین بڵێین ئەو سەردەمە بەسەر چووە کە ئیمپریالیزم تەنیا بەچەوساندنەوەی چینێك تێر بێت و بوەستی.

بەواتا تەسکەکەشی چەوساندنەوەیەك لەئارادایە, بەلام زۆر گشتیگر بووە و ئێمەش گوتمان لەمیانی شۆڕشی تەکنۆلۆژی ـ زانستی و ئەو پێشکەوتنانەی جیهانی چاپ ـ بلاو کردنەوە ڕێگای بۆ ئاوالا کردووە, کۆمەلگای بەدیل گرتووە. شێوازی تالانکاری و فشاری وەها پێشکەوتووە کە بەهیچ شێوەیەك لەگەل سەدەی نۆزدەهەمدا پێوانە ناکرێت.

هەربۆیە لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا هەلسەنگاندن لەسەربنەمای شیکردنەوەکانی رابردوو, واتای تێکەلکردن و نەناسینی راستییەکانە. لەگفتوگۆکانی سەبارەت بەسۆسیالیزم رەوشێکی بەمجۆرە لەئارادایە, ئەمەش گوزارشت لەمەرگەسات دەکات. هەلسەنگاندن و شیکردنەوەی ئەم رەوشە تیشك دەخاتە سەر شێوازەکانی شەڕ و کێشە تاکتیکییەکانیش. تەکتیکە کۆنەکان لەڕۆژگاری ئەمڕوماندا بەش ناکەن. هەروەکو چۆن کۆمەلگا خزێنراوەتە ناو فشار و چەوساندنەوەیەکی گشتگیر, لەبەرامبەر ئەمە پێویستە شێوازی وەهای تێکۆشان پێشبخرێت کە تەواوی کۆمەلگا پەیوەندیدار بکات.

سیستەمی ئیمپریالیستی ـ سەرمایەداری سەبارەت بەتەواوی مرۆڤایەتی هاوسەنگی سروشتی تێکداوە. هەربۆیە پێویست بەڕاسپاردە و ڕێنومایییەکی بەمجۆرە دەکات کە بەرفراوانترین توێژەکانی کۆمەلگا بدوێنێ. واتە بەئەندازەی ئەوەی پرۆگرامێکی سۆسیالیستی پشت ئەستوور بە تێڕوانینێکی دروست و بەرجەستەکردنی تەکتیکەکانی لەبواری کرداریدا پێویستە و وەلامی کێشەکان دەداتەوە, هێندەی ئەوەش سۆسیالیزم دەتوانێ ئەوە نیشان بدات کە پرەنسیپێکە جارێکی دیکە تۆکمە و پتەو بۆتەوە و هێزی چارەسەری کێشەکانە.

گفتوگۆیەکی بەمجۆرە راستە و لەجێی خۆیدایە. هەربۆیە ئەوانەی بەقولاییەوە گرێدراوی چارەنووسی مرۆڤایەتین و دەیانەوێ بەشێوەیەکی بنچینەیی هەلوێست سەبارەت بەکێشەکانی مرۆڤایەتی نیشانبدەن, ئەوا لەسەربنەمای قالبوونێکی زیاتر پەیوەندی نیشاندەدەن و نزیکبوون لەسۆسیالیزم دەکەن؛ لەسەربنەمای کارامەیی و تێگەیشتنی زیاتر و دۆزینەوەی چارەسەری بۆ کێشە و گیروگرفتە نوێکان هەلوێست نیشان دەدەن.

ئەرکەکان چاوەڕوانیمان دەکەن. لەگفتوگۆکردنی سەبارەت بەم مەسەلەیەدا نەزۆکی هەیە و دووبارە کردنەوەی زاراوە کۆنەکان بەس دەبینرێت. بۆیە پێویست دەکات گفتوگۆ نوێ بکرێتەوە. دەتوانین لەسەر پێناسەیەکی نوێی سۆسیالیزمی بوەستین و بەرنامە و چالاکی و چۆنێتی تەکتیکەکانی تاوتوێ بکەین. لەم چوارچێوەیەشدا دەشێ پارتی نوێی سۆسیالیستی ئاوا بکرێن و شێوازەکانی چالاکی جەماوەری پێشبخرێن. لەژێر سایەی تێڕوانینێکی سۆسیالیستانە دەتوانرێ شۆڕشی زانستی ـ تەکنۆلۆژی بکرێت بەهێزێکی کاریگەری کرداری بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانە. بێگومان هەلوێستێکی بەمجۆرە لەماوەیەکی زۆر کورتدا ئاستی پەیوەستداربوون بەسۆسیالیزم زیاد دەکات و ئەو راستییە نیشاندەدات کە سەرچاوەی سەرەکی

چارەسەرییەو، لەبەرامبەر ئەو سەرمایەدارییەی کەوتۆتە نێو سەردەمێك کە چڕترین پوکانەوە بەخۆیەوە دەبینێ، قۆناخێکی گونجاوی سۆسیالیزم دێنێتە ئاراوە.

بەئەندازەی ئەوەی پارتیمان PKK جوڵانەوەیەکە کە هەر لەسەرەتاوە هەڵوێستی بەرامبەر بەئەنجامە نێگەتیفییەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو نیشاندا، لەهەمانکاتدا نەیهێشتووە رەنگدانەوەی ئەم کاریگەریە نێگەتیفیانەی پێوەدیار بێت، بەمجۆرەش توانی ئەو راستییە دەستنیشان بکات کە سۆسیالیزمێکی رەها گەلێك کەم کوڕی خۆی هەیە، بەلام سەرەڕای ئەمەش جوڵانەوەیەکە بەردەوام باوەڕی بەسۆسیالیزم بووە و لەسەر ئەم بنەمایەش لێی نزیك بۆتەوە.

بەتایبەتیش ئەمەی بەشێوەیەکی سەربەخۆ و زۆربەخۆباوەڕ لەشوێنێکدا پەیڕەو کردووە کە بە" کوردستان" ناوزەد دەکرێ و پاشکەوتوترین وڵات و کۆمەڵگایە، هێزێکە لەم بارەیەوە ڕێگای لەپێش گەلێك ئەنجامی گرنگ کردۆتەوە و پارتێکە لەسەر ئەم بنەمایە شێوەی گرتووە. بەم واتایە ئەزموونی PKK جوڵانەوەیەکی پێشکەوتنە و، لەسەردەمێکدا توانیویەتی بگات بەرێبازی ئایدیۆلۆژی، چالاکییەکی سۆسیالیستیانەی مەزن، کە سۆسیالیزمی بونیادنراو سەرەڕای ئەوەی لەئاستی دونیادا لەگەڵ سیستەمی سەرمایەدری ـ ئیمپریالیستی گەیشتە هاوسەنگییەك، بەلام لەئەنجامی بنبەستبوونی ناوخۆیی هەڵوەشایەوە و خواستیان تاڕادەیەکی مەزن سۆسیالیزم لەبەرچاوان بخەن. بەم رەوشەی کە ئێستا تێیدا دەژی کەمێکیش لەو جوڵانەوانە دەچێ کە لەسەردەمی پاشڤەڕۆیەتیدا لەسەرپێ مانەوە و تاڕادەیەکیش خاوەنی جێگە و شوێنێکی بەکەرامەت و شەرەفمەندانە بوون.

هەڵبەتە لەسەردەمێکی بەمجۆرەدا کە سیستەمی فەرمی ـ باڵادەست، تاوەکو دەتوانێ بەگوێرەی خۆی هەڵس و کەوت دەکات و هەموو لایەنێك لەژێر باڵ و سایەی پاشڤەڕۆیەتیدا دێن و دەچن، ئەو رێکخراوەی گۆڕەپانی تێکۆشان چۆڵ ناکات و درێژە بەبانگەشەکانی خۆی دەدات و جەختی لەسەر دەکاتەوە، جوڵانەوەیەکی ئازا و دلێرە. لەهەمان کاتدا جولانەوەیەکە کە لەتوانا و دەسەلاتی دا هەیە بەناوی مرۆڤایەتیەوە بدوێ.

هەر جولانەوەیەکی مەزنی ئازادی بەئەندازەی ئەوەی ببێتە وەلامێکی سەرکەوتوانە بۆ سەردەمی ئەو موحافەزەکارییەی لەئاستی گەردونیدا لەئارادایە، تەنیا بەوە ناوەستێ چارەسەری بۆ ئەو وڵات و گەلە بێنێ کە تێیدا دەرکەوتووە، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانێ ببێتە وتەبێژی بانگەشەکانی مرۆڤایەتی. هەربۆیە لەقۆناخێکدا خاچ پەرستەکان، لەقۆناخێکی دیکە موسوڵمانەکان، هەروەها لەقۆناخی دیکەش شۆڕشەکانی فەرەنسا و ئۆکتۆبەر رۆڵێکی بەمجۆرەیان بینی و توانیان ببنە وەلام بۆ گەلێك کێشە کە رۆڵیان ناتوانرێت بچوك بکرێتەوە.

هەرچەندە لەسەرەتادا ئامادە نەبووین و وەکو جولانەوەیەکی نەتەوەیی دیاربووین, بەڵام رەوشی نێودەوڵەتی ئێستا و پێشکەوتنە هەرێمیەکان زاراوەی PKK لەئاستێکی گەردوونیدا وەکو زاراوەی سۆسیالیزم و نوێنەرەکەی نیشاندەدات, هەروەکو بڵێی ناچاری رۆڵێکی بەمجۆرەی دەکات. هەرچەندە لەسەرەتا بەم شێوەیە تەماشامان نەدەکرد, بەڵام ئەگەر ئەو هەلومەرجە ئاڵۆزەی بەخێرای دەگۆڕێت ئەرکێکی بەمجۆرە بخاتە ئەستۆی پارتیمان, ئەوا بێگومان ئەوە جێگای شانازی و سەربەرزیمانە. بەڵام لەهەمان کاتدا تێگەیشتنێکی راست و دروستی ئەم ئەرکە و هەڵسەنگاندن و دەست نیشانکردنی ئەو لایەنەی ئێمە دەتوانین بەهێزی بکەین و تێیدا بەشداربین وەکو مەرجێك بەسەرماندا دەسەپێنێ.

خۆرهەڵاتی ناوین گۆڕەپانێکە بەدرێژایی مێژوو گەلێ ئایدیۆلۆژی, بەتایبەتیش ئایین بەناوی مرۆڤایەتی دەرکەوتووە و زۆر چالاکی و بانگەشەی تێدا پێشخراوە. بینینی رۆڵی لانکەی مرۆڤایەتی و دەرکەوتنی تەواوی شارستانییەتە سەرەکییەکان لەم گۆڕەپانە, رۆڵی راستینەی کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین لەپێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا نیشان دەدات. هەربۆیە رەوشی سەختی مرۆڤایەتی لەم گۆڕەپانەدا و جەخت کردنەوەی لەسەر چارەسەری, سەرەڕای دژواری ڤەیرانەکانی ئیمپریالیزم, رێکەوت نییە.

لەمیانی هەندێ بوویەرەوە مێژوو ئەو راستییەی روون کردۆتەوە کە هەرچەندە لەشوێنێکدا تەنگژەکان سەخت و گران بن, بەو ئەندازەیەش هەنگاو و قەڵەمبازی شۆڕشگێڕی پێشدەکەوێت. کوردستان کە پاشکەوتوترین ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوینە و گەلی کوردستانیش گەلێکە لەبیرکراوە و لەڕەوشی مرۆڤایەتی بەدەرنراوە, ئێستا سەرلەنوێ هەوڵدەدات چاوەکانی بۆ ژیان بکاتەوە. لەکاتێکدا چاوەکانی دەکاتەوە دەتەوێ بەهەنگاو هاوێشتنێك تەواوی ئەو قۆناخانە ببڕێت کە مرۆڤایەتی لەکاروانی پێشکەوتنی خویدا بڕیویەتی. ئەمەش تاڕادەیەك بۆتە نەسیبی PKK و, گوزارشتی خۆی لەمەزنایەتی PKK دا کردووە.

لەم چوارچێوەیەدا پارتیمان بەئەندازەی تێگەیشتنی مێژوویی, دەرك مە رۆڵەش دەکات کە راستینەی واقیعی و هەنوکەیی دەیخاتە ئەستۆی سۆسیالیزم, هەوڵدەدات نوێنەرایەتی بکات و ببێتە ووتەبێژی. لەم بارەیەشەوە هێندەی گەوهەرێکی ئەنتەرناسیۆنالیستی بەشێوەیەکی زۆر لێهاتوانە گەوهەری نەتەوەیی خۆی خستۆتەڕوو. لەڕێگای گەلێك شەهادەتی بەهاداریشەوە ئەم راستییەی سەلماندووە کە خاوەن گووتەکانی خۆیەتی و بەرجەستە و پراکتیزەیان دەکات. هەروەها لەو باوەڕەدایە کە کاتێك گەلەکەی خۆی بەرەو ئازادی دەبات مرۆڤایەتیش ئازاد دەکات و لەوبوارەدا هەنگاوێکی سەرەکی هاوێشتووە و, لەسەربنەمای دەرك پێکردن ئەمە ئەنجام دەدات.

"PKK جولانەوەیەکی رەنجە"

لەراستیدا PKK, جولانەوەیەکە لەتەواوی قۆناخە مێژوویەکاندا دووچاری پیلانگێڕی نێودەوڵەتی پاشڤەڕۆیانە بۆتەوە. باوەڕ ناکەم بەو ئەندازە فراوانە پیلانێکی نێودەوڵەتی لەدەوربەری جولانەوەیەکی دیکە هاتبێتە ئاراوە. هەر لەبەرئەوەی تەنیا جولانەوەیەکی بەهێزی سۆسیالیستی و رزگاری نەتەوەییە, کە لەسەر پێیان مابێتەوە, پیلانێکی نێودەوڵەتی لەدژی ئەنجام درا. بەڵام بەرخۆدانی کرد و سەرکوت نەکرا. لەئەنجامی هەڵمەتە نوێکانی و ئاستی بڕیاردانی لەبەڕێوەبردنی شەڕدا ئەوەی دووپاتکردەوە کە زاراوەی سۆسیالیزم تێکناشکێت. تێکشکانیش لەملاوە بمێنێ, ئەوا لەمیانی ئەو هەنگاوانەی دەیهاوێژێ زیاتر لەسەرکەوتن نزیك دەبێتەوە و ئەوە دەسەلمێنێ کە جولانەوی هەرە راست و بەهێزی ئەم سەردەمەیە و تایبەتمەندێتی سەرەکی و سەرچاوەی خوڵقاندنی ئەم پێشکەوتنانە ئەوەیە کە جولانەوەیەکی سۆسیالیستی یە.

بێگومان پێویست دەکات تێگەیشتنی مێژوویی و سەردەم بگاتە پێناسە و گوزارشتێکی زانستیانە. هەروەها پێویست دەکات بەفوولایی وەلامی نوێ بۆ چارەسەری کێشەکان بدرێتەوە و, لەسەربنەمایەکی نوێ, پارتی رەنج و دیموکراسی سۆسیالیستی و چالاکییەکانی دەوڵەت ـ گەل پێناسە بکرێت. لەمیانی پراکتیکی بەرجەستە و تاکتیکە جیاجیاکاندا جولانەوەیەکی گەلێری تێر و تەسەلان هێنایە ئاراوە.

پارتیمان تەنیا رێگای رزگاری لەپێش هەژارترین توێژدا ناکاتەوە بەڵکو لەهەمانکاتدا رێگا لەپێش چین و توێژەکانی دیکەی کۆمەڵگاش دەکاتەوە. دەتوانرێ بەرامبەر بەچەوساندنەوەی رەنج و کۆیلەکردنی ژنان و ئەو فشارانەی کە لەئەنجامی جیاوازی مەزهەبی و ناکۆکی نەتەوەییەوە بەدیدێت, لەسەربنەمای چارەسەری هەڵوێست پێشبخرێت. سەرەڕای سەختی و کەموکوڕییەکانی, درێژە بەپێشکەوتنەکانی دەدات و, لەسەربنەمای رێزگرتن لەرەنج, هەوڵ دەدات ببێت بەپارتی ئەو کەسانەی خاوەنی رەنجن. سەبارەت بەکەسایەتییەکی قارەمان و فیداکار و شێوازێکی ژیان کە شایستەی رەچەڵەکی مرۆڤ بێت بەشێوەیەك تاوتوێی کردووە کە تاوەکو ئێستا هیچ پارتییەك بەتێر و تەسەلی نەیگرتۆتە دەست و بەم شێوەیە وەڵامی نەداوەتەوە.

ئەو مرۆڤایەتییەی راستینەی PKK بەرجەستە بکات, بەواتای مرۆڤایەتییەکی ئازاد و رزگاربوو دێت. ئێستا ئێمە لەڕەوشێکداین کە هەنگاوێکی بچووکمان هاوێشتووە. ئەگەر بێت و بەناوی گەلەکەمان ئەمە بەسەرکەوتنێکی یەکجارەکی بگەیەنین, ئەوا زۆر باش دەزانین کە بەناوی مرۆڤایەتی دەبێتە دەسکەوتێکی مەزن. هەربۆیە توانیمان و زانیمان چۆن ئەو رزگاربوونەی لەئاستی تاکە کەسدا بەدیدێت, وەرچەرخێنین و بیگۆڕین بۆ ئەو رزگاربوونەی

لەئاستی گەلدا بەدیهاتووە. لەهەموو کاتێك زیاتر گرێدراوی ئەوەین کە ئەو رزگاربوونەی لەئاستی گەلێکدا بەدیهاتووە بگۆڕین و وەریچەرخێنین بۆ رزگاربوونی تەواوی مرۆڤایەتی.

باوەڕیمان بەمرۆڤایەتی هەیە, باش دەزانین ژیانێك هەیە کە شایستەی مرۆڤ بێت.

هەر لەبەرئەوەی بەقووڵایی گرێدراوی ئەم راستیەین, بۆیە بەشێوەیەك ژیانی خۆمان دەخەینە خزمەتی مرۆڤایەتی کە لەهیچ پارتێکدا نابینرێ. جوڵانەوەیەکی تا ئەم رادەیە نوێنەرایەتی کۆمەڵایەتی بوون بکات و لەم پێناوەشدا هێندە فیداکاری و جەسارەتی پێشخستووە, تەنانەت دەشێ جوڵانەوەیەکی گەوهەری سۆسیالیستانە بێت. هەربۆیە شەرەف ئەمە بۆتە نەسیبی PKK. بێگومان ئەم تایبەتمەندیە سەرەکیەی پارتیمان وەکو سۆمای چاومان دەپارێزین. تەواوی شەهادەتەکان لەسەر ئەم بنەمایەن و, لەم پێناوەدایە. هەروەکو چۆن ئەم بەرخۆدانی و فیداکارییە مەزنانە لەسایەی ئەم گەوهەرە پتەوە هاتە ئاراوە, لەهەمانکاتدا لەپێناو پاراستنی ئەم گەوهەرە ئەنجامدراوە. ئێمەش لەسەربنەمای ئەم باوەڕیە سەرمان هەڵدا و مەزن بووین. هەروەها لەو باوەڕەداین کە مەزن بوونمان لەمیانی پاراستن و پتەوکردنی زیاتری ئەم گەوهەرە بەدیدێت و ئەمەش وەکو ئەرکێك دەبینین. بەقوڵایی دەرك بەم مەسەلەیە دەکەین, هەروەها ئاستی بڕیار و پراکتیزەکردن لەبەرزترین ئاستدایە.

ئەو هەڵوێستەی بەخێرایی کار و شێوازی لێدان ناوزەدی دەکەین چەندی بڵێی پێشکەوتووە. بەجۆرێك وەڵامی ئەو شیکردنەوەیەی سەرۆکایەتی دراوەتەوە کە دەڵێ: " گەل لەخۆتدا ئاوا بکە, مرۆڤایەتی نوێ لەخودی خۆتدا ئاوا بکە, لەم پێناوەشدا خۆت بگەیەنە ئاستی هەرە بەرزی بانگەشەی مرۆڤایەتی, لەم پێناوەدا چی پێویست بێت ئەنجامی بدە" ناتوانرێت ئەمە بچووك بکرێتەوە.

ئەم راستییانەی کە لەلایەن ژمارەیەکی کەم لەهێزەکانی پارتی دەرکی پێکرابێ, لەمە بەدواوە بەشەپۆلێك کە لەهەموو کاتێك زیاتر و لەئاستێکی بەرزتردا بێت, شەپۆل بەشەپۆل رەنگدانەوەی بەسەر گەلەکەمان و گەلانی ناوچەکە و مرۆڤایەتیدا دەبێت. گرێدان بەشکۆمەندی پرەنسیپەکانی سۆسیالیزم و نیشاندانی هەڵوێستێکی زانستیانە دەبێتە راستینەی سەرەکیمان.

جوڵانەوە سۆسیالیستەکەمان کە لەسەر ئەم بنەمایە دەرکەوتووە, بۆتە لێهاتووترین پارتی رۆژگاری ئەمرۆمان, بێگومان لەمە بەدواوە بەشێوەیەکی لێهاتوانەتر و بەبڕیار و سەرکەوتووانەتر بەرەو بەدیهێنانی ئامانجەکان هەنگاو دەهاوێژێ و ئاراستەی خۆی وەردەگرێ. هەربۆیە دەڵێین: باشترین وەڵاممان داوەتە 1 ی مایس رۆژی رەنج, یەکێتی, هاوکاری و تێکۆشان و لەم پێناوەشدا درێژە بەپابەندبوونی خۆمان دەدەین بۆ تەواوی

زەحمەتکێشانی جیهان, باوەڕی خۆمان بەمێژوو و رۆژگاری ئەمرۆمان نیشانداوە. لەم چوارچێوەیەشدا دەڵێین: بەباشترین شێوە بڕیارمان لەسەر ئاییندەی خۆمان داوە.

بژی 1ی مایس رۆژی یەکێتی, هاوکاری و تێکۆشانی تەواوی زەحمەتکێشان.

1ی مایسی 1993

# دەکەوینە نێو قۆناخی شۆڕشە نوێکان

تاوەکو ئێستاش ئەمریکا ئیمپراتۆری ستراتیژی نێودەوڵەتییە. تورکیا یاخود کارگێڕی تورکیا جێگایەکی گرنگ لەنێو ئیمپراتۆرییەتێکی بەمجۆرەی ستراتیژی نێودەوڵەتیدا دەگێڕێت. ئەمریکا سەبارەت بەمەسەلەکانی بەلکان, قەفقاسیا و خۆرهەڵاتی ناوین, لەئاستێکی ستراتیژیدا پەیوەندی لەگەڵ کارگێڕی تورکیادا هەیە. تەنانەت ئەم پەیوەندییە زیاتر پێشدەکەوێت و سەرنج راکێشتر دەبێ. پێشخستنی ئەم پەیوەندییەش ئەو واتایە نابەخشێ کە بەشێوەیەکی هەمیشەیی دەمێنێتەوە و دەستبەرداری لێناکرێت, تەواو

بەپێچەوانەوە, گرێدراوی نیشاندانی پەیوەستبوون و رەوش و کارەکتەری گومان لێکراویەتی. دەستبەرداری نابێت, بەڵام لەبەرئەوەی دەزانێ کە هەر کاتێك شیمانەی هەیە لەدەستی دەربکەوێ. بۆیە بەدوای ئەڵتەرناتیفێکدا دەگەڕێ. گەلێك جار دووبارە دەکرێتەوە بەتایبەتیش لەلایەنی سەرۆك وەزیرانی تورکیا دەگوترێت " تاڕادەیەکی مەزن پشتگیریمان لێدەکەن, بۆ جاری یەکەم بەم شێوەیە پەیوەندی هێزە نێودەوڵەتییەکان بەرامبەر ئێمە لەئاستێکی بەرزدایە, لەگرنگی ستراتیژیمان گەیشتوون " راستە تێگەیشتوون بەڵام زۆر باشیش دەزانن کە ئەمە کاتییە, هەر لەبەرئەوەی دەزانن ئیتر کار لەرێگەی سیخوڕەکانەوە بەرێوە ناچێت, لەلایەکی دیکەوە تەگبیر وەردەگرن.

چەمکی ئەمریکا تارادەیەك بەمجۆرەیە. لەنێو ستراتیژی خۆیدا دەڵێ " بیست و چوار کاتژمێر یاخود کاتژمێرێك بەر لەڕووخان و پاکتاوبوونی دەوڵەتی تورکیا گەورەترین هەستیاری نیشان دەدەین, بەڵام لەلایەکی دیکەوە پرسیارێکی قووڵ لەخۆی دەکات و دەڵێ " دەتوانم چی بکەم؟" بەم شێوەیەش دەکەوێتە ناو پەشۆکاوی. لەلایەکەوە PKK وەکو تیرۆرستی پلەیەك رادەگەیەنێ, لەلایەکی دیکەشەوە بیر لەپەیوەندی ناڕاستەوخۆ یاخود راستەوخۆی لەگەڵدا دەکاتەوە و بەکرێگیراو و نۆکەرانی خۆی دەخاتە نێو سەفەربەرەوە و, لەبەرزترین ئاستدا بانگهێشتیان دەکات. گەلێك لەسیخوڕە چەپەڵ و گرنگەکانی خۆی دەخاتە گەڕ. بۆ ئەوەی رەوتێکی " میانڕەو " مان لەناودا دروست بکەن, کارتی سەوزی نیشان دەدات, بۆ پێشخستنی رەوتێکی میانڕەو شێلگیرانە و بێ سڵەمینەوە هەوڵ دەدات.

تەنانەت کاتێك بەشێوەیەکی هەرە زێدە دەڵێن " PKK تیرۆریستە " لەلایەکی ترەوە بەپاڕانەوەوە, هەڵوێست و داخوازی خوڵقاندنی " PKK یەکی میانڕەو". لەئارادایە. ئەمەش ئەوە نیشان دەدات تا چ رادەیەك تەنگەتاو بووە و تاچ رادەیەك نزیکە و ئامادەیە ئێمە وەکو هێزێکی سیاسی بناسێت. دەتوانین زۆر بەڕاشکاوی ئاماژە بەوە بکەین کە لەسەر بنەمای ئەم هەڵوێستە پێ دەچێ ئەمرۆ یاخود سبەی دان بەهەبوونی PKK دا بنێت و بەدوای پەیوەندیدا بگەرێت.

لێکدانەوە و مەزەندەکردن لەسەر بنەمای ئەوەی کە گوایە لەستراتیژیەتی ئەمریکادا پەیوەندی نیشانی ئەم هەڵکشانە شۆڕشگێڕییە نادرێت و تەنانەت لەمیانی ئەوەی کە ئەم تێکۆشانە " تیرۆریستە " وەڵامی داوەتەوە و دەیەوێ بیخنکێنێ, کەموکوڕی و ناتەواوی مەزن لەخۆوە دەگرێت. ئەمریکا هەوڵ دەدات بخزێتە نێو ریزەکانی شۆڕشیش. هەر لەئێستاوە دەڵێت رەوتی "میانڕەو "بەبناخە دەگرم. ئەگەر لەم هەوڵەیدا سەرکەوتن بەدەست نەهێنێ ئەوکات لەمیانی خۆ خزاندنە ناوی هەوڵ دەدات رەوتێکی " میانڕەو " بخوڵقێنێ. دەساڵ, پەنجا ساڵ دوای سەرکەوتنیش هەر درێژە بەم هەوڵ و هەڵوێستانەی دەدات, هیچ

گومانێکیشمان لەمەدا نییە, بەلام کاتێك دەڵێین گومان لەمەدا نییە نابێ ئەم رەوشە نەبینین و بەلاوەی بنێین. دەبێ سەرەتا زۆر بەباشی ئەوە ببینین کە ئایا ئەمریکا ستراتیژی و پەیوەندی و ئامانجەکانی چی یە؟. لەسەر ئەم بنەمایەش لێی ناترسین, لەپێشخستنی پەیوەندیش لەگەڵیدا ناترسین, بەلام لەهەمانکاتدا باوەڕ بەئاوات و بەمەبەست و بەهاکانی چەوساندنەوەی ئیمپریالیستی ناکەین. زۆر بەباشی دەیناسین و ئێستا بێ یاخود دوای دە ساڵ یا پەنجا ساڵی دیکە, بەردەوام ئەم راستییە دەبینین و هەڵوێست بەرامبەر ئەم سیاسەتانەی نیشان دەدەین. تەنانەت راکێشی نێو پەیوەندی دەکەین. پەیوەندی بۆ ئەوە پێشدەخەین کە زیاتر لێی تێبگەین و حسابی ئەو سیاسەتە بێ شەرمەفانەیان لێ بپرسین کە بەدرێژایی سەدان ساڵە بەڕێوەی دەبەن.

ناشێ گەورەترین هێزی ئیمپراتۆریەتی ئەم سەردەمە رەچاو نەکرێت یاخود لەهەموو لایەنێکەوە هەڵنەسەنگێرنرێت. بەتایبەتیش بەهیچ جۆرێك نابێت نکوڵی لێ بکرێت, کاتێك پەیوەندیمان لەگەڵیدا هەبێت یاخود نەبێت, دەبێ لەهەردوو رەوشدا ئەمە ببینرێ. بەڕێوەبردنی تێکۆشان لەهەردوو رەوشدا گرنگە. ئینجا چی لەکاتی هەبوونی پەیوەندیدا بێت یاخود لەکاتی نەبوونی پەیوەندییەکی بەمجۆرەدا. هەروەکو چۆن بەردەوام سیستەمی ئیمپریالیستی خۆی نوێ دەکاتەوە و بەمجۆرە بەردەوام دەبێت, ئەوا خۆ نوێکردنەوەی شۆڕشەکەمان بۆ ئەوەی بتوانێ تێکۆشان بەڕێوە ببات, مسۆگەر پێویستییەکی مەزن بوون و بەدەستهێنانی سەرکەوتنێکی بەردەوامە.

شتێکی روون و ئاشکرایە کە ئیمپریالیزم بوونی هەیە و لەنێو نەچووە. لەسەردەمێکدا ئەم زاراوەیە لای چەپی تورك زۆر بەربلاو بەکار دەهێنرا, بەلام ئێستا وای لێهاتووە ئیتر ناوی ئیمپریالیزم لەلایان دەرباز نەبێت, یاخود نەبیسترێت. سەبارەت بەئیمپریالیزم چەمکێکی زۆر ناتەواو و سەقەتیان هەیە, ئیتر ئێستاکە بووە بەچەمکی گوایە " ئیمپریالیزم نییە".

ئیمپریالیزم هەیە, تەنانەت بەشێوەیەکی هێندە زراڤ هەیە, کە بەسەر دەروندا زاڵ دەبێت یاخود خۆی دەگەیەنێتە نێو دڵ و هزری مرۆڤ. پێ دەچێ لەقۆناخی چەوسانەوە و فشاری رەهای سەبازی و سیاسی و ئابووریدا نەبێت, بەلام پێشکەوتنێکی ئیمپریالیستانەی بەوجۆرە هەیە, کە لەئاستێکی بەرزتری ئەمانەدایە مرۆڤ بەرەو بێ کولتووری و دابڕان لەهەست و بەرزکردنەوەی غەریزەکانی و بەرەو بەئاژەڵ بوونی دەبات.

پێویست دەکات لەم لایەنەوە گۆڕانکاری لەئیمپریالیزمدا ببینین. هێرشێکی مەزن دەکاتە سەر سروشتی مرۆڤ, ژینگەی مرۆڤ, رۆحی مرۆڤ و بەتایبەتیش دەکرێتە سەر مێژووی مرۆڤ, لەڕێگەی تێکدانی سروشت, کە لەم ساڵانەی دوایی بەپیسکردنی ژینگە ناوزەد دەکرێ,

رەوشێکی وەهای خوڵقاندووە, کە ئیدی سروشت زەمینە و توانستی ژیانی تێدا نەمێنێت, ئەمەش دەرئەنجامێکی هێرشە دڕندانە و بێ بەزەییانەکەی ئیمپریالیزمە.

هەروەها هێرشێك لەسەر مێژوو و بەها مێژووییەکان هەیە. ئەمریکا لەمیانی شێوازی ژیانی ئیمپریالیستی دەیەوێ بڵێت " نەبوونی مێژووە " یاخود " کۆتایی بەمێژوو هات " بەمجۆرەش دەیانەوێ تەواوی بەها ئەخلاقییەکان, بەها مێژووییەکان کە هەموو شتێکی مرۆڤایەتییە لەبیر بچێتەوە. ئەوەی کۆتایی پێهاتووە مێژووە؟ ئەوەی کۆتایی پێهاتووە و لەناوچووە و بێ مێژوو ماوەتەوە ئیمپریالیزمە؟ یاخود مرۆڤایەتییە؟

پێویستە ئەمە زۆر بەباشی ببینرێت. رۆح و ویژدان رەش دەکا. ئیمپریالیزم تەنیا لەسەر بنەمای قازانج ئاوا ناکرێت.بەشێوەیەکی رەهاش چەوسانەوە هەیە, بەڵام ئەو رۆحەی مرۆڤ کە تائێستا نەدۆزرابووە, دەدۆزرێتەوە و دەخرێتە بازارەوە و هەڕاجکردنی ژن بەشێوازێکی سەرسوڕهێنەر و هەڕاجکردنی هەستەکانی مرۆڤ جێگای باسە. لەسەردەمی ئەم ئیمپریالیزمەدا, لەمیانی شێوازی ئەو مۆسیقایەی کە خوڵقاندوویەتی هەستەکان هەڕاج دەکات و لەژێرناوی شێوازەکانی نوێی ژیان بەشێوەیەکی گەلێك بەربڵاو لەئاستێکی بەرزدا بازرگانی "غەریزی " دەکرێت.

دیسان لەسەردەمی ئەم ئیمپریالیزمە بەشێوەیەکی هەرە زێدە لەژێر ناوی جیهانگیریدا راستینەی نەتەوایەتی و کولتووری و رۆحی گەلان لەنێو دەبەن و شەڕێکیان لەدژیان بەرپاکردووە و, لەلایەکی دیکەشەوە بەشێوەیەکی بێ سنوور, دەرفەتی بۆ چەند بەرژەوەندیخواز و پاوانخوازی نێودەوڵەتی رەخساندووە. بەئەندازەی دەرفەتی ژیانی پێدان هێرشەکان پێشکەوتن.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە پاشکەوتنێك یاخود لەنێوچوونی ئیمپریالیزم لەئارادا نییە, تەواو بەپێچەوانەوە پێشکەوتنێك هەیە. لەجیاتی داتاشینی ئیمپریالیزم, قووڵبوونەوەی ئیمپریالیزم لەئارادایە, ئیمپریالیزم زیاتر چۆتە نێو دەروون و, فراوانکردنی گۆڕەپان جێگای باسە.

هەڵبەتە هەروەکو چۆن لەهەموو پێشکەوتنێکدا نیشانەکانی هەڵوەشانەوە رەچاو دەکرێ, ئەوا لەم لایەنەوە مرۆڤ دەتوانێ بیر لەکۆتایی و لەناوچوونی ئیمپریالیزمیش بکاتەوە. هەربۆیە لەجیاتی بەئیمپریالیزم بوون, بێکاریگەربوونی ئیمپریالیزم دەست پێدەکات. ناشێ پێشکەوتنی ئەم مەیلە نەبینین, چونکە ئیمپریالیزم کەوتۆتە نێو قۆناخی لاواز بوون, بەتایبەتیش سەربەخۆیی بەرچاوی وڵاتان و ئاراستەکردنی گەلان بەرەو ژیانێکی یەکگرتووتر لەگەڵ رابردوو بەراورد ناکرێت, ئەمانە هەمووی گوزارشت لەپاشکەوتنی ئیمپریالیزم دەکەن. ئاشکرایە قۆناخەکانی شەڕی رزگاری نیشتمانی نەتەوەیی, هەروەها قۆناخەکانی چەوسانەوەی

رەنج، بەشێوەیەکی رەها هەرە زێدە رووبەڕووی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم بۆتەوە. لەم هەردوو قۆناخە مەزنەدا چەوسانەوەی ئیمپریالیزم و شێوازەکانی فشاری سیاسی تا ئاستێکی مەزن کەم کراوەتەوە و بەلاوەنراوە. بۆیە شیمانەی ئەوە دەکرێت سەدەی بیست و یەکەم ببێتە سەدەی بەلاوەنانی ئەو تێکدان و چەواشەکارییەی کە ئیمپریالیزم بەسەر هزر و رۆح و کولتووری مرۆڤیدا هێناوە. بەتایبەتیش سەرلەنوێ وەرچەرخاندنی سروشت بۆ ڕەوشێك کە دەرفەتی ژیانی تێدا هەبێت و چارەسەرکردنی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان، هەروەها رێگرتن و سنووردانان بۆ لەناوبردنی بەها مێژووییەکان و خنکاندنی رۆحی ئینسان و رێزگرتن و سنووردانان بۆ چەوساندنەوە و بەکالاّ نەکردنی ژنان و لایەنی سێکسیەکەی، هەروەها ڤەبوونی ژنان سەبارەت بەخزمەتی مرۆڤایەتی و سەرلەنوێ ئاشناکردنی مرۆڤ لەگەڵ کولتوور و مێژووەکەیدا، هەموو ئەمانە ئەو ئەرکانەن کە لەم سەدەیەدا بەسەرکەوتن دەگەن. هەروەها زۆر بەڕاشکاوی دەتوانین بڵێین کە خوڵقاندنی پێشکەوتنێکی مەزن سەبارەت بەئازادی ژنان، هەر لەئێستاوە وەکو ئامانجێکی گرنگی شۆڕشەکانی سەدەی بیست و یەکەم خۆی دەسەپێنێ. هەربۆیە قۆناخی شۆڕشەکان کۆتایی پێنایەت، بەپێچەوانەوە دەکەوێتە نێو قۆناخێکی قووڵتری شۆڕشەکان. شۆڕشەکان قۆناخی رەهای تێکۆشانی چینایەتی و نەتەوایەتییان لەدوای خۆ بەجێهێشت، ئیتر دەکەوێتە نێو قۆناخێکی قووڵ و بەرفراوانی شۆڕشە کۆمەڵایەتی و کولتووری و رۆحی و دەروونییەکان. ئەمانیش بەلایەنی کەم، هێندەی شۆڕشە سەربازی و سیاسی و ئابوورییەکان بەهادارە. ئەگەر شۆڕشێکی دەروونی و کۆمەڵایەتی و سروشتی مرۆڤ نەبێت، چۆن دەتوانرێت باس لەشۆڕشێکی راست و تۆکمە بکرێت؟

هەربۆیە بەرامبەر بەو هێرشە قووڵ و دەروونییەی ئیمپریالیزم، پێویستمان بەشۆڕشێکی وەها هەیە کە قووڵ ببێتەوە و شۆڕشێك کە رۆح و مۆراڵ و رەوشت و مێژوو و کولتووری مرۆڤایەتی لەخۆیدا بەرجەستە بکات. لەقۆناخ و سەردەمی ئێستا شۆڕشێکی بەمجۆرە جێگای باسە.

بێگومان ئیمپریالیزمیش وەکو رابردوو لەجیاتی هێزی هێرشی رەهای " سەربازی " هێرش ناکاتە سەر شۆڕشی گەلان و بونیادی کۆمەڵایەتی مرۆڤ. هەروەکو دەبینرێ بەشێوازی جیاواز ئەم هێرشەی ئەنجام دەدا. ئیمپریالیزم پشت بەتەکنۆلۆژیا و داهێنانەکانی زانست دەبەستێت، بەمجۆرەش رەوشێکی سایکۆلۆژی سەرسوڕهێنەر بەسەر دونیادا دەسەپێنێ. شێوازی زانستی و تەکنەلۆژی لەجیهاندا پێشدەخا، لەسەربنەمای پێشخستنی تەکنۆلۆژیاش بەدیلگرتنی مرۆڤ بەبناخە دەگرێت، ئیتر ئەتۆم بەکارناهێنێت، چونکە ئەگەر بەکارییبێنێت ئەم دونیایە دەکەوێتە نێو رەوشێك خۆشی توانستی ژیانی تێدا بەدیناکات.

هەروەها هێندە پێویست ناکات خاك داگیر بکات, چونکە لەلایەك شوێنێك نەماوە داگیری بکات, لەلایەکی دیکەشەوە پێویستی بەشتێکی بەمجۆرە نەماوە. هەربۆیە ئیمپریالیزم ناچارە داگیرکارییەکی جیاوازتر پێشبخات و چەکێکی دیکەی تەکنۆلۆژیا بەکاربێنێت, هەربۆیەش ئامانجەکان دیارن.بەڵێ شەڕی سایکۆلۆژی بەشێوەیەکی زۆر قووڵ پەیڕەو دەکات و لەداهاتووشدا درێژەی پێدەدرێت.

لێرەدا زیاتر گواستنەوەی شەڕ بۆ مێشك و رۆح جێگای باسە. گرێدانێکی نوێی مێشك و رۆح پێشخراوە و هەوڵدەدەن زیاتریش بەرەو پێشەوەی ببەن. هەربۆیە شۆڕشی مێشك و رۆح و پێشخستنی شێوازەکانیان جێگای باسە. شۆڕشێك کەپارێزگاری لەبەها بنچینەییەکانی مرۆڤایەتی بکات و نەهێڵێ رۆح و دەروون بفرۆشێت و توانستی هزری سەربەخۆ بپارێزێت. دەشێ ئەم شۆڕشە بەشۆڕشی موحافەزەکاریش ناوزەد بکەین, چونکە کاتێك خواستیان مرۆڤایەتی لەناوببەن, دەبێ تۆ پارێزگاری لێ بکەیت. ئەگەر سروشت تێکدرا و پیس کرا, ئەوا تۆ لەمیانی تەکنۆلۆژیای گونجاو رووبەڕووی دەبیتەوە و پێشی لێدەگریت. هەروەها دژی پاکتاوکردنی گروپە کۆمەڵایەتییەکان و چەواشەکردنی زمان و کولتوورەکانیان دەوەستیت. چونکە خزاندن و راکێشانی مرۆڤ بۆ ناو ناجێگێری و کاردانەوەیەکی سەرسوڕهێنەر, لەڕاستیدا شێوەیەکی نوێی نەخۆشییە. تەنانەت دایکی هەموو نەخۆشیەکانە. لەئەنجام چەواشەی سێکسی (زایندی) نەخۆشی وەکو ئایدز(AIDS) پێشدەکەوێت و بڵاو دەبێتەوە. بەرامبەر تەواوی ئەمانە دەبێ تایبەتمەندێتی رزگارکردنی مرۆڤایەتی هەبێت. تۆقاندن و ناجێگیری دیاردەیەکی ئیمپریالیزمە. ئەم نەخۆشییە نوێیانە دەرهاویشتە و دیاردەکانی ئیمپریالیزمن. تێکۆشان دژی ئەمانە, تێکۆشانێکی دژە ئیمپریالیزمە. دەبێ شێواز و روخساری ئەمە بدۆزینەوە., هەربۆیە ئایدز بەنەخۆشی و بەڵای سەردەم ناوزەد دەکرێت, ئەمەش سەرچاوەی خۆی لەچەواشە و شێواندن و لادانی سێکسی وەردەگرێت. دەتوانین لەمیانی چەمکێکی راستی سێکسی رێگا لەمە بگرین, تەنانەت زانایانی سەر بەئیمپریالیزمیش ئەمە دووپات دەکەنەوە.

لێرەدا تاکە بژار و چارەسەری راستی ئەو دیاردەیە شۆڕشە. گەلێك نەخۆشی جۆربەجۆر بەگوێرەی سروشتی پێشکەوتنی ئیمپریالیستی لەئارادان. ئەو بویەرەی بە سترێس (STRES)ناوزەد دەکرێ نەخۆشیەکی زۆر سەختە دەشێ ئەمە لەمیانی رێکخستن و ستاتۆکایەکی نوێی کۆمەڵایەتی, واتە لەڕێی شۆڕشەوە بەلاوە بنرێت. بۆیە تەکنۆلۆژیای نوێ لەم پێناوەدا دەدۆزینەوە.

قۆناخێکی نوێی تیۆری بۆ سۆسیالیزم دەستپێدەکات

ئیتر ناتوانین لەمیانەی هەڵسەنگاندنەکانی سەدەی نۆزدەهەم تیۆری سۆسیالیزمی بەهێز بکەین و بەرەو پێشەوەی ببەین. بەواتایەکی دیکە دەتوانرێ بگوترێ بەئەزبەرکردنی هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەکانی سۆسیالیزمی سەدەی نۆزدەهەم و هەڵسەنگاندنەکانی سەدەی بیستەم سەردەمی شۆڕشەکانی رزگاری نەتەوەیی, ناتوانرێ تیۆری سۆسیالیستی دەوڵەمەند بکرێت. بێگومان ناشێ بڵێین لەرێگای ئەزبەرکردنی ئەمانە دەبین بە سۆسیالیستێکی باش. تەنیا ناتوانین بەهۆی دەست نیشانکردنی کێشەکانی سەدەی بیستەم یاخود ئەو قۆناخەی تێیدا دەژین.سۆسیالیزم زەنگین بکەین و بەتەواوی ببینین, بەڵکو شانبەشانی ئەمەش پێویستی بەتیۆرییەك هەیە, کە بەرەنگاری ئەم کێشە و گرفتانە بێتەوە و شێوازی بەمجۆرە پێشبخات, کە چارەسەری لەگەڵ خۆیدا بێنێت. بێگومان لەمیانی تیۆرییەکی بەمجۆرە دەشێ سۆسیالیزم دەوڵەمەند بکرێت.

بەڵێ ئەم سەردەمە پێویستی بەتیۆری نوێ هەیە, بەلام لەهەمانکاتدا نابێ بەتەواوەتی نکوڵی لەتیۆری کۆن و رابردوو بکەین. پێویست دەکات چەمکی پارتە کۆن و نوێکان, لەسەربنەمای نکوڵی نەکردن لەچەمکە کۆنەکانی تێکۆشان ( شەڕ ) بێت, هەروەهادەبێ وابیر بکەینەوە کە چەمکی پارتایەتی و دەوڵەمەندکردنی تەکتیکەکانی تێکۆشانی بەگوێرەی قۆناخ وەکو بەهێزکردن و دەوڵەمەندییەك بێت. پێویستە لەپێناو دەوڵەمەندکردنی تەکتیکی (تێکۆشانی) سۆسیالیزمی باس لەپێشخستنی تەکتیکی نوێ بکرێت.

تەواوی ئەمانە ئەوە نیشان دەدەن کە سۆسیالیزم لەمیانی تێکۆشان لەپێناو تیۆری و پراکتیکی نوێ, نەك هەر سەردەمی سۆسیالیزم کۆتایی پێنەهاتووە و شکستی نەهێناوە, بەڵکو مسۆگەر تیۆری نوێ پێشدەخات و لەمەش گرنگتر بەپراکتیزەکردنی شێواز و پراکتیکی نوێ زۆر خوڵقێنەرە و نوێ کەرەوەیە. هەر لەم چوارچێوەیەشدا بەئەندازەی تێکۆشان بەرامبەر بەئیمپریالیزم و نوێنەرە سەرەکییەکەی, نوێنەرایەتی سۆسیالیزم دەکەوێتە نێو قۆناخێکی نوێ.

هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراوی سۆڤیەت بەواتای کۆتایی هاتنی هەموو شتێك نایەت. لەوێدا دەسکەوتەکانی سۆسیالیزم بەشێوازی جیاجیا رێگا لەپێش خۆی دەکاتەوە. هەروەها دیسان لەگەلێك ولاتی بچووك ـ مەزنی جیهان دەشێ لەم قۆناخەدا دەسکەوتە کۆمەلایەتی و نەتەوەییەکانی گەلان بخوڵقێنێت, ئەمەش ئەو راستییە دیاری دەکات کە گوزارشتی زانستیانەی گەوهەرە خوڵقێنەرەکەی سۆسیالیزم دەبێتە پێویستییەك و خۆی لەخۆیدا ئەوە سۆسیالیزمە, لەئەزموونی خۆشماندا بەشێوەیەکی زۆر زەق دەردەکەوێ کە دەشێ ئەنجام بدرێت.

بێگومان بەمجۆرە دەتوانین هەر وڵاتێك كە مەبەستمانە هەڵیسەنگێنین و ئەمە زەحمەت نییە.

كاتێك ئەمریكا بەمجۆرە رۆڵی سەركێشی ئەم ئیمپراتۆریەتە دەبینێ, ئەڵمانیاش دەستەوەستان ناوەستێ. ئەو بەردەوام هەروەكو سەدەی نۆزدەهەم لەسەدەی بیستەمیش مەیلی بۆ بەئیمپریالیزم بوونی هەبووە و دوو شەڕی جیهانی مەزن و چەند شەڕێكی بچووك ـ مەزنی كردە بەلا بەسەر جیهانەوە. ئەمەش لەگەڵ خۆی گەلێك پێشكەوتنی فاشیستانە و سڕینەوەی گەلان و بەلای مەزنی هێناوە. تەنیا مەسەلەی قڕكردنی یەهودییەكان لەئارادا نییە, ئایا دەشێ پشتگیری ئەڵمانیا بۆ " أتحاد و ترقی " نەبینرێ كە بەهۆیەوە قڕكردنی ئەرمەنییەكانی ئەنجامدا. ئەمەش بخەینە لایەكەوە, ئایا دەشێ پشتگیری و هاوكاری ئەڵمانیا بۆ ئەو قڕكردنە نەبینرێ كە لەكوردستاندا بەڕێوە دەچێت؟ لەڕاستیدا بینینی رۆڵ و بەشی ئیمپریالیزمی ئەڵمانی لەقڕكردنەكانی ناوخۆ و دەرەوەدا و دەستنیشانكردنی لەجێگای خۆیدا گرنگییەكی مەزن لەخۆوە دەگرێت.

ژاپۆن خۆی كۆكردەوە و تازە بەدونیادا بڵاو دەبێتەوە. كاتێك بڵاو دەبێتەوە و بۆ ئەوەی ئەم سیستەمە فاشیستە بەخێو بكات و لەپاش ئەمریكا و ئەڵمانیا نەمێنێت چۆن هەوڵ دەدات؟ كاتێك باس لەچۆنێتی گرێدانی ئابووری دەكات, دەبێ ئەوە ببینرێت كە چۆن هەوڵدەدات خۆی بگەیەنێتە خۆرهەڵاتی ناوین. درەنگ دێتەوە هۆش خۆی, بەڵام زۆر بەخراپی ئەنجامگیری دەكات.

هەڵسەنگاندنێكی راست بۆ ئەو تێكچوونەی روسیا گرنگییەكی مەزن لەخۆوە دەگرێت. روسیا وڵاتێكی ئیمپریالیستییە؟ ئایا ئەوەی دوای رووخانی سۆسیالیزمی بونیادنراو لەڕوسیا پێشدەكەوێت ئیمپریالیزمە, یاخود پێشكەوتنێكی نوێی سۆسیالیستی یە؟ پێویست دەكات زۆر بەباشی كارەكتەری ناكۆكی سیاسەتی روسی هەڵبسەنگێنرێت. هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو واتای كۆتایی هاتنی تەواوەتی نییە, هەربۆیە لەلایەكەوە هەبوونی هێزە سۆسیالیستەكان بەرەو پێش دەچن, لەلایەكەی تریشەوە كێشمەكێشی ئەو هێزە نەتەوە پەرست و ئەو هێزانەی تامەزرۆی سەرمایەدارین جێگای باسە. ئەمانە لەمیانی ئەو ناكۆكیانەی تێیدا دەژین, بەتایبەتی پەیوەندییان لەگەڵ دەوڵەتە ئیمپریالیستیەكان پێش دەخەن. هەروەها پێویستە زۆر بەباشی لێكۆڵینەوە لەسەر رەنگدانەوەی ئەمە بەسەر بەلكان و قەفقاسیا و خۆرهەڵاتی ناویندا بكرێت. دەبێ زۆر بەباشی ئەوە مەزەندە بكرێت كە شۆڕشی كوردستان لەناو هەلومەرجی ئەم كێشمەكێشەی ئیمپریالیزمدا چۆن دەتوانێ سوودمەند بێت و رێگایەكی بوژانەوە بدۆزێتەوە. لەم چوارچێوەیەشدا رووخانی سۆسیالیزمی بونیادنراو, ناكۆكی نێوان وڵاتە ئیمپریالیستیەكان خێراتر و بەرەو پێشەوە بردووە. بۆیە مسۆگەر پێویست دەكات ئەم رەوشەی كە نزیك لەهەڵوەشانەوەیە, باش هەڵسەنگێنرێت. لێرەدا لەنێو

ئەو بیّ سیستەمیەی ئەمریکا کە بەناوی " سیستەمی نویّ " ناوزەد دەکریّ و لەنیّو ئەم رەوشە ئالۆزەدا، گرتنەبەری راستەرِیّی شۆرِش زیاتر رەخساوە.

هەروەها لەناوچەکەمان و ولاّتانی خۆرهەلاّتی ناوین گەلیّك پیّشکەوتن لەئارادایە. ئیتر ئەوە دەبینریّ کە ناکۆکی و دوژمنایەتی عەرەب ـ ئیسرائیل کە وەکو ناکۆکی هەتا هەتایی دەبینرا، لەسەربنەمای ریّککەوتن بەرەو چارەسەری بچیّت. پیّویست دەکات ئاماژە بەوەش بکریّت کە ئەمە قۆناخیّکی ئاشتی و ریّککەوتن لەگەلّ خۆیدا ناهیّنیّ. نەوەی ئیسرائیل یاخود زایۆنیزم تەنیا بەئیسرائیلیّکی بەمجۆرە سنووردار نامیّنیّ. چونکە زایۆنیزم هیّزیّکی بەکاریگەر و ئاراستەکاری جیهانە و تەنیا بەفەلەستین و ولاّتە عەرەبیەکان سنووردار نابیّت، بەلّکو دەیەویّ گۆرِەپانی خۆی بەرفراوان بکات. بیّگومان زۆر بەباشی دەزانین تاچ رادەیەك کاریگەری بەسەر دەولّەتی تورکیا و فورسایيەکی بەسەر کارگیّرِانی دەولّەتی تورکیاوە هەیە. باش دەزانین کە دەیەویّت ئەم کاریگەریەی خۆی لەسەر تەواوی کۆمارە تورکییەکان بلاّو بکاتەوە، تەنانەت ئەم کاریگەرییەشی کردووە. هەروەکو دەزانریّ گەلیّك کارگیّرِیّتی دەولّەتە عەرەبیەکانیش پشتی پیّ دەبەستن. ئەمەش ئەو راستییە دەردەخات کە ئەم ناکۆکییە بەجاریّك کۆتایی پیّ نایەت و چارەسەر نابیّت، بەلّکو بەشیّوەیەکی قوولّتر بەردەوام دەبیّت. بەلاّم لەلایەکی دیکە ئەمەش دەرکەوتۆتەروو کە ریّککەوتنیّك پیّویست دەکات، چونکە لەهاوسەنگی ئیّستای هیّزەکاندا ئاشکرا بووە کە کارگیّرِیّتی عەرەب و ئیسرائیل و شیّوازی تیّکۆشان و رووبەرِووبونەوەیان ریّککەتن وەك ناچارییەك دەسەپیّنیّ، ئیدی ئەو شیّواز و رووبەرِوو بوونەوەیەی رابردوو بیّ مانا بووە. نەك وەکو عەرەبەکان دەلّیّن؛ دەتوانن کۆتایی بەئیسرائیل بیّنن و بیسرِنەوە، نەئیسرائیلیش دەتوانیّ چۆك بەهەموو ولاّتانی عەرەبی دابدات. هەربۆیە باسکردن لەسەرکەوتنیّکی تەواو و یەکجارەکی بۆ هەردوو لایەنیش ناشیّ و لەجیّگای خۆیدا نییە. ئەمەش زەمینەی بۆ قۆناخی تەبایی و ریّککەوتن دەرِەخسیّنیّت. ئەنجام دیدارەکانی ئاشتییە. نە ئەو مەرجانەی ئیسرائیل و نە ئەو مەرجانەی عەرەبەکان دەیسەپیّنن هیچیان بەدینایەت. لەرِیّگایەکی ناویندا دەگەنە یەکدی. لەم پیّناوەشدا دیداری دوو لایەنە و چەند لایەنی ئەنجام دەدەن. پیّویستە ئاماژە بەوەش بکریّت کە بەئەندازەی ئەوەی پەنا نابەنە بەر شەرِیّك لەسەربنەمای سرِینەوە و لەناوبردن، لەهەمان کاتدا ئاشتییەکی یەکجارەکی هەمیشەییش جیّگیر نابیّت و بەدینایەت.

ئەمە چارەسەریەکی کاتی قۆناخیّکی ناجیّگیرە و، هەرکاتیّك شیمانەی خراپ بوون و تیّکچوونی ئەم رەوشە هەیە. واتە ریّککەوتن بەدیدیّنیّت، بەلاّم گەلیّك کارەکتەر و تۆوی ناکۆکی و کیّشمەکیّش لەخۆوە دەگریّت. رۆژ بەرِۆژیش دەبینین کە چۆن پراکتیزە دەکریّت و چۆن تیّکدەچیّت.

بەشیّوەیەکی راستەوخۆ پیّویستە رەوشی ئیّرانیش بخریّتە سەر ئەمە. ئیّرانیش بەردەوام لەگەلّ ئەو هیّزانەی لەدورگەی عەرەب، قەفقاسیا، ئەنادۆلّ و ئاسیای ناوین هاتوون خۆی

لەنێو شەڕ و پێکدادان بینیوەتەوە. شەڕ و پێکدادانی ئێراق ـ ئێران وەکو بەردەوامی ئەم ڕەوشە مێژووییەیە. هەروەها کێشمەکێش لەگەڵ تورکیاش لەسەربنەمایەکی مێژووییە. لێرەدا مەسەلەی دەرکەوتنی گوزارشتی مەزهەبی ناکۆکییەکی هێندە گرنگ نییە. بەڵکو شەڕێکی سیاسی یە و بەتەواوەتی گرێدانی خۆی بەناکۆکییەکانی نێوانیانەوە هەیە. هەربۆیە بەسانایی لەگەڵ تورکیا ڕێکناکەوێت, بەتایبەتیش دۆستایەتییەکی جێگەی باوەڕ بونیاد نانێت. هەروەها لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا لەگەڵ ڕژێمی ئێراق بەتایبەتی و لەگەڵ وڵاتانی عەرەبدا بەگشتی ناگاتە دۆستایەتییەکی هەمیشەیی و بەردەوام و ناکۆکی مەزن لەنێوانیاندا هەیە. هەربۆیە یەکێکە لەو هێزانەی ناوچەکەمان کە لەنێو ناکۆکیدایە. هەروەکو چۆن ئێستا, بەتایبەتیش لەسەردەمی دەسەڵاتی شا بەمجۆرە بوو, شیمانەی ئەوە دەکرێ سبەی ئەم ڕەوشەی گرانتر و ئاڵۆزتر بێت. بەڵام بەهۆی کێشە هەمەلایەنەکانی شەڕ, قووڵ ناکاتەوە و زیاتر بەرەو پێشەوەی نابات. هەڵبەتە هێندە تەباییش بەخۆیەوە نابینێ, پێویستە ئەمەش ببینرێ.

# تێکۆشانێکی نە پساوە و بەردەوام لەبەرامبەر سەرمایەداری پێویستە

پێشکەوتنی مرۆڤ لەنزیکەوە پەیوەندی بەهێزی مەزندە و خەیاڵیەوە هەیە. ئەگەر بێتو کاریگەری پێشکەوتنی خەیاڵی مرۆڤ، یاخود بەواتایەکی دیکە کاریگەری هزر و ئیرادەی مرۆڤ بەسەر رەوشی رۆحی و دەروونی مرۆڤەوە نەبێت، ئەوا پرۆسەی کرداری ژیانیش پەرە ناسێنێت. بێگومان کاتێك مرۆڤ دەبێتە جێگای باس ئەوا لەسەرووی هەموو شتێکەوە پێویستی بەخەیاڵ و پێشکەوتنی هزری بەمجۆرە هەیە. ئاژەڵ بۆچی ئاژەڵە؟ بێگومان کەم یان زۆر مەیلێك لەوانیشدا هەیە کە بەرێوەیان دەبات، ئەگەرنا ئاژەڵیش وەکو بەرد لەجێگەی خۆی نەدەجووڵایەوە. بەڵام مرۆڤ هەر لەسەرەتاوە هەنگاوی بۆ قۆناخی بەکۆمەڵایەتیبوون نا، بێگومان ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەنگینی لایەنی بیرکردنەوەی.

بۆیە ئاماژە بەمانە دەکەم چونکە ئاستی پەیڕەوکردنی کرداریتان لەهزر دابڕاوە، ئەمەش زۆر ترسناکە و مەترسییەکی وەها لەخۆوە دەگرێت کە مرۆڤ بگەیەنێتە ئاستی بوونەوەرە سەرەتاییەکان. مرۆڤ دەتوانێ تەنیا لەرێگەی هزرەوە وەڵامی کێشە سەختەکانی سروشت بداتەوە و درێژە بەهەبوونی خۆی بدات. هەروەها دیسان لەرێگەی هێزی هزر و بیرکردنەوە دەتوانێ کێشە کۆمەڵایەتییەکانی ناوخۆی کۆمەڵگا چارەسەر بکات. بەکورتی دەتوانین بڵێین ئەگەر بێتو بیرکردنەوە و خەیاڵ و مەزەندەکردن نەبێت، ژیانیش نابێت.

بەشێوەیەکی بەرجەستە و ئاشکراتر دەڵێین: ژیانێکی شۆڕشگێڕیمان هەیە، بەڵام بیرکردنەوە و هزرتان جیاوازە و لێی دابڕاوە. ئیتر بیرکردنەوەتان لەبیرچۆتەوە، یاخود لەژیانتان دابڕاوە و جیاوازە. تاکو ئێستا وەڵامی شیاوتان بۆ پرسی: تا چ رادەیەك و چ جۆرە بیرکردنەوەیەك بۆ کردار و چالاکی شۆڕشگێڕی پێویستە؟ نەداوەتەوە. بەو ئامانجە باس لەو خاڵە دەکەم تاوەکو سەبارەت بەخۆ خەڵەتاندن و مەترسی ئەم مەسەلەیە ئاگادارتان بکەمەوە.

لەم رووەوە دەردەکەوێ کە بۆ هەبوونی کۆمەڵایەتی پێش هەموو شتێك بیرکردنەوە و هزر مەرجە. لێرەدا ناتوانین بەشێوەیەکی بەرفراوان مێژووی پێشکەوتنی هزر روون بکەینەوە و تاوتوێی بکەین، بابەتی سەرەکیمان لێکۆڵینەوە و لێتوێژینەوەی مێژووی پێشکەوتنی هزری مرۆڤایەتی نییە، چونکە ئەمە بابەتێکی ئەکادیمییە و پێویست ناکات هێندە لەسەری رابوەستین. ئەوەی بخوازێ دەتوانێ لێکۆڵینەوە و لێتوژینەوە سەبارەت بەمێژوویەکی بەمجۆرە بکات. بێگومان مێژووی هزر وەکو وانەیەکی سەرەکی لەزانکۆ ئەکادیمیەکاندا دەخوێنرێت.

هەندێ قۆناخی سەرەکی مێژووی هزر هەیە، بەکورتی دەتوانین ئاماژەی پێبکەین. لەسەرەتادا مرۆڤ ئاستێکی هزری زۆر پاشکەوتووی هەبوو، تەنانەت دەتوانرێ بەشێوازێکی تەلیسم و هزری سەرەتایی ناوزەد بکرێت، ئەویش زیاتر لەشێوەی سیحر و تەلیسم لەگەڵ دەرکەوتنی ئایینەکاندا هاتە ئاراوە. لەڕاستیدا سیحر و تەلیسم وتەنانەت لێشاوە ئاینییەکانیش شێوازی سەرەتایی بیرکردنەوەن. ئایینیش هزرێکە، بەڵام ئەگەر تاوەکو ئێستا

درێژەی بەبوونی خۆی داوە و درێژەشی پێدەدات، هۆکارەکەی ئەمەیە: ئەمانە پەیوەندییان بەهەبوونی مرۆڤەوە هەیە.

ئایا دەشێ مرۆڤ بەتەواوی و بەشێوەیەکی هەمەلایەنە مرۆڤێکی زانستی بێت و تەواوی جموجۆڵ و چالاکییەکانی لەسەربنەمایەکی زانستی بەڕێوەببات؟ بێگومان لەهەمانکاتدا ئەمانە کێشەی فەلسەفین. سەبارەت بەم مەسەلەیە بانگەشەیەك لەئارادایە و ئاستی زانستی پێشدەکەوێ. بەڵام لەهەمانکاتدا وا پێدەچێ کە خەیاڵ و دۆگما و ئایینیش کۆتاییان پێنایەت. ئەمەش لەسروشتی مرۆڤدا شاراوەیە. مرۆڤ هێندەی سروشتی خۆی مسۆگەر پێویستی بە خەیاڵ و دۆگما و بەها پیرۆزەکان هەیە، کە بەئایین گوزارشتی لێدەکرێت و تەنانەت ناچارە جێگە بەڕەوشت و مۆراڵ بدات. بەتایبەتیش بەبێ ئەوەی مەسەلەی مۆراڵ بەدیببێت پێشکەوتنێکی راستەقینەی مرۆڤ بەدینایەت و تەنانەت ژیانیشی دووچاری گەلێك کێشە و گیروگرفت دەبێت. ئەو بنبەستبوونەی لەئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزمیشدا دەرکەوتووە سەرچاوەی خۆی لەمەسەلەی مۆراڵەوە دەگرێت.

یەکێك لەهۆکارە سەرەکییەکانی هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو تاوتوێ نەکردن و هەڵوەستە نەکردنێکی راست و دروستە سەبارەت بەکێشەی ورە (مۆراڵ). واتە هەرچەندە زانست و بیرکردنەوەی زانستی پێویست بێت، ئەوا نابێ هەروەکو ماتریالیزمی رەها بگوترێ " هەموو شتێك بەگوێرەی ریزبەندی و لیستی تایبەت بەخۆی پێشدەکەوێ" چونکە ئەمە مانای نەناسینی مرۆڤ و دانپێدانەنانیەتی. سۆسیالیزمی بونیادنراو تاڕادەیەك ماتریالیزمی رەهای پەیرەوکرد، بۆیە ئەو دەرئەنجامەی هاتە ئاراوە هەڵوەشانەوەیەکی ئێجگار خراپ بوو. بێگومان گەلێك پەند و ئەزموون هەن پێویستە مرۆڤ سوودی لێوەربگرێت.

بۆچی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەمجۆرەیە؟ تاڕادەیەك دیالێکتیك ئەم مەسەلەیە روون دەکاتەوە. دیالێکتیك یاسای بنچینەیی هەیە. ئەگەر بێت و ئەمانە لەمیانی ماتریالیزمی رەهاوە چەواشە نەکرێن، هەروەها ئەگەر بتوانین ئەو رەوشەی کە ئەمرۆ سۆسیالیزم تێیدایە تێپەڕ بکەین، ئەوا هێزی خۆ ناسین و تێگەیشتنمان زیاتر دەبێت. ئەگەر بێت و تەنیا زانست بەبنەما بگیرێت، ئەوا بەلایەنی کەمەوە بەئەندازەی دۆگما ئایینییەکان مەترسی و هەڕەشەی دەبێت. چونکە زانستی بوونێکی رووت، کە ماتریالیزمی رەهای پێ دەگوترێت، لەگەڵ چۆنیەتی خولقاندنی مرۆڤ ناشێ و ناگونجێ.

لێرەدا نامانەوێ بچینە نێو باسەکانی فەلسەفەوە. واتە مادده لەسەرەتاوە هاتووە یاخود رۆح؟ یاخود مادده هزر و بیرکردنەوە دەستنیشان دەکات یان بەپێچەوانەوە؟ لێرەدا لێکۆڵینەوە سەبارەت بەپرسی فەلسەفی بەمجۆرە ناکەین. هەرچەندە زانست زۆر پێشکەوتووە بەڵام تاوەکو ئێستا چارەسەرییەکی تەواوی بۆ ئەم مەسەلانە نەدۆزیوەتەوە. ئەو

پێشکەوتنانەی لەبوارەکانی فیزیا و بیۆلۆژیا و تەنانەت زانستی سایکۆلۆژیشەوە بەدیهاتوون ئەوە نیشان دەدەن کە وەڵامدانەوەی ئەم پرسانە و چارەسەرکردنیان هێندە سانایی نییە.

تەنانەت گفتوگۆ و مشتومڕ سەبارەت بەوە دەکرێت, ئایا گەردیلەکانی مادده بوونەوەری خاوەن هەست و نەستن یاخود نا؟ ئەمەش تێدەپەڕێنێت و دەگوترێت گۆڕینی مادده بۆ وزە و, تێکەڵاوی رۆح, مادده دەسڕێتەوە. کامەیان لەپێش ئەوەیتر دێت؟ ئەگەر بەقووڵاییەکی زیاتر مەسەلەکە بگرینە دەست, دەبینین کە لەڕاستیدا لەفیزیا بەولاوە بەمیتافیزیك ناو دەبرێت و, لەڕۆح بەولاوەش بەخودا ناوزەد دەکرێت, مەسەلە و رووداوێکی وەهان کە مێشکی مرۆڤ لێی تێناگات و سەری لێدەرناچێت. واتە سنووربەندییەك لەمرۆڤدا هەیە. دەتوانرێ بگوترێ کە هەرچەندە مرۆڤ خۆی لەجێگەی خوداوەند دابنێت, نابێتە خوداوەند, هەروەها ناشتوانێ دەستبەرداری یاساکانی دیالێکتیك بێت و ناچارە بەگوێرەی ئەم یاسایانە بەڕێوە بچێت. کاریگەری مادده لەسەر پێشکەوتنی هزر گرنگە و ئەمەش دواڕۆژی ژیان دەستنیشان دەکات. بەڵام هەروەك چۆن بەماددی بوونێکی رووت و رەها لەجێگەی خۆیدا نییە, بەهەمان شێوە بەبنەماگرتنی رۆحیش لەڕادەبەدەر رەوشێك دەخوڵقێنێ کە توانای خۆ رزگارکردن لێی زەحمەتە.

سەرەکیترین کێشەی ئەم رۆژگارەمان ئەمەیە. کاتێك تەماشا دەکرا دەبینرا کە ئەمە کێشەی یەکەمین قۆناخی دەرکەوتنی مرۆڤە, بەڵام کێشەی مرۆڤی ئەم سەردەمەشە. لەمرۆڤی سەرەتاییدا زاراوە و هێز و هزری هەرەمەکی و پەرستن هەیە. ئەمە تاڕادەیەك چارەسەرکرا, بەڵام لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا مەترسی هاوشێوەی رابردوو هەیە و لەم پێناوەدا بەدوای چارەسەری زانستی دا دەگەڕێن. ئەم مەترسییانە جیاوازییەکی زۆر کەم لەنێوانیاندا هەیە, هەرچەندە ئەم کێشانەی ئێستای مرۆڤایەتی لەو کێشانەی دەیان هەزار ساڵ بەرلەئێستا زۆر گرانتر ببن, وەلێ لەڕاستیدا ئێستا دەتوانرێت سەبارەت بەمرۆڤ تاوتوێکردنێکی زیاتر ئەنجامبدرێت؛ تەنانەت دەتوانین لایەنی هزری مرۆڤ لەگەڵ ماددەدا بەیەکەوە بگرینەدەست, بەڵام ئەمەیان بابەتەکەمان تێپەڕ دەکات. ئێستا ناچارنین و هێندەش بۆ بابەتەکەمان پێویست ناکات, بکەوینە نێو مەسەلە فەلسەفییەکان. بێگومان لەهەمانکاتدا ئەگەر بەفەلسەفەشەوە گرێی نەدەین, نابێت.

### "ئایدیۆلۆژیا و ورە بۆ یەکەمین مرۆڤ و دواترین مرۆڤیش پێویستە"

باهیچ کەسێك وەها تێنەگات کە PKK جووڵانەوەیەکە بناخەی ئایدیۆلۆژی بەهێزی نییە, بەڵکو بەپێچەوانەوە لەپێشکەوتووترین و بەرزترین ئاستدا خاوەنی بناخەیەکی ئایدیۆلۆژییە. هەروەکو دەبینین نەوەك سۆسیالیزمی بونیادنراوە و نەلەجۆری ئایدیۆلۆژیاکانی دیکەیە. لای ئێمە هەڵوێستێکی ئایدیۆلۆژی وەها جێگەی باسە کە بەردەوامی

بەپێشکەوتنی دینامیکی دەدات, بەڵام نابێت تەنیا باس لەپێشکەوتنی ئایدیۆلۆژی بکرێت و بەسەریدا تێپەڕین.

ئەگەر پەیوەستبوون و گرێدانتان بەئایدیۆلۆژیا ببڕن, دەبن بەئاژەڵ. هەڵبەتە لەڕەوشی هەنووکەدا یەکێك لەهۆکارە هەرە سەرەکییەکانی زاڵ نەبوون بەسەر خودی خۆتاندا ئەوەیە کە زەمینەیەکی ئایدیۆلۆژی تۆکمە و جددیتان نییە. مرۆڤ لێتان دەترسێ؛ چونکە بێ ئایدیۆلۆژین. لەڕابردوودا دەگوترا " بێ دینن یا بێ ڕەوشتن " مرۆڤی بێ دین و بێ ڕەوشت بەواتای ڕەوشێکی ناهەموار و مەترسیدار دەهات, کۆمەڵگا نەفرەتی لێ دەکرد و سزای هەرە گرانی بەسەردا دەدا. ئێستا ئایدیۆلۆژیا جێگەی تەواوی ئەم زاراوانە دەگرێتەوە. بەتایبەتیش لای ئێمە ئایدیۆلۆژی بۆتە مەرجێك و ڕەوشێك کە بێ ئەو هەڵناکرێت. من باس لەئایدیۆلۆژیای ماتریالیزمی ڕووت و ئاستەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو ناکەم, بەڵکو باس لەپێویستییەکی سەرەکی, واتە لەپێویست بوون بەئایدیۆلۆژیا دەکەم, بەتایبەتیش بۆ ئەمڕۆ. ئەمەش تەنیا لەبەرئەوە پێویست نییە کە PKKیین, بەڵکو بۆ مرۆڤی سەرەتا و کۆتاییش پێویستە. بەڵام بێگومان بەدرێژایی قۆناخە جیاجیاکان گۆڕانکاری بەسەردا دێت.

ئەگەر ئێمە ئەمڕۆ گەلێکی وەها بین کە لەلایەن هەرکەسەوە نەفرەتی لێبکرێت و, لەئاستێکدابین کە نەفرەت لەخۆشمان بکەین, ئەمە سەرچاوەی خۆی لەوەوە دەگرێت کە بێ ئایدیۆلۆژیاین, یاخود سەبارەت بەخودی واقیعی ماددی خاوەنی هزر و بەهاکانی مۆڕاڵ نین. ئەگەر بێت و گەلێك بوایە لەتوانایدا بوایە هێزی هزر و مۆراڵ لەگەڵ واقیعی ماددی خۆی گرێبدات و بیگرێتەدەست, ئەوا مسۆگەر ئەو ئاستەی ئاماژەمان پێکرد جێگەی باس نەدەبوو. تەنانەت باس لەوەش دەکرێت کە " بەدرێژایی مێژووی داگیرکەری بەشێوازی جیاجیا گەلەکەمانیان لەمۆراڵی ئایدیۆلۆژی دابڕیوە " ئەمە ڕاستە, بەڵام شتی گرنگ ئەوەیە کە ئیدی ڕەوشێکی بەمجۆرە هاتۆتە ئاراوە.

لەجیاتی ئەو گوتەیەی کە هەر کەس دەڵێ: " گەلەکەمان نەزانە, بێ هزرە " بەشێوەیەکی گشتی دەڵێین: گەلەکەمان بێ ئایدیۆلۆژیایە, بێ مۆراڵە, هەر لەبەرئەوەی لەم زاراوە سەرەکییانە دایانبڕیوە, بۆیە دابەزیوەتە ئاستی ئاژەڵبوون. هێندەی بتانەوێ دەیچەوسێننەوە, دەیکوژن و لەنێوی دەبەن, بەرامبەر بەمەش ورتەی لێوە نایەت. ئەگەر دەنگیشی بێت, کەس بایەخی پێ نادات.

بیر لەوە بکەنەوە من چۆن خۆم ئافراندووە. ئەگەر توانیبێتم ببم بەدەنگێکی مەزن ئەوا هۆی سەرەکی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەلایەنی ئایدیۆلۆژیدا خۆم پێشخستووە. ئەگەر سەرنج بدەن دەبینن من لەڕێگای چەکێکی ڕووتەوە ئەم کارەم ئەنجام نەدا, هەروەها بەپارەش ئەنجامم نەدا بەڵکو شێوازی کارکردنی من لەڕێگەی ئایدیۆلۆژیاوەیە.

بەگوێرەی واقیعی ماددی کۆمەڵگاکەمان بوونم بەهێزی هزری و ئافراندنی هزر و گەیشتنم بەئاستی هێزی کرداری، منی بۆ تەڤینەوەیکی مەزن وەرچەرخاند.

بۆچی دەتوانم هێندە بەکاریگەربم؟ چونکە ڕەوشی بێ ئایدیۆلۆژیایی و بێ مۆراڵی، کە بەشێکە لەڕاستینەی کۆمەڵگای کورد لەکەسایەتی خۆمدا چارەسەرم کرد. لەبەرئەوەی لەمیانی ئەم چارەسەرییەش ئاستی خۆ خولڤاندنم لەگەڵ هەلومەرجە ماددییەکان تا دواڕادە گونجاو بوو، هەربۆیە ئێستاکە وەك موعجیزەیەك هەڵدەسەنگێنرێم. هەڵبەتە کارەکتەری موعجیزەیی هەر قەڵەمبازێکی مێژوویی لێرەوە سەرچاوە دەگرێت.

ئەگەر ڕەوشی ماددی نیمچەدورگەی عەرەبی بەرلەئیسلامییەت بێنینە بەرچاو، یاخود ڕەوشی ماددی ئەورووپا بەرلەشۆڕشی فەرەنسا و تەنانەت ڕەوشی ماددی ڕوسیای بەرلەشۆڕشی ئۆکتۆبەر بێنینە بەرچاو، ئەو کاتە دەبینین کە لەڕاستیدا گۆشەگیرییەکی مەزن لەئایدیۆلۆژیا و بێ مۆراڵییەکی مەزن لەئارادابووە، یاخود گروپێکی تەسکی بەرژەوەندیخواز تەواوی کۆمەڵگای بەهیچ لەقەڵەمداوە، هەربۆیە دەسەڵاتێکی وەهایان هەیە کە بەمانای نەزانی و بێ مۆراڵییەکی لەڕادەبەدەر دێت. دەشێ ئەمە بەدەسەڵاتی دیکتاتۆری و ستەمیش ناوزەد بکرێت.

لەکاتێکدا هەندێکیان دوای بەرژەوەندی دەکەون، لەهەمانکاتدا ئەوانەی لەمۆراڵ و ئایدیۆلۆژیا دابڕێنراون، دوای پێشەنگایەتی ئایدیۆلۆژیا و ورە دەکەون. هەرچەندە لەسەرەتادا تاك تاك و چەند کەسێکی دیاریکراو بن، بەڵام لەماوەیەکی کورتدا دەبێتە تەڤینەوەیەکی مەزنی کۆمەڵایەتی، ئەمەش بەشۆڕش ناوزەد دەکرێت.

گەورەیی حەزرەتی پێخەمبەر "محەمەد" چی یە؟

گەورەیی پێخەمبەر دەگەڕێتەوە بۆ پێشکەوتوویی و کارامەیی لەبواری هزر و مۆڕاڵدا، ئەمەش لەقۆناخ و هەلومەرجێکدا کە کۆمەڵگا تادواڕادە دووچاری دواکەوتوویی و داڕوخانی کۆمەڵایەتی ببووەوە. حەزرەتی "محەمەد" بەپێشخستنی هزر و مۆڕاڵ هەروەها بەکۆکردنەوەی پاشماوە ئایینیەکانی پێش خۆی و یەکانگیرکردنی لەقورئاندا و پێشکەشکردنی بەشێوەیەکی مۆڕاڵ بەخش، بەمجۆرە گەورەترین تەڤینەوەی ئیسلامی روویدا. ئەو کاتە پێکهاتەی ماددی عەرەبەکان زۆر دواکەوتوو بوو، لەلایەنی هزریشدا زۆر نەزان بوون. هەربۆیە لەپێناو بەرژەوەندیەکان زۆر بەسادە و ساکاری مرۆڤایەتی دووچاری داڕووخان دەبۆوە، هەروەها هاوشێوەی ئەمەش گەلێك ڕەوشی نەفرەت لێکراوی دیکەش لەئارادا بوو. هەربۆیە ئەم دەرکەوتنە چارەسەری لەگەڵ خۆیدا دێنێت.

لەمیانی شۆڕشی فەرەنسای چینی پرۆلیتاریادا، ئەریستۆکراتە خانەزادەکان گەیشتبوونە ئاستێك کە توانای بەرگریکردنیان نەمابوو. لایەنێك لەئاستی ژووردا بە ئاژەڵبوون و لایەنی دیکەش لەژێرەوە بەهەمان شێوە لەنێو ڕەوشی بەئاژەڵبووندا دەژیا. هەڵبەتە ئەمەش

پێویستی بەدەرکەوتنی مۆراڵ و ئایدیۆلۆژیایەکی مەزن هەبوو. بێگومان فەیلەسوفەکانی ئەو سەردەمە بیریارانی هەرە مەزن و پارێزەری رەوشت بوون. ئەمەش لەدەرئەنجامدا شۆڕشی فەرەنسای لێکەوتەوە.

دەتوانرێ لەشۆڕشی روسیاشدا هەمان رەوش ببینرێت و بەو بەردەوامیە رەچاوبکرێت. روسیا لەهەلومەرجێکی زۆر پاشکەوتووتر هەم لەئاستی ژوور و هەم لەئاستی ژێردا رەوشی بەئاژەڵبوون لەئارادا بوو. لەبەرامبەر ئەم رەوشەدا بەنزیکایەتییەکی سۆسیالیستانەی زۆر رادیکاڵ، کە بەهزر و مۆڕاڵەوە دەرکەوتە مەیدان. شۆڕشی گەورەی ئۆکتۆبەری لێکەوتەوە.

راستینەی کوردستانیش تاڕادەیەك هاوشێوەی ئەوانەیە. بەشێوەیەکی گشتی رژێمێکی هۆڤ لەئارادایە. لەئاستی ژووردا بەڕێوەبەرایەتییەکی هۆڤیانە پەیڕەو دەکرێت، لەئاستی ژێریشدا بەئاژەڵبوون دەردەکەوێتەڕوو. ئێمە ئەم راستیەمان بینی و بۆ تێپەڕ کردنی ئەم رەوشەش هەوڵماندا کە بەکام هزر و مۆڕاڵ ئەو رەوشە لەناوبەرین. لەئەنجامدا بەهۆی تەڤینەوەیەکی زۆر گەورە کە بەشۆڕشی کوردستان ناوزەد دەکرێت، ئەو پێشکەوتنەی کەوا مەزندەمان دەکرد دەرکەوتەڕوو. ئاخۆ ئەو هێزەمان لەکوێوە وەرگرت! ئێمە پشتی خۆمان بەپارە و تەنانەت بەشێوازی رێکخستنی چین و توێژەکانی کۆمەڵگا نەبەست. بەپێچەوانەوە تەنانەت ئەوەی لەئاراشدا بوو بەتەواوەتی پارچە پارچەمان کرد، چونکە تەواوی ئەوانە دووچاری کەوتن و داڕووخان هاتبوون. ئەوەی ئێمە پێشکەشمان کرد، بەڕاستی هەم لەلایەك راستینەی خۆی هەڵسەنگاند و، هەم لەلایەکی تردا دەبێتە گونجاوترین دەرکەوتنی هزر و مۆڕاڵ.

پێویستە ئەم گۆڕانکاریانە بەسادەیی نەگرنە دەست، چونکە راستینەی ئێوە لەبەرچاوە. هەرلەبەرئەوەشە کەوا من هەموو رۆژێ بەئێوە دەڵێم کە پێویستە بەهزر و مۆڕاڵەوە نزیکی ژیان ببنەوە. بەڵام هێشتا هێزی بیرکردنەوە و مۆڕاڵتان تێری ئەوە ناکات کە تەنانەت خودی خۆتانی پێ بپارێزن. ئێوە خۆتان لەرەوشی هەژاریش رزگار ناکەن. کامتان تا ئەو رادەیە مۆڕاڵێکی بەرزی هەیە و هزری تێری ئەوە دەکات کە وەڵامی رەوشی بابەتی بداتەوە؟ لەبەرئەوەی ئەوانە نەبوونە، بۆیە بەئێوە دەڵێم:" بێ پرەنسیپن، لەگێلیدان". ئەگەر شیکردنەوەکانی ئێوە بەتایبەت شیکردنەوەکانی سەرۆکایەتی بەبنەما وەرنەگرن، ئەوا ئێوە بەدواکەوتوویی دەمێننەوە و تەنانەت PKK یەکی ساختە دەردەکەوێتەڕوو. هەر لەبەرئەمەشە کە پێش ناکەون؛ چونکە یاسا و رێسای پێشکەوتن هەیە.

کەواتە بەشێوەیەکی گشتی هزر و بەتایبەتیش شێوە ئایدیۆلۆژیاکەی، جێگەی باس و خواسە. کەواتە دەکرێ گرێدانێك لەنێوان ئایدیۆلۆژیا و هزردا پێکبهێنرێت.

هزر؛ یەکانگیربوونێکی گشتی یە، لەتێکڕای بیرۆکەکان پێکهاتووە.

هەرچی ئایدیۆلۆژیایە؛ بریتییە لەو هزرانەی کەوا بەپێی بیر و بڕواکانی کۆمەڵگا و بەرژەوەندییەکانی، تەنانەت بەگوێرەی هەلومەرجی ماددی کۆمەڵگایەك فۆرمیلە بووە.

ڕاستینەی کۆمەڵگایەك چ بۆ پێشخستنی یاخود بۆ دواخستنی یاخود نزیکایەتییەکی ئاراستەکراوی موحافەزەکارانە، گوزارشتکرنە لەو بیر و بۆچوونانەی. ئایدیۆلۆژیا دواکەوتووەکان، هەروەها ئایدیۆلۆژی پێشکەوتووخوازیش هەن، لەهەمان کاتدا ئایدیۆلۆژیای موحافەزەکاریش لەئارادایە، هاوکات ئەو هەوڵانەی کە بۆ خولقاندنی گۆڕانکاریشن لەئارادایە. ئایدیۆلۆژییەکان بەشێوەیەکی بەرجەستەکراو گرێدراوی ئاستی پێشکەوتن یان دواکەوتنی کۆمەڵگان.

بەدرێژایی مێژوو ئایدیۆلۆژیا پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە. ئایدیۆلۆژییە ئایینیەکان لەم یان لەو کۆمەڵگا هەریەکە لەئاستێکدا پێشدەکەوێت. بەمجۆرە دێت و دەچێت. جگە لەمە هەر ئایدیۆلۆژیایەك بەگرانی لایەنی فەلسەفی هەیە. هەر لێرەشدا پێویستە پێکهاتەی فەلسەفە تێبگەین. فەلسەفە لەئایینەوە دەرکەوتووە یاخود لەدوای قۆناخەکانی پێشکەوتنی ئایینەوە هاتۆتە ئاراوە. واتە ئەویش تارادەیەك هێندەی ئایین مێژوویەکی کۆنی هەیە.

هەرچی جیاوازییە فەلسەفیەکانە زیاتر لەزانستەوە نزیکن.

فەلسەفە نالێ "خوا هەیە"، بەڵکو دەڵێ " سروشت هەیە، بەمجۆرەیە"، تاوتوێی دەکات. واتە فەلسەفە بەجیاوازی لەگەڵ هەندێ شتی دیکەی دۆگماتیك بەگوێرەی ڕاستینەی سروشت هزر پێش دەخات. گەلێك لایەنی هاوشێوەی ئایینی هەیە. ئەگەرچی لایەنی لەیەکچووشیان هەبێت، وەلێ لایەنی جیاوازیشیان زۆرە. فەلسەفە هەوڵدەدات تارادەیەك ڕاستینەی سروشت شیبکاتەوە، هەرچی ئایینیشە لەسەرەتای سەرهەڵدانیەوە پشتی خۆ بەپرەنسیپێکی ژووری سروشتەوە دەبەستێت. ئایین دەڵێ:" ئەم خوایە، یا وشەی ئەم خواوەندە" و هەوڵدەدات سروشت و ژیانی ماددی ڕێکبخات. پێویستە لەبیر نەکرێ کە ئەمەش هزرێکە. بەشێوەیەکی گشتی یەکێك لەژووری سروشتدا، نەك لەبەرئەوەی تاکە خواوەندێکە بەڵکو فکرێك کە گرانی دەداتە سەر لایەنی مۆراڵ هێز دەبەخشێت.

هزری "خواوەند" کەی و چۆن پێکهات؟

دەرکەوتنی هزری "خواوەند" بەچەندین قۆناخدا دەرباز بووە، تاکو ئێستاکەش بەتەواوی بەوجۆرەی کە دەخوازرێت زاراوەی خوداوەند؛ مەبەست لەچی دێت، ئاشکرا نەبووە. کەسایەتییەکی وەکو "ئەنشتاین" کە لەهەرکەسێك زیاتر زانستی پێشخستووە، داکۆکی لەسەر هەبوونی هزری خواوەند دەکاتەوە. لەلای ئەو هزری خواوەند بوونی هەیە کە هەرهێزێکی سەرەتایی سروشت وەکو خواوەندێك، دەبینێ. وەلێ لەنێوان ئەمانەشدا جیاوازی هەیە، ئەو پێناسەیەی کە دەڵێ:" هێزی بەڕێوەبردنی سروشت" یاخود " یاساکانی سروشت"، زانستیش

باسی لێوە دەکات. ئەوەی دەمانەوێ ئاماژەی پێبکەین، ئەوەیە کە زاراوەی "خواوەند ــ اللـه" تـاوەکو ئێستاکەش، بەردەوامـە، یـاخود لەبـەراوردکردنی دواکـەوتنێك؛ لـەئارادا نییـە. وەلـێ ناکرێ زێدە هەموو شتێك بەپەیوەستکردن بەهزرێکی بەمجۆرە بگیردرێتە دەست، ناشتوانرێت زێدە پێشکەوتنیشی بـەمجۆرە روونبکرێتـەوە. لێـرەدا فەلسـەفە خـۆی دادەسـەپێنێ. فەلسـەفە زیاتر لەزانستەوە نزیکە و هەوڵدەدا بنەماکانی پێشکەوتنی سروشت روونبکاتەوە.

وەکو دەزانـرێت، گـەلێك تـەوژمی فەلسـەفی هـەن. واتـە تەوژمـە ئایدیالیستیەکان، تەوژمـە ماتەریالیزمییەکان ئەو شێوازانەی کە بەکاریان هێناوە لەخۆوە دەگرێت.. لەلایەکەوە هەندێك دەیانـەوێ مەسـەلەکان بـەنزیك بوونـە میتافیزیکیـەکان روونبکەنـەوە، لەلایـەکی دیکـەش دا هەندێك دەیانەوێ مەسەلەکان بەنزیکبوونە ماتەریالیزمییـەکان روونبکەنـەوە. لەکاتێکدا کـە دیالێکتیك زیاتر پەیوەسـتە بەفەلسـەفەی ماتەریالیست، کەچـی میتافیزیـك زیـاتر پەیوەسـتە بەفەلسەفەی ئایدیالیستی.

لێرەدا نامانەوێ زێدە لەسەر ئەم مەسـەلانە رابوەسـتین، وەلـێ تـەواوی ئەمانـە کـەم تـازۆر پەیوەنـدی بەپێشـکەوتنی کۆمەڵایەتییـەوە هەیـە. ئـەم مەسـەلانە لـەقۆناخی سـەرەتایی مرۆڤایەتی و، لەرۆژگاری ئەمرۆشماندا لەئارادان. خاڵی هەرە گرنگ ئەوەیە کە پێویستە رۆڵـی فەلسەفە یاخود ئایین لەپێشکەوتنی مرۆڤدا ببینـرێ و بزانـرێ کە چ واتایەك دەبەخشـێ. واتـە ئایا ئێستا ئێوە بـەگوێرەی ئـایین یـاخود بـەگوێرەی فەلسـەفە بیردەکەنـەوە؟ پێویسـتە لەمـە تێبگەن. پێویسـتە تێبگـەن کـە بنـەمای هزرتـان ئایینییـە یـاخود فەلسـەفیە. بێگومـان لێـرەدا بەشێکیش بیری زانستیە. بیری زانستی بەگوێرەی ئایین، بەگوێرەی فەلسەفەش دەتوانێ ژیانی مـاددی (بەرجەسـتە) زیـاتر بەشـێوەیەکی بابەتیانـە روونبکاتـەوە. واتـە بانگێشـەیەکی وەکـو "2+2 =4" هەیە. خاوەنی توانستێکی بەوجۆرەیە.

هـەروەکو دەزانـرێـت هـزری زانسـتی یـاخود زانسـتە کۆمەڵایەتییـەکان بـریتین لـە؛ زانسـتی فیزیـا، زانسـتی کیمیـا، زانسـتی بـایۆلۆژی (ژیـانزانی)، تەنانـەت هـەروەکو دەشـگوترێ ــ کـە هەوڵـدەدرێت بنـەمای هەنـدێ مـەیل بدۆزرێتـەوە ــ زانسـتی سـایکۆلۆژی (دەروونـزانـی)یش لەخۆوە دەگرێت.

ئاخۆ جیاوازی هزری زانستی لەگەڵ ئەوانەی دیکەدا چیە؟

هـزری زانسـتی لەچـاو ئـەوانی دیکـەدا لەتوانایـدا هەیـە کـە زیـاتر گـەردوون، سروشـت و کۆمـەڵگا پێناسـە بکـات. رەوشـێکی وەهـا بەدەسـتەوە دەگرێـت کـە تێیـدا بـەهۆکار و دەرئەنجامەکانیـەوە روونـی دەکاتـەوە. بێگومـان ئەمـەش گـەلێك هێـزی بـەمرۆڤ بەخشـیوە. بەگوێرەی زانست بیرکردنـەوە لـەئان و سـاتی ئێسـتادا بەبنـەما وەردەگرێـت و مـرۆڤ دەتـوانێ لەرێگای ئەمەشەوە پێشبکەوێت، وەلێ ئایینیش بەدرێژایی مێژوو پێشیخستووە و لەسەر پێـی

ڕاگرتووە. فەلسەفەش هەمان ڕۆڵی گێڕاوە و تائێستاکەش ئەو ڕۆڵە دەگێڕێت.ئێستا تەنیا لەڕووی زانستەوە پێشکەوتن هەیە. واتە زانست هەرلەسەرەتاوە, پێش هەڵسوکەوتی مرۆڤ و چالاکییەکانی, بوونی هەیە. واتە کاتێ مرۆڤ ڕاوی ئەنجامدەدا, کاتێ کە هەندێ کاری کشتوکاڵی سەرەتایی پێشدەخست, زانست بوونی هەبوو. لایەنی زانستی ئەو چالاکیانە چیە؟ گوتنی "ئەگەر بەمجۆرە هێرش بکەمە سەر نێچیرەکەم, بەمجۆرە بیپێکم, نێچیرەکەم لەپەلوپۆ دەخەم", خۆی لەخۆیدا نزیك بوونێکی زانستی یە. یاخود نزیکبوونی " ئەگەر ئەم پارچە زەویە بەوجۆرە بچێنم, لەبەرامبەریا ئەو بەرهەمە بەدەست دەخەم" هزرێکی زانستیە و زانست بەقەد مێژووی مرۆڤایەتی پاشخانێکی (مێژینەیەکی) هەیە. وەلێ لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا زانست زۆر بەسیستەماتیکە و لەگەلێك بوارە جیاجیاکاندا ( تادواڕادە) پێشکەوتووە.

ئەگەرچی لەسەرەتای بوونی مرۆڤایەتییەوە جێگای ئایین بەرچاو بووبێ, وەلێ لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا تاڕادەیەك بەشێوازی سنووربەندیەك, دەبینرێ. هەروەها لەکاتێکدا کە فەلسەفە لەچەرخی ناوین, چاخە سەرەتاییەکان و تەنانەت لەقۆناخە سەرەتاییەکانی سەرمایەداری دا زیاتر هەڵوەستەی لەسەر دەکرا, کەچی ئێستا کەوتە ریزی دووەمەوە یاخود بەمجۆرە دەبینرێ. هەرچی زانستە ئەگەرچی لەسەرەتادا سنووربەند بووبێ, وەلێ ئێستا هەموو شتێك بەگوێرەی زانست بیری لێدەکرێتەوە و ئەمەش خۆی لەخۆیدا کێشەیەکی گرنگە.

لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا گفتوگۆ لەسەر ئەوە دەکرێت کە " ئاخۆ زانست بەتایبەت ئەو تەکنیکانەی لەڕێگای ئەمەوە پێکهاتووە, تا چ ڕادەیەك مرۆڤایەتی ڕووبەڕووی لەناوبردن دەکاتەوە".

ئەو پێشکەوتنە تەکنیکییەی کە ئەمڕۆ زانست ڕێگای بۆ کردۆتەوە یاخود وروژاندویەتی, تاڕادەیەك هێندەی دۆگماتیکییە ئایینیەکان, هەروەها هێندەی هەندێ لەپەیوەندییە فەلسەفیەکان, هەڕەشە لەکۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەکات. تەنانەت باس لەوە دەکرێت کە لەسەردەمێکی نزیکدا شیمانەی ئەوە هەیە کە ئەو تەکنیکەی کە پشت بەزانست دەبەستێت, کۆتایی بەمرۆڤایەتی بێنێت. ئەگەر لەبەرامبەر ئەمەدا تەگبیر وەرنەگیرێت, ئەوا مەترسی ئەوە هەیە کە تەکنیك گیانەوەری وا بخوڵقێنێ کە مرۆڤایەتی قوت بدات. هەڵبەتە ئەتۆمیش یەکێکە لەو گیانەوەرانەی کە لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لەتوانایدا هەیە تێکڕای سروشت و ژینگە وێران بکات.

لەڕابردووشدا گیانەوەر هەبوون, بەلام مرۆڤ دەیزانی چۆن خۆی لەبەرامبەر ئەو گیانەوەرانە بپارێزێت. لەسەردەمە سەرەتاییەکاندا, واتە لەکۆمۆنەی سەرەتاییدا مرۆڤ دەیتوانی خۆی بپارێزێت, بەلام ئێستا ناتوانێ خۆی لەبەرامبەر گیانەوەرە تەکنیکیەکان,

بپارێزێت. تەنانەت ئەگەری ئەوە هەیە لەدوای چەند سەدەیەك گیانەوەرە تەكنیكیەكان، مەترسیدارتر ببن. هەڵبەتە بۆ ئەمەش مرۆڤ دەزانێت كە خۆی بپارێزێت.

بەشێوەیەكی گشتی ئەم سەردەمەی كە مرۆڤایەتی تێیدا دەژی، وەكو دوا سەدە هەڵدەسەنگێنن. لەڕاستیدا ئەو شتەی كە هەموو كاتێ لەنێو خۆیدا بەجۆرێك خۆی نیشان بدات، بەم جۆرە نییە، چونكە بناخەی سەرەكی گۆڕانكاریە. بەڵێ گۆڕانكاری پێداویستی پرەنسیپێكی دیالێكتیكییە، بەڵام پێویستە ئەمە راست هەڵبسەنگێنرێت. گۆڕانكاری بەواتای نەبینینی دیاردەكان نایەت. بەڵكو پێویستە ئاستی بنەمای پێشكەوتنی هەر سەردەمێك كە خاوەنی بەهای خۆیەتی ببینرێت، ئەمانە بەواتای گۆڕانكاری دێت. لەكاتێكدا كە بڵێیت: " هەموو شتێ لەگۆڕانكاری دایە، ئەوا راست نابێت. لەو باوەڕەدام لەلای ئێمەش گۆڕانكاری تاڕادەیەك بەشێوەیەكی چەوت لێی تێدەگەن. بۆ تێگەیشتن لەگۆڕانكاری، پێویستە ئەو شتانەی لەناو ناچێت ببینرێت. . ئەو شتانەی كە لەناوناچن هێندەی مێژووی مرۆڤایەتی خاوەن بەهایەكی وەهان كە گۆڕانكاریان بەسەردا نایەت. بەڵام شان بەشانی ئەمەش ئەو بەهایانەی كە پێویستە گۆڕانكاریان بەسەردا بێت لەئارادایە. پێویستە ببینە خاوەنی گۆڕانكاری یاخود چەمكێكی فەلسەفی بەم شێوەیە.

بەكورتی ئەو تایبەتمەندییانەی كە پێویستە ببینرێت ئەوەیە كە پێشكەوتنە مرۆڤایەتییەكان لەبواری هزری و ئایدیۆلۆژیدا چ گوزارشت لەئاستی فەلسەفە و زانست یاخود گوزارشت لەئاستی ئایین، جادوو و تەلیسم بكات، ئەوا مسۆگەر بەیەكانگیر بوون لەگەڵ ناوەڕۆكی ژیانەوە دەبێت. ئەگەر ئەم دیسپلینانە لەئارادا نەبێت، ئەوا ژیان بەرێوە ناچێت و دەوەستێت.

ئەو كاتە مرۆڤ دەبێت بەمرۆڤ كە ببێت بەخاوەنی بەرنامە و فەلسەفە و زانست. وەلێ پێویستە گرانی بداتە كوێ و، كوێ بەبنەما بگرێ، گۆڕانكاری پێویستە لەكوێ تا چ رادەیەك، پێویستی بەكام شێوەی ئایدیۆلۆژی هەیە، لەكوێ و تاچ ئاستێك بۆ جێبەجێكردنی ئەوە پێویست بەدیسپیلین، مۆراڵ و رەوشت هەیە؟ ئەگەر تێكڕای ئەمانە دەستنیشان بكرێت، ئەوا ئەو كۆمەڵگایە راست و دروست دەبێت و دەتوانێت خۆی بژێنێ و ئازاد بكات. وەلێ نەتوانێ ئەمە بكات و كێشە ئایدیۆلۆژی و مۆراڵییەكان چارەسەر نەكات، ئەو كۆمەڵگایە دووچاری داڕووخان دەبێتەوە. ئەگەر خاوەن دەسەڵاتیش بێت دیسان دەڕوخێت، ئەگەر بشڕوخێت پەرتەوازە دەبێت و دەتوێتەوە و لەناو دەچێت.

ئێستا كۆمەڵگای كوردەواری ئێمەش تاڕادەیەك گوزارشت لەكۆمەڵگایەكی داڕووخاو دەكات. كۆمەڵگای كورد داڕوخاوترین كۆمەڵگایە كە رووبەڕووی خراپترین پەرتەوازەیی بۆتەوە.

چونکە راستینەی کۆمەڵایەتییەکی وەهای هەیە کە ئاستی ئایدیۆلۆژی و مۆراڵ تێیدا وێران بووە.

لەڕەوشێکی وەهادا PKK بە چ واتایەك دێت؟

PKK جوڵانەوەی دۆزینەوەی ئایدیۆلۆژیا و مۆراڵە بۆ ڕاستینەی گەلێك کە ئایدیۆلۆژیا و مۆراڵی وێران ببوو.

پێویستە بەباشی لەم راستینەیە تێبگەن, چونکە ئەوە خاوەنی کلیلی تێگەیشتنە. وەلێ کاتێ کە من سەیری گرێدانی کۆمەڵایەتییان دەکەم یاخود هەوڵدەدەم لەو گۆڕانکارییەی کە مەبەستیانە تێبگەم, ئەوا رەوشی ئێوە بەو گوندنشینە کۆنانە دەچوێنم کە حەیزەرانێکیان بەدەستەوە دەگرت, ئەگەرچی لەشوێنی حەیزەران ئێستا چەك کەوتبێتە دەستتان و لەڕووی تەکنیکیدا جیاوازیەکی هەبێت, وەلێ لەڕووی چەمك و تێگەیشتندا هیچ جیاوازیەك لەئارادا نیە. گوندنشین لەتوانایدا هەیە حەیزەران بەرز بکاتەوە و بەڕاوەشاندنەوە بڵێت: کوڕە لەبەرامبەرم لاچۆ. من بەرەنگاری دەبمەوە, وەلێ لەدوای ئەمە وەکو هێرشی دۆنکیشۆت, ناتوانێت هیچ ئەنجامێك بەدەست بهێنێ. لەبیرمەکەن کە گەلێك لەو کەسانەی چەکیان بەشانەوەیە لەوە دەچن, تەنانەت زۆر مەترسیدارترن. چونکە ئەگەر بەچەك وەکو دۆنکیشۆت بکەیت, دەسوتێیت. خۆی لەخۆیدا بەسەرسوڕمانەوە هەڵوەستە لەسەر ئەمە دەکەم و دەشخوازم رێگا لەپێش دیاردەیەکی بەمجۆرە بگرم. ئێستا یەکێ لەسەرەکیترین ئەرك کە لەئەستۆماندایە, ئەوەیە کە ئێوە لەبوون بە"دۆنکیشۆتە چەکدارەکان" رزگاربکەم.

باشە چۆن دەتوانرێت ئەم رەوشە بەربەستبکرێت؟ بەڵێ, هەروەکو ئاماژەم پێکرد ئەو هێزە هزریەی کە رێگا لەپێش داڕووخان و پەرتەوازەبوونی کۆمەڵایەتیمان دەگرێت بەدیاریکردنی گرێدان بەژیان و بەرجەستەکردنییەوە دەبێت. پێویستیتان بەمانەش هەیە. جگە لەمە من چارەسەری دیکە نابینم.

گەلێك ئایدیۆلۆژیاش خاوەنی ئەم بانگەشەیەیە. بۆ نموونە لەم سەردەمەدا ئەو مۆدێرنیزمەی کە پابەندە بەئاستی پێشکەوتنی زاست, وەکو دەڵێت گەلێك ئایدیۆلۆژیا لەئارادایە, ئەمانە چین؟ بۆرژوا بەگوێرەی راستینەی خۆی خاوەنی ئایدیۆلۆژیایە کە ئێمە پێی دەڵێین نەتەوەگەرایی. لەژێرناوی گەلێك لێشاوی لەجۆری لیبرالیزم دەوڵەتگەرا و.. هتد گەلێك رەوتی جیاجیای ئایدیۆلۆژییان دەستنیشان کردووە.

بەڵام لەڕاستیدا تایبەتمەندی سەرەکی لەنێوان ئەمانەدا, دەتوانرێت وەکو نەتەوەگەری پێناسە بکرێ. هەرچەندە لەڕابردوودا ئایدیۆلۆژیەکان تاڕادەیەکی سنووردار پەیوەندی بەکۆمەڵگاوە هەشبووبێت, وەلێ لەپاش ئاستی نەتەوەییدا بوو. بەجۆرێك کە زیاتر کۆمەڵە عەشیرەتی و دەستەکانیان بەبنەما وەردەگرت. لەسەر شێوەی خێزان گەلێك دەستە پێکهاتبوو.

ئایدیۆلۆژیا خوداوەندییەکان, تەنانەت خوێندنگا فەلسەفیەکانیش بەرژەوەندی دەستەیەکی تەنگیان بەبنەما وەردەگرت و لەبنەڕەتیشدا ئایدیۆلۆژیای ئەوان بوو, ئەگەر نا, مولکی تەواوی کۆمەلگا نەبووە.

بۆرژوازی چینێکە کە یەك هەنگاو پێشکەوتووە وتارادەیەك بۆخۆی نەتەوەیەك پێشبینی دەکات. بازاڕێکی نەتەوەیی, سنوورێکی نەتەوەیی, دەولەتێکی نەتەوەیی پێشبینی دەکات. ئەمەش لەگەلْ خۆیدا راستینەی ئایدیۆلۆژیای نەتەوەگەری دەردەخاتەڕوو. ئایدیۆلۆژیای نەتەوەگەری چییە؟ بۆرژوا کۆمەلگایەك بەرز دەکاتەوە, ئەم کۆمەلگایەش نەتەوەیەك بەرز دەکاتەوە. ناچارە ببێت بەنەتەوە. چونکە بۆرژوا پێویستی بەدەولەتێکی نەتەوەیی, کولتورێکی نەتەوەیی, خاکێکی نەتەوەیی هەیە.

هەرلەم چوارچێوەیەشدا هزری مەزنی دەولەتێکی نەتەوەیی, هزری مەزنی کوولتورێکی نەتەوەیی, هزری ئابووری نەتەوەیی پارتە نەتەوەییەکان و گەلێك لایەنی دیکەی نەتەوەیی پێشدەخرێت. ئەمەش بەواتای نەتەوەگەرییەکی مەزن دێت. هەربۆیە لەئەنجامی گەلێك هۆکاری جیاجیا چوون بەرەو فاشیزم هاتە ئاراوە. هیتلەر نوێنەرایەتی پێشکەوتووترین نەتەوەگەری شۆڤێنی دەکات و دەلێ: رەگەزی ئەلمان شکۆمەندترین رەگەزە, تێکڕای رەگەزەکانی دیکەش لەئاستی نزمدان ". مەترسیدارترین خالْ کە ئایدیۆلۆژیای بۆرژوازی لەپێشکەوتنی خۆیدا پێیگەیشت, ئەمەیە.

هەلبەتە, ناتوانرێ پەیوەندی ئایدیۆلۆژییەکان بەکۆمەلگا و چینە کۆمەلآیەتییەکان بەلاوە بنرێت و بەشێوەیەکی گشتی پەیوەستە بەمرۆڤەوە. وەلێ ئایدیۆلۆژیاکان بەتایبەت پابەندبوونیان هەیە بەکۆمەلگای مرۆڤایەتی, واتە پێشکەوتنە چینایەتییەکان. ناکرێ ئایدیۆلۆژیاکان پەیوەندی بەکۆمەلگا بەگشتی و بەچینەکانیەوە بەتایبەت, نەبێ. بەلێ بۆرژوازی پێشکەوتنێکی ئایدیۆلۆژی بەمجۆرەی هەیە و تاوەکو ئێستا ئەم پێشکەوتنەش بەخێراییەوە, بەردەوامە. لیبرالیزم, دەولەتگەراییش شێوەیەکی دیکەی نەتەوەگەراییە.

لەبەرامبەر ئەمەش دوانەی بۆرژوازی یاخود لەمێژوودا شانبەشانی ئەوە بەشێوەیەکی بەرفراوان چینی رەنجدەر دەرکەوتووە, کەپێی دەگوترێت پرۆلیتاریا , دەیەوێت بەگوێرەی ئەوە ئایدیۆلۆژیایەك بونیادبنێن. هەروەکو دەزانرێت بەم ئایدیۆلۆژیایەش دەوترێت ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیستی. رەگ و ریشەی ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیستیش پشت بە پاشخانێکی کۆن دەبەستێت. هەروەکو چۆن بەدرێژایی مێژوو نەتەوەگەرایی پشتی خۆی بە ئەریستۆکراتی, تەنانەت بە چینی خاوەن کۆیلەکان بەستبێت, ئەوا سۆسیالیزمیش پشتی خۆی بە چەوساوەکان, کۆیلەکان دەبەستێت. لەنێو شۆڕشی سپارتاکۆس و کۆیلەکانی چەرخی ناوینیش گەلێك ئەزموونی سۆسیالیستی هەیە, وەلێ لەسەدەی 19 دا ئایدیۆلۆژیای

سۆسیالیستی پێشکەوت, کە ئەمەش بە سۆسیالیزمی زانستی ناوزەد دەکرێت و هەڵدەسەنگێنرێت. واتە هەر سەردەمێك بەگوێرەی خۆی سۆسیالیزمێکی هەیە.

بۆ نموونە, تاڕادەیەك حەزرەتی عەلی یاخود عەلەویەت بەشێوەیەکی گشتی لەئیسلامیەتدا, نوێنەرایەتی سۆسیالیزمی ئیسلامیەت دەکات. لەچەرخی ناویندا هەرئایینێك بەگوێرەی خۆی شێوەی بونیادی کۆمەڵایەتی هەیە. تەنانەت ئەمە لەچەرخە سەرەتاییەکانیشدا جێگەی باسە.

لەگەڵ دەرکەوتنی چەرخی سەرمایەداریشدا, بەگوێدان بە ئایدیۆلۆژیای زانستی, سۆسیالیزمی زانستیش هەیە. بۆئەوەی سۆسیالیزمی پێشکەوتوو لەسۆسیالیزمەکانی دیکە جیابکرێتەوە, پێی دەگوترێت سۆسیالیزمی زانستی.

بۆچی بەزانستی ناوزەدکرا؟

خۆی لەخۆیدا سەدەی 19 سەدەی زانستە و هیچ بوارێك نەما کەزانست نەچێتە بنج و بنەوانیەوە. ئەم پێشکەوتنە کاریگەری لەسەر زانستە کۆمەڵایەتییەکانیش کرد. واتە لەگەوهەری زانستە کۆمەڵایەتییەکان, سۆسیالیزمی زانستی دەردەکەوێتە مەیدان. بەڵێ, ناوزەدکردنی سۆسیالیزمی زانستی یاخود لەسۆسیالیزمدا زانست, بۆ ئەو هۆکارە دەگەڕێتەوە. ئەمەش زێدە گرنگ نیە.

سۆسیالیزم لەمێژووی ئایدیۆلۆژیەکاندا زانستیترین بانگێشەیە.

هەندێ هۆکاری ئەمەش هەیە و هۆکاری سەرەکیشی پابەندبوونیەتی بەچینی ڕەنجدەر. چینە دەسەڵاتدارەکان ناچارن درۆ و ساختەکاری بکەن. بەڵام چینی ڕەنجدەر ناچارە واقیعی و زانستی بێت. چونکە پێویستی بە درۆ و داگیرکردنی ئەوانی دیکە نییە, هەر لەبەرئەمەش کە چینی ڕەنجدەر چینێکە کە لەزانستەوە نزیکە. بێگومان مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی هەموو کاتێ پێویستی بەیۆتۆپیا هەیە. بەڵام خەیاڵەکان بچووك نین. هەروەها ناکرێ بیر لەتایبەتمەندێتی خەیاڵاوی سۆسیالیزم نەکرێتەوە. لەڕاستیدا هەر ئایدیۆلۆژیایەك خەیاڵێکە و تا سۆسیالیزمیش ناچارە ببێتە یۆتۆپیایەکی بەمجۆرە. سۆسیالیزمی بونیادنراو دەیخواست ئەمە تێپەڕێنێ یاخود دەیخواست سۆسیالیزم بێ خەیاڵ و بێ مۆراڵ بکات, بەڵام دەرئەنجامەکەی داڕووخان بووە. دەکرێ وا دابنرێ کە ئەو ئایدیۆلۆژیا سۆسیالیزمییەی کە لەئارادا بوو بەشێوەی لەڕێ لادان بوو لەگەوهەرە ڕاستەقینەکەی. هەر لەڕێ لادانێك هەروەکو هەیە ناتوانێ خۆی لەژێرکەوتن رزگار بکات.

**"وێستگە گرنگەکان لەمێژووی ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزم"**

ئێستا پێویست دەکات سەبارەت بەم پرسیارانە روونکردنەوە ئەنجام بدەین کە ئاخۆ پێویست بە ئایدیۆلۆژیایەکی زانستی هەیە یاخود ئایا هەر ئایدیۆلۆژیایەك ناچارە زانستی بێت؟

هزری مرۆڤ تادێت زانستی دەبێت, هەربۆیە هەروەکو چۆن فیزیا, کیمیا یاخود رێبازەکانی دیکە رێژەیەکی زانست بوونی هەیە, ئەوا بوارە کۆمەلایەتییەکانیش رێژەیەکی زانست بوونی هەیە, وەلێ هەروەکو چۆن زانست نەیتوانیوە سەبارەت بەیاسا بنەماییەکانی سروشت بەشێوەیەکی گشتگیری خۆی لەهەموو لایەنێکەوە روون بکاتەوە, ئەوا زانستی کۆمەلایەتیش لەتوانایدا نییە کە بەتەواوەتی خۆی زانستی بکات, چونکە خۆی لەخۆیدا کۆمەلگا خاوەن تایبەتمەندی خەیاڵییە, رۆح و تەسەوورە؛ ناتوانرێت بەتەواوەتی ئەمەش بخرێتە نێو چوارچێوەی فۆرمیلەیەك. بەشێوەکی گشتی خودی مرۆڤ ئەو بوونەوەرە نییە کە بەتەواوەتی بەشێوەیەکی زانستییانە بەرهەم بهێنرێت. ئەگەر بخوازرێت بەمجۆرە مرۆڤ بگیردرێتە دەست, ئەوا رەوشێکی وەکو فاشیزمی ئەڵمانیا دەردەکەوێت کە دەیخواست رەچەڵەکێکی رەسەنی ئەڵمان بخولقێنێت, بێگومان ئەمەش مەترسیدارترین رەوشە. تەنانەت ئەم رەوشە لەسۆسیالیزمی بونیادنراودا هەندێك تاقیکرایەوە و سەرئەنجام دووچاری هەرەس هێنانی کرد. فاشیزم کە ئایدیۆلۆژیایەکی بۆرژوازییە گەلێك زوو دووچاری هەرەس هێنان بۆوە.

لەبەر ئەوەی سوسیالیزمی بونیادنراویش لەراستینەی گەوهەری سۆسیالیزم لایدا, بۆیە هەرەسی هێنا. لەسۆسیالیزمی بونیادنراودا خواسترا کە کۆمەلگا و تاکەکەسی بێ رۆح و میکانیکی بخولقێنرێت.

مرۆڤ دەتوانێت لەئاستی زاراوەدا سۆسیالیزم بە پەیوەندی هەرە ئازادی مرۆڤ لەنێو کۆمەلگادا پێناسە بکات. تەنانەت دژی قوتبوونە لەراستینەی کۆمەلایەتی و, دژی جێگەگرتنە لەژووری کۆمەلگا, داگیرکاری و دەستەرۆیی و هتد... وەلێ لەکاتێکدا بگوترێ با ببمە سۆسیالیست, گوتنی وەك " ناچارییەکە و دەبێ هەموو شتێك وەکو دانەکانی شانە لەیەك بچن " ئەمە نکوڵی کردنی پێشکەوتنی سروشتییە. چونکە هیچ پێشکەوتنێکی سروشتی بەمجۆرە نییە. لەبەر ئەمەشە کە بەشداریکردنێکی ئازادانە لەهەموو شتێك راستترە.

پێویستە تەڤلیبوونی کۆمەلگا بەگوێرەی بەهرەکان و رەنجەوە بێت.

بێگومان سۆسیالیزمیش بەمجۆرە پێناسە دەکرێت, لەجێگای ئەمە تەڤلیبوونی بیرۆکراتییانە, تەڤلیبوون بەگوێرەی فەرمان, تەڤلیبوونی پێشووی وەکو " 2+2=4 ", لەگەل سروشتی مرۆڤ یەکانگیر نابێت. هەربۆیە لەئەنجامی ئەم یەکانگیرنەبوونە بوو کە سۆسیالیزمی بونیادنراو هەلوەشایەوە. لەقۆناخی کۆیلایەتی, فیودالیدا کەسێك خۆی لەسەرووی کۆمەلگا, لەشوێنی خوداوەند دادەنا, ئێستاکەش خۆی لەشوێنی کاربەدەستێك

(Patron) دادەنێت. هەروەکو چۆن ئەوجۆرە خوداوەندانە تێپەڕ کرا, ئەوا کاربەدەستیش تێپەڕ دەکرێت. وەلێ لەسۆسیالیزمی بونیادنراودا بەمیکانیك کردنی مرۆڤ, لەڕێ لادانە و بەواتای ئاستی ئازادی نایەت.

بەشێوەیەکی گشتی بەپێشخستنی هزری سۆسیالیستی چەوساوەکان, چەمکەکانی یەکسانی و ئازادی, لەلایەن مارکس ـ ئەنگلس لەسەدەی نۆزدەدا گەیاندرا بەگوزارشتێکی زانستی. ئەو سۆسیالیزمەی کە مارکس ـ ئەنگلس پێشیان خستوون لەلایەنی گوزراشتی زانستیدا هاوکارییەکە و گەلێك دەسکەوتیشی لێکەوتەوە. یۆتۆپیای سۆسیالیستی, داب و نەریتە سۆسیالیستییەکانیان, بەتایبەت بەشێوەیەکی ئایدیۆلۆژیانە, گەیاندە گوزارشتێکی زانستی. لەم چوارچێوەیەشدا ئەو زەمینانەی بەکاریان هێناوە و پشتی خۆیان پێبەستووە, فەلسەفەی ئەڵمانیا, ئابووری سیاسی ئینگلیز و سۆسیالیزمی یۆتۆپی فەرەنسایە. واتە تەواوی ئەوانە تاوتوێ دەکەن و لەدەرئەنجامیشدا دەیگەیەننە گوزارشتێکی یەکجار زانستی. بۆ ئەوەی جیاوازی لەنێوان سۆسیالستی خۆیان و ئەوانی دیکەدا دابنێن, پێی دەڵێن " زانستی ". ئەمە قۆناخێکی گرنگە و ناکرێ بچووك بکرێتەوە.

لەلایەکدا بەمجۆرە ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیستی روون دەکرێت و زانستی دەکرێت, لەلایەکی دیکەدا خواستیان ئەمە رێکبخەن. بۆ ئەمەش یەکێتی کۆمۆنیست, ئەنتەرناسیۆنالیستی یەکەمی کۆمۆنیستیان دامەزراند. ئەمانە کرێکاریان بەرەو بەسەندیکابوون برد و تاڕادەیك هۆشیاری, رێکخستنیان بۆ چینی کرێکار بەدەست خست, بەڵام نەیانتوانی بەتەواوەتی بیگەیەننە دەسەڵات. کۆمۆنەی پاریس تاقیکردنەوەیەك بوو, وەلێ نەگەیەنرا بەسەرکەوتن.

لینین لەتەواوی ئەمانەدا لەمیانەی بەسیاسەتکردنی سۆسیالیزم, توانی هەنگاوێکی پێشکەوتووتر هەڵبێنێ. لەشۆڕشی سۆسیالیستی بەپێشەنگایەتی لینین کە پێی دەگوترێت " ئەزموونی بۆلشەفیك " قۆناخێکی پێشکەوتنی پراکتیکی ـ سیاسی هەیە. هاوکاری هەرە گرنگی لینین بۆ سۆسیالیزم, بەسیاسەت کردنیەتی.

تێپەڕاندنێکی مەزنی لەئایدیۆلۆژیاوە بۆ سیاسەت ئەنجامداوە. وەکو دەزانرێت تیۆرێکی شۆڕشی لینین هەیە. سەبارەت بەتیۆری ئیمپریالیزم, روونکردنەوەی " شکاندنی لەلاوازترین ئەڵقە "ی هەیە. هەروەها هەڵسەنگاندنی لینین سەبارەت بەپارتی پێشەنگ, تاکتیکی شەڕی پارتی پێشەنگ کە سەرهەڵدانە, لەسەر گەریلاش هەیە. جگە لەمە تیۆری دیکتاتۆری پرۆلیتاریا جێگای باسە. ئەمانە هەم دەکاتە زاراوە و, هەم دەیکا بەپرۆگرام و هەم لەمیانەی پارتێکی پێشەنگدا, دەیکاتە ئۆرگانیك و رێکیدەخات. تەنانەت ئەمە بەرەو بەدەوڵەت بوون دەبات. لەقۆناخی دواتردا ـ بەتایبەتی قۆناخی ستالین و دوای ئەویش, ئەمانەیان لەشێوەی پێشخستنی دەوڵەتدا پێکهێنا.

تەواوی ئەو شتانەی کە ستالین ئەنجامیدا بۆ پێشخستنی دەوڵەتی سۆسیالیستی بوو. ئەم ڕەوشە تائەو رادەیە پێشخرا یاخود تا ئەو رادەیە لەلایەنێکەوە بەبنەما وەرگیرا کە ئایدیۆلۆژیا لەنێو سیاسەت، تەنانەت لەنێو ئابووریدا توێنرایەوە. بەجۆرێك ئایدیۆلۆژیا و مۆراڵ وەکو هێزێك لەنێو پارتی و دەوڵەت لەنێو برا و بەلاوە نرا. لەکاتێکدا کە دەبوو دەوڵەت و پارتی بەلاوە بنرێت. " مارکس و ئەنگلس "یش پێوانەی ئەمە دادەنێن. سەرەتا دەوڵەت پێویستە، وەلێ پێویستە لەچوارچێوەی دەوڵەتیش دەربکەون و، هەروەها پارتی بەلاوە دەنرێت، وەلێ لەدوای ئەوەی کە بە ئامانجەکانی دەگات بەلاوە دەنرێت. لەڕاستیدا پارتی و دەوڵەتیش ئامرازی دەربازبوونن.

لەئەزموونی سۆڤیەتدا پارتی لەئارادا نەما و بوو بەدەوڵەت. ئایدیۆلۆژیا لەگۆڕەپانەدا نەهێڵرا، داخرایە ئاستی سیاسەتی دەرەوە و سیاسەتی ناوەوە. هەڵبەتە تواندنەوەی بەمجۆرەی ئایدیۆلۆژیا لەنێو سیاسەتدا مەترسی مەزن لەخۆوە دەگرێت. بێگومان ئەمەش دەرکەوتەڕوو ڕێگای لەپێش ڕەوشێکی وەها کردەوە کە سیستەمێکی بەسیاسی بوونی زەبەلاحی لەسۆڤیەت و تەنانەت لەئۆرگانی پارتی، ئۆرگانێکی دەوڵەت، هەروەها سکرتێرێکی پارتی وەهای پێکهێنا کە هێزی تەواوی بەسەر دونیادا لەدەست بوو، ئەمەش وایکرد بکەوێتە دوای سیستەمی سەرمایەداری و ئەمەش لەرێ لادان بوو.

بەڵێ، لەکوێوە سەیر بکرێت بابکرێت، ئەوا پێویست بەدەوڵەتێکی پرۆلیتاریا هەیە، وەلێ پارتییەك کە تا ئەو رادەیە خۆی بەدەوڵەت بوون بکات و بکەوێتە پێچەوانەی هۆی هەبوونی؛ بەواتای لەڕێ لادان دێت. لەسۆڤیەتدا ئەم ڕەوشە قووڵبۆوە و دەرئەنجامیش بەرەو بنبەستبوونی برد. ئەم بنبەستبوونەش بەشێوەیەکی سروشتیانە بەرەو هەرەسهێنان چوو.

ئەم ڕەوشەش هێشتا لەجیهاندا لەئارادایە. لەقۆناخێکدا هێمای جیهانێکی جیاکراوە لەنێوان سیستەمی سۆسیالیستی و سیستەمی ئیمپریالسیتی هەبوو. وای لێهات کە 70 ساڵ بەمجۆرە هەڵبسەنگێنرێت. جگە لەمە ئەو ماوەیە بە سەردەمی شۆڕشە پرۆلیتارییەکان ناوزەد کرا. لەدوای هەرەسهێنانی ئەزموونی سۆڤیەت، وانیشاندرا کە ئەو زاراوانە کۆتاییان پێدێت. دەستەواژەی سەردەمی شۆڕشە پرۆلیتارییەکان، دەستەواژەی دیکتاتۆری پرۆلیتاریا زێدە بەکار نەهێنرێت. تەنانەت ئەو دەوڵەتانەی سۆسیالیزمی بونیادنراو دایمەزراندبوون هەبوون، دەڵێن ئەمانەش تێپەڕ کراون.

لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا گفتوگۆ لەسەر ڕەوشێکی نوێ کە هاتۆتە ئاراوە، دەکرێت. هەرچەندە بەمە بگوترێ " سەرکەوتنی سەرمایەداری "، ئەوە زێدە ئەو سەرمایەدارییەی سەرەتای سەدەی رابردوو نییە. ڕەوشێکی زۆر جیاوازە و بێگومان هەوڵ دەدرێ دەرك بەم ڕەوشە بکرێت.

**"لەڕێگای بەدەوڵەت بوون سۆسیالیزم بەئامانجەکانی ناگات"**

پێویستە هەندێك لەکێشەکانی گۆڕینی سۆسیالیزم بۆ هێزێکی سیاسی, ببینرێت. بێگومان ئەگەر ئەم کێشانە چارەسەر نەکرێن, ئەوا ناکرێ سەرلەنوێ دابمەزرێنرێتەوە. هەڵبەتە سۆسیالیزمیش, وەکو هەر ئایدیۆلۆژیایەك, بەشێوەیەکی راست هەڵوەستە لەسەر کێشەی دەسەڵات دەکات.

ئایدیۆلۆژیاکان داخوازی بەدەوڵەت بوون, بەدەسەڵات بوون و جێبەجێ بوونن لەکۆمەڵگادا.

ئەمە پێداویستی سروشتی ئایدیۆلۆژیاکانە, وەلێ کێشەکە لەوەدایە کە تاکو کوێ و چۆن دەبێت؟ هەربۆیە کەس ناتوانێت سۆسیالیزم تاوانبار بکات لەوەی کە بتەوێت بەدەوڵەت ببێت. هەڵبەتە لەلایەن زەحمەتکێشانەوە دەخوازرێت بەدەوڵەت ببێت. خۆی لەخۆیدا یەکێك لەئامانجە سەرەکییەکانی ئەمەیە. وەلێ ئایا دەکرێ هەموو شتێك لەمیانەی بەدەوڵەتبوون چارەسەر بکرێت؟ لێرەدا کێشەکان دەردەکەونە روو. سۆسیالیزم لەڕێگای بەدەوڵەت بوون بەئامانجەکانی ناگات.

شتی راست ئەوەیە کە دەرك بەوە بکرێت, ئامانجی هەرە سادەی سۆسیالیزم بەدەوڵەت بوونە. راستە هەندێ ئامانجی سۆسیالیستی هەیە کە لەڕێگای دەوڵەتەوە جێبەجێ دەکرێت و, دەوڵەت لەپێناو سەرکوتکردنی دواکەوتوویی و پووچەڵکردنەوەی مەترسییەکانی ئیمپریالیستی دەرەوە, پێوست دەکات.

وەلێ چاوەڕوانی کردنی هەموو شتێك لەدەوڵەت, سۆسیالیزم بەرەو بنبەستبوون دەبات.

لەڕاستیدا ئەمە وەکو ئەوەیە کە هەموو شتێك لە " خودا " چاوەڕوان بکەیت. ئایینەکانیش لەسەرەتادا واتادار بوون و بەشێوەیەکی زۆر سەرنج راکێش وەڵامی هەموو پێداویستییەکیان دەدایەوە. دەوڵەت بەئایینەوە دەست پێدەکات و دەبێتە دەوڵەت. وەلێ دوای ئەوە یەکێك دەردەکەوێت, ئایین تەنیا بە " خودا " وە گرێدەدات و دەڵێت:" منم سێبەری خودا ". بۆیە سوڵتانێکی مۆنارشی, دەبێتە دەسەڵاتێکی رەهای وەها کە وێنەکەی نابینرێت. سۆسیالیزمی بونیادنراو هاوشێوەی ئەوەیە کە پێویستە ببێتە دەوڵەت و سەرەتا زۆریش دیموکراسییە و دوای ئەوە سکرتێرێکی گشتی بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتدار دەبێت و کاتێ لەگەڵ " ئەنتەرناسیۆنالیزم " یش بوو بەیەك, ئیدی بوو بەسەرۆك لەسەر ئاستی جیهان!

هەموو شتێك بەدەوڵەتەوە بوونی هەبوو و دەرئەنجام لەشوێنی " خودا " سکرتێری گشتی یاخود بیرۆی سیاسی دەرکەوتەڕوو.

بەڵێ, ئەمەیە لەڕێ لادان.

لەسەر ئەم بنەمایە, باسەیری ریزەکانی ناوخۆمان بکەین: ئەوکەسەی تاڕادەیەك دەسەڵاتی بکەوێتە دەست, سەرەڕای کوشتن و بڕین, دەسەڵاتداری لەسەر شتێك دەکات. دیاریکردنی

ئەمانە کە بەشێوەیەکی بەرجەستە لەلای ئێمەدا بەدی دەکرێن, بۆ ئەوە باس دەکەین کە ئەگەر دەسەڵاتێکی ئایدیۆلۆژی بێتە ئاراوە, ئەوا جێگای مەترسین. ئەم رەوشە بەشێوەیەکی بەربڵاو لەسۆڤیەت دەرکەوت و ئەوەی رێگای بۆ ئەمەش کردەوە, تاڕادەیەك دەگەڕێتەوە بۆ یەکەم شێوازی جێبەجێکردنی سۆسیالیستی.

لەڕاستیدا لەسۆڤیەتدا ئەوەی یەکەم جار جێبەجێ کرا, جێبەجێکردنێکی هۆڤیانەی سۆسیالیستی بوو و لەڕابردوودا هیچ نموونەیەکی لەوە نەبوو.

کاتێك کە فاکتەری دیکە لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی کەسێتی ستالین یەکانگیر بووەوە, رەوشێك دەرکەوتە روو کە دەوڵەت مەزن کرا و سۆسیالیزم لەچوارچێوەی سیاسەتی دەرەوە و ناوەوەی دەوڵەت و ئابووری دەوڵەت سنووردار کرا. ئەو خاڵەی کە پێی گەیشتن, ئەنجامەکەی ئەوە بوو کە: " سۆسیالیزم مەیسەر نابێت ".

دەکرێ بەرەنگێ تاوتوێ و گفتوگۆ لەسەر سۆسیالیزمی نوێ و پەیوەندی لەگەڵ سیاسەت بکرێت.

لەڕابردووشدا پەیوەندی سۆسیالیزم و سیاسەت, هەروەها پەیوەندی سۆسیالیزم و دەوڵەت تاوتوێ دەکرا. لەسەردەمی لینینش دا مەسەلەکانی دەوڵەت, دەسەلات و کێشەکانی ئەتنیکی و دیموکراسی زۆر شیکرانەوە و بەگوێرەی بنەمای چینایەتی گەلێك چارەسەری گونجاو دۆزرانەوە. بەگوێرەی ئەو قۆناخە ئەوە بەسیاسەتبوونێکی زۆر گرنگ بوو, تەنانەت یۆتۆپیای رزگارکردنی مرۆڤایەتی پێکهێنا. بەهۆی ئەو سەرنج راکێشانە مەزنەی کە خوڵقاندی, بەدرێژایی سەدەی بیستەم گرێدان و پەیوەندییەکی مەزن بۆ سۆسیالیزم نیشاندرا.

ئەمە بۆچی بەوجۆرە بوو؟ چونکە بەڕاستی چ لەلایەنی ئایدیۆلۆژی, چ لەلایەنی سیاسی دونیایەکی مەزنی هەبوو کە بیدات بەمرۆڤایەتی. هێندەی یۆتۆپیاکەی رەوشی پێکهێنانی جێگەی باس بوو, وەلێ لەڕێ لادرا.

چۆن لەڕێ لادرا؟

هەموو شتێك بۆ بەرژەوەندی سۆڤیەت, لەنێو بەرژەوەندی سۆڤیەت هەموو شتێك لەپێناو بەرژەوەندی روسیا, لەنێو بەرژەوەندی روسیاشدا, هەموو شتێك بۆ بیرۆکراسی, لەنێو بەرژەوەندی بیرۆکراسی, هەموو شتێك لەپێناو بەرژەوەندی پارتی, لەنێو ئەویشدا لەپێناو بەرژەوەندی ناوەند, بیرۆی سیاسی و سکرتێری گشتی بوو. دەرئەنجام خواستر تەواوی مرۆڤایەتی بۆ خزمەتی گرووپێکی هەڵبژاردە بەکار بهێنن.

خواستیان بەوجۆرە سۆسیالیزم بەکار بهێنن, وەلێ بێگومان ئاشکرا بوو کە لەتوانایدا نییە بەڕێوە بچێت و سەر ناگرێت. خۆی لەخۆیدا گەوهەری سۆسیالیزم پێچەوانەی ئەوە بوو, هەربۆیە هەڵوەشانەوە زۆر خێرا روویدا. ئەوەش بەرەنگێك روویدا کە کەس چاوەڕوانی

نەدەکرد و پەی پێنەدەبرد. لەبەر ئەوەی ئەو پێشکەوتنانەی هاتنە ئاراوە بەرادەیەکی زۆر دژی گەوهەری سۆسیالیزم بوو, بۆیە شیمانەی هاتنە ئارای ئەم رەوشە هەبوو. پێویستە لامان سەیریش نەبێت کە ئەگەر لەرۆژێکیشدا هەرەسی هێنا! چونکە بەشێوەیەکی سروشتیانەش دەبوو بەوجۆرە بێت. لەم میانەشدا پێویستە ئەوە دیاری بکەین کە دەسەلاتە رەهاکەشی زۆر چەوسێنەرانە بوو.

ئەو لەرێ لادانە زۆر مەترسیدار بوو. تەنانەت لەنێو ئێمەشدا لەسەرەتادا تاك هیچ نییە, وەلێ کاتێك دەسەلاتی پارتی دەکەوێتە دەست, دەبێتە درندەیەك. من لەنێو پارتیەکەشماندا بەسەدان نموونەی لەوجۆرەم بینیوە. لەسۆڤیەتیشدا ئەمە هەندێك زیاتر بەشێوەیەکی مۆدێرن گشتگیرتر بوو. لەم رەوشەدا ئەوەی پێویستە, ئەوەیە کە دەبێ بەشێوەیەکی زۆر راست و دروست تێگەیشتن لە پەیوەندی سیاسەت, پەیوەندی هێز ــ دەسەلات لەگەلٚ ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیستی دروست ببێت و لێك جیا بکرێتەوە.

چۆن دەکرێت بەراستی و دروستی بەدەستەوە بگیردرێت؟

پێویستە ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت خراپ نەکرێت. ئایدیۆلۆژیای راست و رەوان بەتێروانینی زۆر باشەوە بەدی دێت.

پێویستە سیاسەت نەکرێتە ئامرازی بەرژەوەندی چینێکی تەنگ یاخود گروپێکی بالادەستی سیاسی, تەنانەت بۆ بەرژەوەندی چینێکیش کە ئەمرۆ جێگای باسە, هەروەها پێویستە نەخرێتە خزمەتی بەرژەوەندی تاکەکەسێك یان گروپێك.

بۆ ئەمەش چی پێویست دەکات؟

پێویست بەئۆرگانێکی ئایدیۆلۆژی هەیە.

رەنگە ئەمرۆ زۆر پەسندیشی نەکەین, ئەو رژێمە مەلایانەی کە ئاماژەمان پێکردووە لەئێراندا " دەزگایەکی ئایەتولا " هەیە. هێزی ئەوەی هەبوو کە هێزێکی زەبەلاحی سیاسی وەکو " شا " بگۆرێ و هەموو هێزی ئەویش ئایدیۆلۆژیا بوو. لەبنەمادا " ئایەتولا " ئۆرگانێکی ئایدیۆلۆژییە. ئایەتولاکان کاروبارەکانیان لەرێگای ئایدیۆلۆژیایەوە بەرێوە بردووە, هەلبەتە ئێستاکەش دەتوانن تادوارادە بەکاریگەر بن.

بەلێ لەسۆسیالیزمی بونیادنراودا ئەمە لەئارادا نەبوو. ئۆرگانی ئایدیۆلۆژی چ لەلایەنی راگەیاندن, چ لەلایەنی گوتەبێژیدا, چ لەلایەنی ئایدیۆلۆگەکانی, ( ئەو کەسانەی کە ئایدیۆلۆژی دەخولقێنن یاخود تاوتوێ دەکەن ), گرنگی خۆی لەدەست دا. تەواوی ئایدیۆلۆگەکان بوونە توتی سادەی دەولەت لەسۆڤیەتدا, بەگوتنی:" ئەمەیە بەرژەوەندی ناوخۆیی, ئەمەش بەرژەوەندی دەرەوەیە", بانگیان لەهەر کەسێك دەکرد کە ببنە ئامرازی درۆ. لەئەنجامدا بەمجۆرە ئایدیۆلۆژیان بەرەو خیانەتکردن برد.

هەروەك دەزانرێت ئایدیۆلۆژییای سۆسیالیزم تەواوی مرۆڤایەتی لەخۆوە دەگرێت. لەڕاستیدا ئایەتولاَکانی ئێرانیش دەڵێن:" ئێمە نەك تەنیا بۆ ئێران, بەڵکو بۆ تەواوی مرۆڤایەتی بیر لەئیسلام دەکەینەوە ". و دەشتوانێ ئەم زایەڵەیەش بدۆزێتەوە. سەرەتا لەسۆڤیەتیشدا " ئەنتەرناسیۆنالیستیش " بۆ تەواوی مرۆڤایەتی بوو, وەلێ دوابەدوای ئەوە بەتەواوەتی گۆڕا بۆ بەرژەوەندی سۆڤیەت, بەرژەوەندییەکانی روسیا یاخود بەرژەوەندی گروپێکی سیاسی بالاَدەست.

بۆ ڕێگەگرتن لەمە بەدڵنیاییەوە پێویست بە ئایدیۆلۆژیایی بوون هەبوو لەسەر ئاستی نەتەوەیی و نێونەتەوەییدا. خواسترا ئەمە لەڕێگای ئنتەرناسیۆنالیزمەوە چارەسەر بکرێت و ئەنتەرناسیۆنالیەکان پێکهێنران. وەلێ دیسان ئەزموونی سۆڤیەتیان لەڕەوشێکی بەوجۆرە رزگار نەکرد.

ئێمە نالێین سەبارەت بەم بابەتە هیچ رۆڵێکیان نەگێڕا, وەلێ ئەنجام لەڕێ لادان و هەڵوەشانەوە بوو.

کەواتە دەبێ ئەمە دەربخرێتە روو کە واتا و پێداویستی ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزم لەسیاسەت جیاوازە. بۆیە پێویستە نەبێتە ئامرازی بەرژەوەندییەکانی دیکتاتۆریەت و گروپێك, بەڵکو پێویستە لەکەسێتی زەحمەتکێشان سەبارەت بە ئاییندەی تەواوی مرۆڤایەتی رۆڵ بگێڕێت.

پێویستە سۆسیالیزم بەبەردەوامی لەسەر پەیوەندی خۆی لەگەڵ مێژوو, ئاییندە, یۆتۆپیا, زانست, ئاستی پێکهێنان, ئامانجەکانی پێشکەوتنی پێشبینی کراو, بیر بکاتەوە, گفتوگۆ بکات و لەبەرچاو بگرێت, بەم شێوەیەش ئاراستەیەکی وەها بگرێت کە بتوانێت رۆڵی مێشکێکی راستەقینە بگێڕێت, پێویستە گرێدراوی نەتەوەیەك و چینێکی تەنگ نەبێت, بەڵکو پێویستە گرێدراوی ئەو چینانەی نوێنەرایەتی رەنج دەکەن ببێت و ـــ بەرێژەی پەیوەندییان بەمرۆڤایەتییەوە یاخود پتەوکردنی ماف و پێشکەوتن لەکەسێتی ئەواندا پێویستە وەکو ئۆرگانێکی دانەبڕاو بەپابەندبوون لەڕوانگەیەکی چینایەتییەوە خۆ پێشبخات. پێویستە خۆی وەکو ئۆرگانێکی بەکاریگەر ببینێت, بەشێوەك کە بێ چاوپۆشیکردن لەڕاستینەی نەتەوایەتی, خۆشی بەتەنیا لەنێو بەرژەوەندییەکی نەتەوەییدا نەخنکێنێت, بەچەشنێکی دادوەرانە لەهەر نەتەوەیەك نزیك بێت ـ کە بەمە دەگوترێت مافی دیاریکردنی چارەنووس لەلایەن نەتەوەکانەوە ـ هەروەها بتوانێت دیموکراتی ببێت, دەسەلاَت بەتەنیا لەبەرژەوەندی تاقمێك نەبینێت, هەروەها بۆ لابردنی ئۆرگانە داگیرکەر و ناڕەواکانی دەوڵەت کە ئامرازی دەستەڕۆیی و بالاَدەستییە, بەهەمان رادەش گەیشتن بەوەرچەرخان بەشێوازی سەرلەنوێ رێکخستنەوە

بەبنەما بگرێت و بیر لەگەڵێك رامانی دروست و هاوشێوە و, پرۆژە و بنەما ئەخلاقییەکان بکرێتەوە.

مرۆڤ تەنیا رووداوێکی پێشکەوتن و رابوون نییە. سۆسیالیزمی بونیادنراو لەژێر ناوی پێشبڕکێی سەرمایەداریدا, مرۆڤیان گۆڕی بۆ ئەو ئاژەڵەی کە بەبەردەوامی دەخوات ــ دەخواتەوە. هەربۆیە لەکاتی هەڵوەشانەوەی سۆڤیەتدا هەموو کەسێك هێرشی دەبردە سەر دووکانەکان. تەنانەت تایبەتمەندی سەرەکی مرۆڤی سۆڤیەت گەیشتۆتە رەوشێك کە لێرە و لەوێ تەنیا پێداویستییە خواردەمەنییەکان دەستەبەر بکات. بەڵێ, پێشکەوتنی ئابووری پێویست دەکات, وەلێ لەبەرچاوی مرۆڤەکان بەتەواوەتی نزیکبوونی وەکو " هەموو شوێنێکم پڕ بکەن لەخواردن ـ خواردنەوە, وەکو ئاژەڵ رەفتار بکات", بەواتای سۆسیالیزم نایەت.

بەڵێ, لایەنێکیش کە پێویستە بۆ سۆسیالیزم, لایەنی مۆراڵە. لەڕاستیدا ئایینەکانیش دەڵێن:" مرۆڤ بەتەواوەتی بەمۆراڵەوە و بەگوێرەی پرەنسیپی پیرۆز دەژی ", وەلێ ئەگەر بەتەواوەتیش بەمجۆرە نەبێت, ئەوا لەڕاستیدا بوونی مۆراڵ مەرجێکی دەست لێبەرنەدراوە. هەڵبەتە چەندە هەوڵیش بدەیت لەلایەن ماددییەوە مرۆڤ تێر بکەیت, دیسان تێر نابێت. بەڵێ تێکدانی سروشت, مشەخۆرکردنی کۆمەڵگا, مرۆڤی تووشبووی شێرپەنجە, دەگەڕێتەوە بۆ قاڵبەکانی کۆمەڵگای مشەخۆر.

ئەمڕۆ ئەوەی لەوڵاتە سەرمایەدارەکانی ئەوروپا پێشکەوتووە, پێشکەوتنی کۆمەڵگای مشەخۆرییە. تا ئەو رادەیە بوونەتە کۆمەڵگایەکی مشەخۆر, ئیدی سروشت بەرگە ناگرێت, ئیدی سنوورەکانی کۆمەڵگای مشەخۆر هەروەکو چۆن لەدونیادا تەنگ بووە, هێشتاش هەر بەردەوامە. لەسەر ئەمانەش شێرپەنجەبوون دەست پێدەکات. لەڕاستیدا ئەوەندەی شێرپەنجەبوون, لەنەخۆشی شێرپەنجە سەرچاوە بگرێت, ئەوا بەشێوەیەکی گشتیش شێرپەنجە بوون هەیە. هاوشێوەی ئەمە گەلێك نەخۆشی نەتەوەییش بەشێوەیەکی بەربلاو پێشدەکەوێت. تەواوی ئەمانە لەلایەنی مشەخۆریدا بەرەوپێش دەچێت, بەڵێ زێدەڕۆیی زایەندیش رێگا لەپێش AIDS دەکاتەوە. AIDS نەخۆشییەکە و لەسنوورەکانی کۆمەڵگای مشەخۆردا بەرەوپێش دەچێت. دڵەڕاوکێ و سترێس ( STRES ) هاوشێوەی ئەم دیاردانە کە سەریانهەڵداوە رێگا لەپێش رەوشێکی وەها دەکاتەوە. تەنانەت لەئاییندەشدا نەخۆشی نوێ پێشدەکەون. چونکە هێزی بەرخۆدانی ( بەرگری ) مرۆڤ لەبەرامبەر سنوورەکانی کۆمەڵگای مشەخۆر لەناو براوە.

شتی بەمجۆرە لەقۆناخەکانی دیکەی مێژوودا هەبوون بۆ نموونە: پەتا کۆمەڵایەتییەکان و... هتد هەروەها ناوبەناو ئەو نەخۆشییانە کە بەشێوەیەکی بەرفراوان بڵاو بۆتەوە و

بینراوە. تەواوی ئەمانە گرێدراوی داروخانە کۆمەڵایەتییەکانن. کاتێك کە هێزی بەرگری لەناوبرا ـ کە ئەمەش هێزی مۆراڵە ـ مرۆڤ هەڵدەوەشێتەوە.

گەلی ئێمەش بەتەواوەتی وەکو شێرپەنجەیەکە چونکە هێزی مۆراڵ و بەرگریکردنی رووخێنراوە. هەموو جۆرە نەخۆشییەك هەیە. بێگومان بۆ ئەوەی بڵێیت:"ئەم مرۆڤانە خاوەن تەندروستی باشن، ئەوا هەزار شاهید پێویست دەکات ". لەڕاستیدا من هەموویان بەنەخۆش دەبینم و هەموو هەوڵدانی شۆڕشگێڕیشم بۆ ئەوەیە کە تووشی ئەو نەخۆشییە نەبم. ئەگەر بشم کوژن، وەکو ئەو مرۆڤانە ژیان بەسەر نابەم. لەلایەنی مۆراڵ و رۆحدا نەخۆشن و هەروەها لەلایەنی فیزیۆلۆژیشدا نەخۆشن. هەربۆیە لایەنێکیان نەماوە کە دەستیان بگرین، لاواز و بێکاریگەرن. نەخۆشن و مۆڕاڵیشیان سفرە. هەروەها زمان و کولتووریان شێوێنراوە و لەناو براوە. ئەو کۆمەڵگایەی کە ئەوەندە تووشی نەخۆشی هاتبێت، یەکێك بڵێت:" دەتوانم بژیم"، دەبێتە کەسێکی لەڕێ لادەر.

بەڵێ، کێشە سەرەکییەکان ئەمانەن و چۆنێتی دەربازبوون و بەلاوەنانی ئەمانە لەسۆسیالیزمدا دەکەوێتە نێو رۆژەڤەوە. بێگومان ئاشکرایە کە ئەو رەوشانە بەڕێگای وەکو سۆسیالیزمی بونیادنراو ناکرێ چارەسەر ببێت. ئەگەر وەکو سەرمایەداری تەنیا زك تێرکردن بەبنەما وەربگرێت، ئەوا مرۆڤێك دەخولقێنێت کە لەو مرۆڤەی سەرمایەداری دروستی کردووە، پاشکەوتووتر بێت. ئەم راستییە لەسۆسیالیزمی بونیادنراودا دەرکەوتەڕوو. بێگومان ئەگەر مۆراڵ بڕووخێنی، دیموکراسی پێشنەخەیت، هەلومەرجی دواکەوتووتر لەسەرمایەداری دێتە ئاراوە و تۆ لەدواوە بەجێ دەهێڵێ.

هۆکاری سەرەکی ئەمەش، هەروەکو ئاماژەمان پێکرد، دەگەڕێتەوە بۆ پێشنەخستنی مۆراڵ و دیموکراسی لەسۆسیالیزمی بونیادنراودا و دەربازنەکردنی سنووری مشەخۆرییەکان و زیادەڕۆیی سەرمایەداری. هەربۆیە سۆسیالیزمی بونیادنراو کەوتۆتە رەوشێکی ناکۆك بەئایدیۆلۆژیاکەیەوە.

ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزم مسۆگەر یاسا و رێساکانی سەرمایەداری بۆ مرۆڤایەتی بەبنەما لەقەڵەم نادات. ناتوانێ بڵێ " سەرمایەداری هێندە دەبەخشێ، منیش هێندە دەبەخشم ". تۆ هەندێ شت نابەخشیت وەلێ هەندێ شتیش کە بوونیان نییە دەبەخشیت. پێویستە لەمە بکۆڵنەوە و بیدۆزنەوە، دۆزینەوەی ئەمە کێشەی سۆسیالیزمە. سەرمایەداری ژینگە و دەوروبەر و سروشت پیس دەکات و کۆمەڵگا تووشی شێرپەنجە دەکات. تۆش بۆ رێگەگرتن لەمە چارەسەرییەکان دەدۆزیتەوە. ئەگەر نا لە ژێرناوی "لەسەرمایەداری زیاتر بەرهەم دەهێنم" سروشت و ژینگە و دەورووبەر پیس بکەیت، مۆڕاڵ و دیموکراسی بخنکێنێ، هەروەکو

چـۆن ئەمـە نابـێ بەسۆسـیالیزم، لەهەمانکاتـدا نابـێ بـەکاریکاتێری سۆسـیالیزمیش و، دەرکەوتۆتە رووش کە نابێتە سۆسیالیزم.

بەدڵنیاییەوە سۆسیالیزم پێویستییەکە.

هەرچـەندە کـە چـینی چەوسـێنەری باڵادەست و نوێنـەرەکانیان لـەرۆژگاری ئەمرۆمانـدا هاوشێوەی قۆناخی کۆیلەداریّتی و چاخە ناوینەکانیش مابنەوە و، ئەو ئاژەڵانەی کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد لەداهاتوودا دەردەکەون، بەڕەنگێك کە ناتوانرێ لەگەڵ چاخەکانی رابـردوو، بەراورد بکرێ.

هەربۆیـە هـەر لەئێسـتاوە ئـەم ئاژەڵانـە سـەریانهەڵداوە و مرۆڤایـەتی هەڵدەلوشـن. بۆیـە هـەروەکو چـۆن بیریـاران لەسـەرەتاوە گوتیـان: "چارەسـەری لەبەرامبـەر سـەرمایەداری، سۆسـیالیزمە"، بەبانگەشـەیەکی مـەزن و لـەپێناو ژیانێـك کـە مـۆراڵ تێیـدا باڵادەسـت ببێـت، شەڕیان بۆ ئەمە کرد، ئەوا تۆش دەبێ بەهەمان شێوە بیت.

لەرۆژگاری ئەمرۆماندا دەبێ لەبەرامبەر ئەم ئاژەڵەی کە پێشکەوتووە، بەسۆسیالیزمێکی کاریگەر وەڵامی بدرێتەوە. ئەمـە وەڵامێکی چۆنە؟ هەڵبەتـە بـە ئاسانی دەدرێتـەوە. چونکە مشـەخۆری و سـنوورەکانی تێکدەرانـەی سـەرمایەداری ئـەوە نییـە کـە نـەتوانرێت چارەسـەر بکرێت. وەلێ ئەمـە پێویستی بەتێکۆشـان و تێکۆشـانی مـوراڵ هەیـە. هـەروەها پێویستی بـە سەرلەنوێ رێکخستنەوە و، پرۆگـرام هەیـە. بـۆ ئەمـەش دەبـێ گفتوگـۆی گـەرم و گـوڕ ئـەنجام بدرێت. ئەگەرنا گوتنی " سۆسیالیزم هەڵوەشایەوە و هـەروەها ئیفلاسـبوونی خـۆی سـەلماند"، خـۆی لەخۆیـدا هێرشـەکانی ئایـدیۆلۆژی سـەرمایەداری نیشـان دەدات و ئـەوەی ئێسـتاکەش بەربڵاوە، ئەم رەوشەیە.

سەرمایەداری هەوڵدەدات بۆ ئەوەی ئەو تاوانبارێتییەی کـە سۆسـیالیزم ئـەوی پـێ تاوانبـار دەکات لەسەر خۆی لا ببات و خۆی بێ تاوان نیشان بدات.

لەڕاسـتیدا سـەدەی بیسـتەم بەلێپرسـینەوەیەکی گـران و قـورس تێپـەڕ و مـەحکوم کـرا. بەڕاستیش تێپەڕکردنی ئەوە هێندە زەحمەت نییە. بەڵام بەهۆی ئەو هۆکارانەی دەزانرێت و تاڕادەیـەك بـەهۆی ئـەوەی کـە لەگـەڵ سـەردەمدا نـەیتوانی خـۆی بگونجێنـێ و، نـەیتوانی سەرمایەداری مەحکوم بکات و بەئەنجام بگات، تەمـەنی سـەرمایەداری تاڕادەیـەك درێـژ بـۆوە، وەلێ باکەس پێی وانەبێت کە سەرمایەداری رەوشێکی باشـتر و تۆکمـەتر لەسـەرەتای سـەدەوە بەخۆوە ببینێ. پێشتر دەگوترا کە " پێش ئەوەی سەرمایەداری بگاتە کۆتایی سەدەی بیسـتەم، لەناو دەچێ و تەنانەت دەگەین بـە کۆمـۆنیزم"، ئـەم گوتەیـە خـۆی لەخۆیـدا مەزنکردنێکـە. لەڕاسـتیدا ئەمـە شـێوەی لـەڕێ لادانـی یۆتۆپیایـەك بـوو. چـونکە لەلایەکـدا سۆسـیالیزمی بونیـادنراو گوزارشـتی لـە جـێ و شـوێنی دواکـەوتوویی خـۆی لەئاسـت سـەرمایەداری دەکـرد،

لەلایەکی دیکەشدا بانگەشەی دامەزراندنی کۆمۆنیزمی دەکرد. دەکرێ لەڕاستینەی سۆسیالیزمی بونیادنراودا ئەم لەڕێ لادان و مەزنکردنە ببینرێ.

لەڕاستیدا پێویستە لەبەرامبەر سەرمایەداری تێکۆشانێکی درێژ مەودا ئەنجامبدرێت.

بیریار و پسپۆران دەیانگوت کە ئەم تێکۆشانە سەدان ساڵ درێژەی دەبێت, بەڵام مێژووی سەرمایەداری هەرچۆنێك بێت, خۆی لەهەزار ساڵ دەدات.

پێویستە لەمە نەسڵەمینەوە, چونکە بەستنەوەی هەر شتێك بەدەیان ساڵێك لەمێژووی سۆسیالیزمدا, شتێکی ناشیاوە.

دەڵێین مێژووی سۆسیالیزم هێندەی مێژووی مرۆڤایەتی کۆنە و, ئاییندەشی بەم شێوەیە بەردەوام دەکات. بەڵام کاتێ دەڵێین ئەمە بەمجۆرەیە, ناتوانین لەبەرامبەر سەرمایەداری ئەمڕۆ بەبێ ئایدیۆلۆژی, یاخود بەبێتێکۆشان و شەڕی دەسەڵات بمێنینەوە. بەڵام ناچارین چۆنێتی ئەوتێکۆشانەی کە بەڕێوەی ببەین, هەروەها شێواز و تاکتیکە سەرەکییەکانی دیاری بکەین.

لەبەر ئەمە پێویستە رۆژانە گفتوگۆ لەسەر سۆسیالیزم بکرێت. ئەم گفتوگۆیانە سەرەتا دەبێ ئەو کێشانەی کە سەرمایەداری بەسەر مرۆڤایەتیدا سەپاندوویەتی, بەدەستەوە بگرێت. واتە پێویستە گفتوگۆکان, رێگا لەبەردەم پێشکەوتنی سەرمایەداری بگرێت کە مرۆڤایەتی و بەتایبەت گەلانی بندەست و چینە چەوساوەکان بەرەو لەناوچوون دەبات. هەروەها سروشت بەگشتی لەناودەبات و تەنانەت لەنێو کۆمەڵگا سەرمایەدارەکانیشدا کاولکاری بەمەرەنگە دێنێتە ئاراوە. بەکورتی لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا پێویستە گفتوگۆیەکی بەرفراوان لەسەر "چۆنییەتی سۆسیالیزم" لەدوای هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو ئەنجام بدرێت. واتە قۆناخێك بەسەر چوو, لەجێگای ئەو چۆن دەتوانرێت قۆناخێکی جیاواز دەستپێبکات؟ پێویستە ئەمانە لەڕێگای گفتوگۆوە روونبکرێتەوە.

ئەگەر سەرنج بدەین, لەمێژووی سۆسیالیزمدا گەلێك گفتوگۆی مەزن هاتۆتە ئاراوە, تەنانەت لەموسڵمانێتیشدا گفتوگۆکانی نێوان (عەلەویگەری ـــ سونیگەری) لەخاڵێکدا لەگفتوگۆکانی سۆسیالیزم ـــ سەرمایەداری دەچێت. هەروەکو چۆن سونیگەری بەدرێژایی مێژوو, وەکو شێوازی دەوڵەتێکی فەرمی و باڵادەست, عەلەویگەری سنووردار کردووە و کردوویەتی بەمەزهەبێك و ئەو مەزهەبەش هانای بۆ چیا بردووە, لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا سۆسیالیزمیش لەلایەن سەرمایەداری فەرمییەوە بەمجۆرە سەرکوت دەکرێ, دەکرێت بەمەزهەب و دەخوازرێ بەپێی حوکمێ بەکۆمەڵگا نیشان بدرێت کە گوایە ئەمە کۆن بووە, بێ نرخ و بەهایە و, ناکرێت بکەوێتە بواری ژیانەوە.

هەروەکو چۆن خواسترا عەلەویگەری، کە دەتوانرێت بەسۆسیالیزمی ئیسلام ناوزەد بکرێت، بەدەوڵەتەوە پابەند بکرێت و، لەگەوهەری شۆڕشگێڕی بەتاڵبکرێت، ئەوا سەرمایەداریش بەهەمان شێوە لەهێرشێکدایە بۆسەر سۆسیالیزم. سەرمایەداری لەڕێگای ئەو هێرشەوە هەندێ سەنگەری بەدەست خست و دەیەوێت بەهۆی ئەمەشەوە ئەو سۆسیالیزمەی لەئارادایە بەخۆیەوە گرێبدات. لەڕاستیدا تاڕادەیەك بەخۆیەوە گرێیداوە، بۆ نموونە هەروەکو چۆن هەندێ لەنوێنەری عەلەوییەکان کەوتنە خزمەت دەوڵەتەوە، بەهەمان شێوە لەتورکیادا تەواوی کادێرە کۆنە سۆسیالیستەکان کەوتنە خزمەتکردنی سەرمایەداری. تەنانەت دەخوازرێ لەنێو ریزەکانی PKKشدا هەندێ کەس بخرێتە خزمەت دەوڵەتەوە.

ئەم رەوشە بەدرێژایی مێژوو بەمجۆرە بووە و لەڕۆژگاری ئەمرۆشماندا بەمجۆرەیە. وەلێ کە دەگوترێ بەمجۆرەیە، ئێمە هەروەکو چۆن ناتوانین شۆڕشی ئیسلام، ئەو لایەنانەی دژ بەداگیرکاری و ستەمکارییە لەبەرچاو نەگرین، بەهەمان شێوەش ناکەوینە رەوشێکی وەها کە ئەو لایەنانەی سۆسیالیزمی بونیادنراو نەبینین، کە لەدژی داگیرکاری جیهانی، ستەمکاری و تەنانەت لەدژی هەر مەترسییەکی هەمە لایەنەیە کە رووبەڕووی مرۆڤایەتی دەبێتەوە. لەرەوشێکی بەمجۆرەدا بێگومان هەندێ کار هەن کە دەتوانرێ ئەنجام بدرێت.

**"ئەنتەرناسیۆنالێکی نوێ، سۆسیالیزم زیاتر بەرەو پێش دەبات"**

دەکرێت سۆسیالیزم، هەروەکو چۆن لەمێژوودا وابوو، بکەیەنرێتە گوزارشتێکی زانستییانەی هەرە پوخت و پاراو و بەهەڵسەنگاندنی رۆژگاری ئەمرۆمان، دەبینین ئەو دوو کامپەی کە لەڕابردوودا لەئارا دابوو، دووچاری هەڵوەشانەوە هاتن. ئێستا باس لەکامپی باشوور، باکوور دەکرێت. یان بەشێوەیەکی تر ناوی لێدەنرێت. هەرچی مرۆڤایەتی هەبێت بەنەتەوە، چین و توێژە چەوساوەکانیشەوە ــ کە تاڕادەیەك وەکو سیستەمێك خۆی بەڕێوەبردبێت و ناڕەزایەتی خۆی لەدژی سەرمایەداری دەربڕیبێت ــ پێویستە بەشداری هەریەك لەو لایەنانە تێیدا ببینرێ. بەم شێوەیەش یەکەمین ئەنتەرناسیۆنال لەمێژووی سۆسیالیزمدا؛ کە نەتەنیا بۆ نەتەوەیەك خوازیاری سەرکەوتن بوو، بەڵکو دامەزراندنی یەکێتی کرێکارانی هەموو نەتەوەکان یاخود لەمەش زیاتر ئاواکردنی یەکێتییەکی ئایدیۆلۆژی بوو، لەڕاستیدا ئەمە بەو شێوەیە سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

ئەنتەرناسیۆنالی دووەم خاوەنی دامەزراوێك بوو کە دەیخواست تاڕادەیەك بەکۆمەڵایەتی بێت و دەسەڵات بەدەست بێنێ، وەلێ نەیتوانی لەمەدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێت و لەڕاستیدا ئەمەش بووە هۆی لەناوچوونی. لەشوێنی ئەمە، ئەنتەرناسیۆنالی سێیەم بونیادنرا، ئەنتەرناسیۆنالیزمێك بوو کە سۆسیالیزمی بەدەوڵەت کرد. وەلێ ئەویش بەدەوڵەت بوونی

بەخراپی بەکار هێنا و, لەبەر ئەوەی پەیوەندی دەوڵەت و سۆسیالیزمی بەشێوەیەکی راست چارەسەر نەکرد, تووشی هەڵوەشانەوە بوو.

هەربۆیە ئێستا پێویست بەدامەزراندنی ئەنتەرناسیۆنالێکی نوێ دەکات. هەڵبەتە ئاستی ئەو گفتوگۆیانەی کە لەئارادایە و ئەنجام دەدرێت, تادێت ئەمە زیاتر بەرۆژەڤ دەکات.

ئایا پێویست بەئەنتەرناسیۆنالێکی سۆسیالیستی چۆن دەکات؟

ئەو ئەنتەرناسیۆنال سۆسیالیستەی کە ئاوا دەکرێت, پێویستە سۆسیالیزمێکی وەها لەبەرچاو بگرێت کە رەوشی مرۆڤایەتی بەگشتی لەئاستی گەردوونیدا و, هەر نەتەوەیەك, تەنانەت هەر کیشوەرێك, هەر ناوچەیەك تێبگات و بەرنامە داڕێژراوتر بێت و, تەنانەت سۆسیالیزمێکی وەها بێت کە ئاگاداری رەوشی هەر نەتەوە و رەوشی چینایەتی و ناوخۆیی ئەو نەتەوەیە بێت. واتا ئەمە مانای قۆناخێکی سەرلەنوێ بونیاد نانەوەیە و خەباتێکی بەمجۆرە لەخۆوە دەگرێت. لەڕاستیدا ئەمە پرەنسیپی سۆسیالیزمە. لەکاتێکدا لەجێگایەك قۆناخێك بەئەنجام دەگات, ئەوا دەتوانرێ لەجێگایەکی دیکەدا قۆناخێکی تر ئەنجامگیر بکرێت.

بۆ نموونە لێرەدا دەتوانرێت گەلێك قۆناخ بژمێردرێت, قۆناخی یەکێتی ئایدیۆلۆژی, قۆناخی بەدەوڵەت بوون, قۆناخی یەکەم ئەزموون و رووخانی لەئەنجامی کێشەکانی, وە هەروەها قۆناخی هەنگاونان بەرەو سۆسیالیزمێکی تۆکمە و پتەوتر. پێویستە چاوپۆشی و نکۆڵی لەمانە نەکرێت و, ئەمانەش رەوشێکی بەردەوام لەخۆوە دەگرن.

شتی گرنگ ئەوەیە کە رۆژانە سۆسیالیزم بەشێوەیەکی دروست بگیردرێتە دەست. دەکرێ ئەمانە بەهێڵی پانی وەك پەیوەندییەکانی نێوان سۆسیالیزم و دەوڵەت, سۆسیالیزم و رابوون, سۆسیالیزم و مۆراڵ, سۆسیالیزم و کێشەی نەتەوەیی, سۆسیالیزم و کولتوور, سۆسیالیزم و ئابووری, سۆسیالیزم و سۆسیالیزمی بونیادنراو, سۆسیالیزم و یۆتۆپیا, سۆسیالیزم و زانست, سۆسیالیزم و ئایین, سۆسیالیزم و خێزان, سۆسیالیزم و ژن, سۆسیالیزم و ماڤی دیاریکردنی چارەنووسی گەلان, سۆسیالیزم و دیموکراسی, سۆسیالیزم و پارتی, ریزبەندبکرێت. دەکرێ تەواوی ئەمانە, سەرلەنوێ بخرێتە بەرباس و لێکۆڵینەوە. واتا پێویست دەکات ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزم سەرلەنوێ خۆی بەزاراوە بکات و, وردەوردە شیکردنەوەی ئەم زاراوانە بکرێتە پرۆگرام, لەدوای بەپرۆگرام کردنیشی سەرلەنوێ رێکبخرێت و بخرێتە واری کردارییەوە. پێشکەوتن تەنیا لەرێگای ئەم قۆناخەوە بەدیدێت. بەڵکو ئێستا رەوشی بانگەشەیەکی مەزن لەئارادا نەبێت, وەلێ هەندێ گفتوگۆی بەرتەسك و کەم و سادەش هەیە و, تادێت, دەکرێ ئەنتەرناسیۆنالی چوارەم و پێنجەمیش هاوشێوەی ئەنتەرناسیۆنالەکانی یەکەم و, دووەم و سێیەم, پێشبکەوێت.

لەکاتێکدا کە ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزم و بەدەسەڵات بوونی, بەسیاسی بوونی بەدەستەوە دەگرین, ئەوا ئێستا دەتوانین ئاوڕ لەراستینەی خۆمان بدەینەوە, با لێرەدا زاراوەی سیاسەتیش روونبکەینەوە. پێم وایە خاڵێ کە هەرە زێدە تێیدا تەنگەتاو دەبن, سیاسەتە. لەبەر ئەوەی ئێوە دەرکتان بەزاراوەی سیاسەت نەکردووە, بۆیە زێدە لەو ڕەوشەی کە پێی دەگوترێت رەوشی سیاسی, تێناگەن. لەڕاستیدا سەبارەت بەئایدیۆلۆژیاش رەوش بەمجۆرەیە. من, هەوڵمدا زاراوەی ئایدیۆلۆژیا شیبکەمەوە. رادەی تێگەیشتنتان لەو بابەتە, بەگوێرەی خۆتان ئەزموون دەرخستن لێی و, هەروەها ئاستی ئایدیۆلۆژیتان لەپێشکەوتنی هەر کام لەئێوەدا بەدیدەکرێت, وەلێ زۆر بەڕاشکاوی ئەمەم گووت کە, بەبێ دەستەبەرکردنی پێشکەوتنی ئایدیۆلۆژیانە ناتوانن خۆتان لەئاژەڵبوون رزگاربکەن. جگە لەمە ئەگەر ئەم کۆمەڵگایەش خۆی نەکاتە خاوەن ئایدیۆلۆژیا, ئەوا لەپەرتەوازەیی رزگاری نابێت. کۆمەڵگایەکی بێ ئایدیۆلۆژیا, مسۆگەر کۆمەڵگایەکی دواکەوتوو, نەخۆش و هەڵوەشاوەیە. بۆ تاکە کەسێکیش هەر بەمجۆرەیە کاتێك پێناسەکرا و پێداویستییەکان دیاریکرا.

ئێوە بەو مێشکە دواکەوتوو و بەو کەسایەتییەتان کە تەسلیم بەمەسەلە غەریزییەکان بووە, نەك تەنیا ناتوانن شۆڕش بکەن, تەنانەت ناتوانن خۆشتان بژێنن.

تێکڕای هێزی من, شکۆمەندی من, لەخوڵقاندنی کەسایەتیم لەبواری ئایدیۆلۆژییەوە, سەرچاوە دەگرێت. هەڵبەتە رەوشی پێشکەوتووی ئایدیۆلۆژیم, من دەکات بەسەرۆك. ئاستی سەرۆکایەتی ئایدیۆلۆژیانەم, لەبەرئەوەی کە راستینەی کۆمەڵایەتی شیکردۆتەوە و, بەتایبەتیش لەبەر ئەوەی هەڵسەنگاندنەکانمان بەڕادەیەکی زۆر پێکهێنانی خوڵقکارانەی سۆسیالیزمی زانستین, تەنانەت منیشی بەهێزتر کردووە. ئەمە بەتەواوەتی ئایدیۆلۆژیایە, ئەگەر ئایدیۆلۆژیایەکی بەمجۆرە لەگەڵ بەسیاسی بوون بەڕێوە ببرێت, ئەوا دەبێتە هێزێکی زۆر مەزن.

ئەگەر لێرەدا بتوانرێ سیاسەت پێناسە بکرێت, ئەوا بریتییە لەقۆناخی گواستنەوە لەئایدیۆلۆژیا بۆ کۆمەڵایەتی بوون. سیاسی بوونیش لەڕاستیدا بەهێزکردنی هزر, رێکخستنی ئەو, خستنەواری پڕوپاگەندە, هەروەها کردنی بەمولکی کۆمەڵگایە. سەرۆکایەتی ئایدیۆلۆژی هزری پێویست بۆ کۆمەڵگا دەردەخاتەڕوو ولەسەر بنەمای راست پێناسەی دەکات. دوای ئەمەش کێشەکانی بڵاوکردنەوەی ئەو هزرە, لەڕێگای رێکخستنەوە چارەسەر دەبێت. لەڕێگای ناوەندە رێکخستنییەکان, یاسا و رێسا رێکخستنییەکان, لەئەنجامدا, چەندە جەماوەر بگرێتە خۆی, بەهەمان رادە دەبێتە هێز و, ئەمەش بەواتای سیاسی بوونە. ئێمە لەدەستنیشان کردنی خاڵە سەرەکییەکانی بەرنامەدا, ئەو سیاسی بوونەی کە ئایدیۆلۆژیا پێشبینی کردبوو, باسمان لێکردووە. ئەگەر بکرێتە مولکی جەماوەر ـ کە ئەمەش لەڕێگای رێکخراوەوە دەبێت ـ

لەئەنجامدا ڕێکخراو دەست بەچالاکی دەکات. دەکرێ جۆری ئەم چالاکییانە سەربازی یان سیاسی بێت. لەڕاستیدا بابڵێین کە سیاسەت خۆی لەخۆیدا بەچەکداربوون و بەئاگر بوونە.

لێرەدا دەبێ ئەمە دیاریبکەین کە سەربازبوونیش؛ بەتەواوەتی سیاسەتە. تەنانەت سەربازبوون گوزارشت لە چڕبوونەوەی سیاسەت دەکات. پێویستە هیچ کاتێك لایەنی سەربازی و سیاسەت بەشێوەی دوو دەزگای جیاواز نەبینرێت. ئاستی زیاتر چڕبوونەوەی سیاسەت, شێوازێکە کە لەڕێگای چەك و سەربازییەوە پەیڕەو دەکرێت.

سەربازی بوون سیاسەتی هەرە لەپێشە.

تایبەتمەندێتییەکی وەهای سەربازی نییە کە لەسیاسەت جیاوازبێت و جێگای بگرێتەوە. لەڕاستیدا سیاسەتیش هزرە و لەڕێگای ئایدیۆلۆژیاوە پێشکەوتووە. بەواتایەکی دیکە ڕەوشی ئەو هزرەیە کە بووەتە موڵکی کۆمەڵگا. بۆ نموونە بەگونجاندنی لەگەڵ ڕاستینەی کورد, ئەوا پێداویستی کوردان بۆ بەنەتەوەبوون و رزگاری نەتەوەیی, دەردەکەوێتەڕوو. بۆ رزگاری نەتەوەیی ڕێکخستن پێویست دەکات, بۆ ڕێکخستنیش پێویستە ڕێکخستنی داگیرکاری دەوڵەت رەتبکرێتەوە و, بۆ ئەم مەبەستەش پێویست بەچالاکی دەکات. واتا ناکرێت دەستبەرداری بەڕێکخراوەبوونێکی چالاك بکرێت. ئەمانە روونکردنەوەی ئایدیۆلۆژین و بە ئەم روونکردنەوانە جێبەجێ بکەین. سەرەتا بە پارتی دابمەزرێنین و ڕێکخستن و چالاکییەکانی پێشبخەین. لەئەنجامدا ئەوەی دەردەکەوێتەڕوو سیاسەت و هێزی سیاسییە. بەرژەوەندییە سەرەکییەکان و پێشبینییەکانی دەبێتە هێزی ماددی. واتە ئەگەر پێویست بکات پرسیاری "چەندەم بەگەل بەخشی, چەندە ڕێکخستنم دامەزراند, چەندە خستمە واری پراکتیکییەوە" و جێبەجێی بکەیت, بەم واتایە دەبیتە سیاسی و ئەمەش بەواتای سیاسەتمەداربوون دێت.

واتای سیاسی بوون, هەروەکو زۆربەتان بۆی دەچن, زماندرێژی نییە. چەندە جەماوەر ڕێکبخەیت, چەندە مرۆڤ پەروەردە بکەیت, چەندە بتوانیت ئاراستەیان بکەیت, بەهەمان ئەندازەش سیاسیت. زاراوەکانی بەرژەوەندی سەرەکی نەتەوەیی, ڕێکخستنی نەتەوەیی, دەوڵەتی نەتەوەیی, شۆڕشی نەتەوەیی لەلایەن ئایدیۆلۆژیاوە گوزارشتی لێدەکرێت و پرۆگرامی بۆ دادەڕێژرێت. ئەوەی دەمێنێتەوە پراکتیزەکردنە و ئەمەش بەتاکتیك ناوزەد دەکرێت. پڕوپاگەندە بکەن, ڕێکخستن بکەن, یەك ـــ دوو خۆپێشاندان ڕێکبخەن, هەندێ چالاکی مەزن ئەنجام بدەن. ئەمەش خەباتی سیاسی و پراکتیکییە, واتا بەسیاسی بوونە. ئەگەر ئەمە جێبەجێ بکەن دەبنە سیاسەتمەدار. کە واتە, بەسیاسی بوون وەرچەرخانە لەئایدیۆلۆژی و ڕاستییەکانییەوە, بەرەو بەهێزبوون.

**"ڕاستینەی سەرۆکایەتی ـ خەباتگێڕی لەسۆسیالیزمدا"**

لێرەدا دەتوانم خۆم بەنموونە بهێنمەوە. لەسەرەتای دەستپێکردنی ئەم تێکۆشانەدا راستییەکانم دەستنیشانکرد: سەرەتا دەستنیشانکردنی کێشەی نەتەوەیی بوو، لەنێو کێشەی نەتەوەییدا، پارتی، هەروەها لەنێو کێشەی نەتەوەییدا، پرۆگرامی پارتی و هاوشێوەی ئەمانە بەدەستنیشانکردنی هەندێ لایەنی دیکەی سەرەکی، یەکسەر دەستم بە پڕوپاگەندە کرد. کۆمەڵگای کورد راستینە ژیانییەکانی هەیە. لەم پێناوەدا هاوارم کرد و بانگەوازیم کرد. ئەمەش پڕوپاگەندەیە، ئاژیتاسیۆنە. لەبەرئەوەی لەدواییدا ئەمە تێری نەکرد، دەستم بە رێکخستن کرد و ئەرکی نوێنەرایەتی کردنم بەچەند کەسێکدا، پێکهێنانی کۆمیتە بەکەسانێکی تر، رێکخستنی خۆپێشاندان بەکەسانێك و چەك بەکەسانێك دەدەم بۆ ئەوەی پرەنسیپەکان بخەنە واری پراکتیکەوە. ئەمەش بوو بەجوڵانەوەیەکی سیاسی، سەربازی. من لەئایدۆلۆگێك زیاتر بووم بەچالاکوان، ئاژیتاتۆر و پڕوپاگەندەوان. بەشێوەیەکی گشتی ئایدۆلۆگ لەسەر مێز شتێك دەدۆزێتەوە و دەردەخاتەڕوو، خەباتگێڕەکانیش ئەمە بڵاودەکەنەوە. وەلێ دەبینین کە، لەلای ئێمەدا خەباتگێڕەکان زۆرنین، بۆیە ئەوەی ئایدیۆلۆژیش دەردەخاتەڕوو، بڵاویشی دەکاتەوە، وەکو بڵێی تاکەکەسێکە. لەلای ئێمە ماوەیەکی درێژ بەمجۆرەبوو. بێگومان بەتەواوەتی تێنەگەیشتن لەمە. هەروەها ئەنجامدانی بەشێوەیەکی سنووردار، دوو کێشەی جیاوازن لەکێشەکانی سیاسی ـ ئایدیۆلۆژی یا خود وەکو کێشەکانی سیاسی ـــ رێکخستنی. بەڵام ئەگەر سەرنج بدرێت، دەبینین پێشکەوتنی شکۆمەندانەی ئێمە شێوازێکی وەها لەخۆوە دەگرێ کە سەرەتا تاك بەگوێرەی کۆمەڵگا و، بەگوێرەی گەل خۆی بکاتە خاوەن ئایدیۆلۆژییا و، پاشان تا ئاستی راگەیاندنی پارتێکی ببات و ئەویش بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە تا دواڕادە بەپێی تاکتیکی گونجاو بجوڵێتەوە و گۆڕەپانی دوور لەمەترسی بدۆزێتەوە.

بێگومان ئەمە بەبێ پەروەردەیەکی مەزن، پێکنایەت، چونکە تۆ تەنیا لەرێی پەروەردە دەتوانیت ئایدیۆلۆژیا بەمرۆڤ بدەیت. ئەگەر پەروەردە نەبێت، مرۆڤ بەلەنگازێکی لەئێمە دابڕاوە، کە لەچوارچێوەی ئاژەڵ بووندا دەخولێتەوە. هەربۆیە لە رێگای پەروەردەوە بەهێزدەبێت. ئەگەر بتەوێت مرۆڤ یا خود خۆت لەئاژەڵ بوون رزگاربکەیت و بتەوێت یەکێك لە رەوشی دواکەوتوویی، داگیرکاری و فشار دەربخەیت، ئەوا دەبێ پەروەردەی بکەیت. پەروەردە بۆ ئەوەیە ببیتە هێزی پڕوپاگەندە، ببیتە هێزی رێکخستن و بەرجەستەکردنی، پەروەردە توانستی رۆحی و هزری و مرۆڤییانەیە. ئەمەش خۆی بەشێوەی رووناکبیری، رێکخستن و ئەنجامدانی چالاکی نیشان دەدات. ئەو کات ئەمە بەو واتایە دێت، بوویت بەکەسێکی پەروەردەکراو و رێکخراو. بێگومان کەسێکی بەمجۆرە هەم سیاسییە، پێویست بکات سەربازیشە.

پەیوەندی سیاسەت و سەربازی بەئایدیۆلۆژیاوە هەروەها پەیوەندی ئایدیۆلۆژیاش بەئاستی ئاژەڵبوون و دارووخانی کۆمەڵگاوە، زۆر روون و ئاشکرایە. ئەمە لە راستی کورددا زیاتر بەرجەستەیە. کۆمەڵگای کورد کۆمەڵگایەکە کە لەئایدیۆلۆژیا و مۆراڵ دابڕاوە و، پەرتەوازەبووە، توێنراوەتەوە. ئایدیۆلۆژیایەك کە ئەو کۆبکاتەوە سەریەك زۆرگرنگە، لەبەر ئەوەی توانکاری ئەو ئایدیۆلۆژیایە بۆ بەرجەستەبوون بەشێوەیەکی بەهێز لەتاکە کەسێکدا پاشان هەرچەندە لاوازیش بێت بەرێوەچوونی لە رێگای پارتییەکەوە پێداویستییەکی گەورەی مێژووییە، گفتوگۆکردن لەسەر ئەوە بۆ کۆمەڵگا و وەرچەرخانی بۆ بزووتنەوەیەکی رزگاریخواز بۆ خۆی سەرکەوتنە. هەربۆیە هەموو کەسێك بەرەو پیری ئەوەوە دێت. ئەمە بەپەروەردە و چالاکییەکی رووکەشییانەوە نابێت، بۆ ئەنجامدانی ئەوەش گەلێك کار دەخوازرێت؛ چونکە ئەمە پێداویستییەکی مێژووییە.

کەواتە، پێویست دەکات زۆر بەباشی لەسیاسەت تێبگەن. پەیوەندی سیاسەت بەئایدیۆلۆژیا، هەروەها ئایدیۆلۆژیا بەئاستی هەڵوەشانەوەی کۆمەڵایەتی و ئەرکی گۆڕین و دەربازکردنی، روون و ئاشکرایە و، سیاسەتیش ئامرازی سەرەکی ئەمەیە. واتە ئایدیۆلۆژیا دەڵێ و، سیاسەت ئەنجامی دەدات، یا خود ئایدیۆلۆگ دەڵێ و، خەباتگێڕ چالاکی ئەنجام دەدات، تەنانەت سەربازیش بەشێوەیەکی زەبروەشێن چالاکی ئەنجام دەدەن. ئەگەر چالاکی بەبێ گوێدانە ئەم راستییانە ئەنجام بدرێت وەك چۆن لادێییەك حەیزەران بادەدات (رادەوەشێنێ)، ئەگەر ئێوەش وابکەن، ئەوا دەدۆڕێنن. وەکو دەزانرێت لەشەڕی لادێییدا تەواوی لادێییەکان، تەواوی عەشیرەتەکان، دووچاری لاوازی دەبن. چونکە ئایدیۆلۆژیایان نییە، ئامانجیان نییە، ئامانج و بانگێشەی بنچینەیی کۆمەڵایەتی نییە. لە رەوشێکی بەمجۆرەدا شەڕ و شۆڕی کوردان، شەڕ و شۆڕێکی لەنێوبردنی خۆبەخۆییە.

گەلێك لەئێوە لەژیانتاندا پڕوپاگەندە دەکەن، وەلێ لەبەرئەوەی ئاستی ئەو پڕوپاگەندانە لەتایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ئایدیۆلۆژیاوە دوورە، بۆیە بەواتای فیتنە و فەسادی و زماندرێژییە. بۆ نموونە منیش زۆر قسەدەکەم، وەلێ زۆریش سەرکەوتووم. چونکە قسەکانی من بەتەواوەتی پەیوەندیدارە لەگەڵ بەرژەوەندییە بنچینەییەکانی کۆمەڵگا. هیچ کەسێك ناتوانێ من بەرەو گلەیی و قسەکردنی پاشەملە و وتەی دەرەوەی بەرژەوەندییە بنچینەییەکان ببات. خۆی لەخۆیدا من دەرفەت بەمە نادەم. تەواوی قسەکانی من گرێدراوە بە بەرژەوەندییە بنچینەییەکان. هەربۆیە هەم پڕوپاگەندەوانێکی باشم، هەم ئایدیۆلۆگێکی باشم و لەئەنجامیشدا یەکجار بەکاریگەرم.

بۆچی ئێوە بەکاریگەر نابن؟ چونکە زێدە خاوەنی ئایدیۆلۆژیا نین، بۆیە شێوەیەکی فیتنە و فەسادیتان هەیە لەپڕوپاگەندەدا. لەبەرئەوەی لەتێکۆشانتانا وەکو لادێییەکان پێرپێر

ماونەتـەوە, زێـدە پێشـناکەون. لەئەنجامـدا خـەباتگێرێکی کـەوتوو و, بـێ پـەروەردە, بـێ ڕێکخستن, ئاستێکی لاواز و دوور لەئایدیۆلۆژیا, دەردەکەوێتەڕوو.

هەرچـی کاریگـەری ئەمەشـە لەتێکۆشـانی چـەکداریدا, راسـتینەی خـەباتگێرێکی وەهـا دەردەخاتـەڕوو کـە لـەدەرەوەی تاکتیـك ماوەتـەوە و بـەئارەزووی خـۆی چـەك بـەکاردێنێ و, بەگوێرەی تاکتیك ناجوڵێتەوە. لێرەدا بەبێ ئەوەی دەرك بەپڕوپاگەندە, سیاسـەت, ڕێکخستن بکات, چەك بەدەستەوە دەگرێت, بێگومان لەو رەوشەدا خۆی دەپێکێ. هەڵبەتـە گـەلێك کـەس هەن بەمجۆرەیان کردووە. کەواتـە ڕێگای رزگاربوون لـەم رەوشـە زۆر ئاشکرایە. وەکـو گـوتم, لێرەدا ئایدیۆلۆژیا ڕێگا نیشاندەدات. ئەگەر هەندێك هەبن گەل دووچاری داڕووخان بکەنـەوە, ئەوا پێویستە لەبەرامبەر ئەوەدا زمانێکی ئایدیۆلۆژی و شێوازی سیاسەت بەبنەما وەربگیرێت. وەك دەزانــن کـە هــەموو شــتێك بەچــەك مەیســەر نابێـت. تەنانــەت بــۆ ئــەوەی چــەك بـەکاربهێنرێت, سـەرەتا پێویسـت بـە ڕێکخسـتن دەکـات. چـونکە ئەگـەر هەرکەسـێك فیشـەك بەسـەری خۆیـدا بتـەقێنێ و بڵـێ "ئەگـەر هـەرکاتێ ئـارەزوو بکـەم چـەك بـەکاردەهێنم یـان بـەکارناهێنم, چـالاکی دەکـەم یـا خـود چـالاکی ناکـەم" ئەمـە ئـەنجامێکی هـەرە مەترسـیداری لێدەکەوێتـەوە, بـۆ ئـەوەی بـەمجۆرەش نـەبێت, پێویسـت بـە ڕێکخسـتن دەکـات. واتـە سـەرەتا ڕێکخراو پێش هەموو شتێك دەبێ ببێتە ڕێکخستنێك کە پابەندی پرۆگرام و پابەنـدی پـارتی بێت. ئەگەر بەگوێرەی ئەمە ببیتە ڕێکخراوێك کە دیسیپلین قازانج بکات و بەشێوەیەکی باش گرێدانت بەئامانجە بنچینەییەکان هەبێت, ئەوا دەکرێ باس لەسەرکەوتن بکرێت.

ئێسـتا مـن دەڵـێم: " ئەگـەر ئامانجـە نەتـەوەیی ـــ چـینایەتییەکان نـەبێت؛ کـە ئەمـە مەسەلەیەکی مان و نەمانە, ئـەوا منـیش نـابم". ئەگـەر ئێـوەش بتانـەوێ لـەمن تێبگـەن, مـن پێش هەموو شتێك ئایدیۆلۆگێك و, چاودێری ئامانجە بنچینەییەکانی نەتەوە دەکەم و هەموو کەسێك بەئامانجی نەتەوەیی گرێدەدەم ــ من ئەوە دەڵێم, کە چاودێری ئەوە دەکەم ــ. ئەمـە بەواتای سەرۆکی نەتەوەییـە و هێـزی خـۆم لێـرەوە وەردەگـرم. مـن دەڵـێم پـارتی پێویسـتە و چـاودیری پرەنسیپی پـارتیش دەکـەم. لێـرەدا دەڵـێم بـۆ ڕێکخسـتنی پـارتی, لـەپێناو پـارتی پێویسـت بەخـەباتگێڕ دەکـات و مـن ئـەوەش دەخـولقێنم. دەڵـێم ئاسـتی سـەرەکی, ئاسـتی خەباتگێڕی سیاسی پارتی بەوجۆرە دەبێت؛ بەمجۆرە پڕوپاگەندەوان بەهێزدەبێت و بـەمجۆرە ڕێبازی پارتی ڕێکدەخرێ و بـەڕێوەدەبردرێ. لـەدوای ئەنجامـدانی ئەمـە دەتـوانرێ تێکۆشـانی سەربازی بکرێت؛ بەمرەنگە ئـەو سیسـتەمە پێویسـت دەبێت, دیسـیپلینی قـازانج دەکرێـت و, دەکـرێ چـەك بـەگوێرەی راسـتییەکان و لـەجێگای خۆیـدا بـەکاربهێنرێت. ئەمـەش بـەواتای ڕێبازێکی باشی سـەربازی دێـت. بـەواتای پێکهـاتنی تێکۆشـانێکی باشـی سـەربازی, سـوپا دێـت.

بەکورتی ئەگەر ئەم کێشانە بەمجۆرە لەنێویەکدا ببینن، ئەوا لەتواناتاندا دەبێت کە زیاتر حوکمی راستییەکان بکەن.

**"راست نییە جیهان بۆ کامپەکان پارچە بکرێ و ئەمە بەسەرچووە"**

ئەگەر پێویست بکات بۆ شۆڕشی کوردستان هەندێ رەوشی رۆژانەی سیاسەت روونبکەینەوە، ئەوا دەبێ یەکسەر ئەوە دیاری بکەین کە ئێمە لە رابردوودا زۆر بە بەرفراوانی ئەمەمان ئەنجام دەدا، تەنانەت بەگوێرەی سۆسیالیزمی بونیادنراو ئەنجاممان دەدا. ئەمە هەڵە و شوورەیی نەبوو. وەلێ ئەمرۆ ناتوانین بەهەمان شێوە ئەنجامی بدەین. بۆ نموونە لەمانیفێستۆی ئێمەدا باس لەمە دەکرێ کە " جیهان جیهانێکی بەمرەنگەیە، لەلایەك وەها و، لەلایەکیتر شتی دیکە لەئارادان، جیهانێك کە سەرمایەداری ـــ ئیمپریالیستی و سۆسیالیست و هێزی رزگاری نەتەوەیی لەئارادابوو". هەڵبەتە ئەمرۆ ئێمە ئەو پێناسەیە تێپەڕ دەکەین.

بەتایبەت لەدوای سالآنی 1990 پێناسەی بەوجۆرە زۆر راست نابێت. دەخوازرێ جیهان وەها هەڵبەسەنگێنرێ و گوزارشتی لێبکرێ کە گوایە تا رادەیەك جیهانگیربووە. وەلێ ئێمە چۆن دەتوانین راستینەی ئەوە دەستنیشان بکەین؟ هەندێك ئەمە بەگوتەی ناکۆکی باشوور ـــ باکوور دەردەخاتەڕوو. ئەمە بەواتای قەبە بەزاراوەکردنە و، زۆر راست نییە کە جیهان بەگوتەی باشوور ـ باکوور جیابکرێتەوە. وەلێ بەواتایەکی گشتی دەشێ بوترێ کە ناکۆکی، بنچینەییە ـــ کە پێویستی بەزاراوەیەکی بەمجۆرە هەیە. رەوشی ئەوانەی ئیمپریالیست لەسەرەوە لە رێگای هێزی سیستەمی ئاراستەکەری سەرمایەداری پاوانخوازی خۆیەوە بەرژەوەندییەکانیان تێکدەدات، دەتوانرێ وەکو ناکۆکی باکوور ـ باشوور باسبکرێت. تەنانەت دەتوانرێ بەشێوەی نەتەوەی داگیرکەر ـ داگیرکراو و یا خود چینی چەوسێنەر ـ چەوساوەش لەقەڵەم بدرێت. بە رای من ئەمە زێدە گرنگ نییە.

وەلێ ئەمە دەرکەوتەڕوو: هەروەکو لەسۆسیالیزمی بونیادنراودا روویدا، باشوور بۆ دوو جەمسەر جیاکرایەوە، تەنانەت لەنێو دووجەمسەردا هەموو شتێك بۆ سۆڤییەتەکان بوو، ئەمەش بەسیاسەتی دەرەوەی سۆڤییەتەوە گرێدرا، لەدوای ئەوەش " هەموو شتێك بەمەوە گرێدراوە!" یا خود "تێکۆشان لەبەرامبەر ئیمپریالیزمیش بەمەوە گرێدراوە، کێ پێچەوانەی ئەمە بجوڵێتەوە، ئەوا ئەوە سۆسیالیست نییە!"، بە راستی لە رابردوودا هەڵوێستی بەمجۆرە پەیڕەودەکرا. خۆی لەخۆیدا ئەوەی مەترسیدارە و تاوانە لێرەوە سەرچاوەی خۆی دەگرێ.

هەموو شتێك بۆ بەرژەوەندییەکانی سۆڤییەتە، لەنێو سۆڤییەتیش بۆ بەرژەوەندی روسیا یە. لێرەدا ئەگەر هەمووشتێك بۆ هەڵسەنگاندنەکانی بیرۆی سیاسی بمینێ، ئەوا کارەکان تا دوایی مەترسیداردەبێت. ئاشکرایە کە ئەمەش نابێتە تێکۆشانێکی سەرکەوتوانە لەبەرامبەر

ئیمپریالیزم. ئەمانــە هــەروەکو بینــرا لەکەســایەتی گۆرباچــۆف دا بەگرتنەبــەری ڕێبــازی پاشکۆیەتی بۆ کۆنەپەرستێکی وەکو ریگان و, یەکێکی وەك یەلتسین دەچێ و هەوڵ دەدات لەبەرماوەی سەرمایەداری سوودوەربگرێت. هەوڵمانـدا تـا رادەیـەك هۆکارەکانی ئەمـە شـی بکەینەوە.

ئیدی هەڵسەنگاندنی جیهانێکی بەمجۆرە زۆر واتادارنییە. واتە راست نییە کە جیهان بۆ کامپی بەمجۆرە پارچەبکرێ و لەنێوانیاندا مەودای مەزن دابنرێ. خۆی لەخۆیدا ئاشکرایە کە ئیمپریالیزم کەڵکی لەمە وەرگرتووە. ئێمە پێشتر لەهەڵسەنگاندنەکانی خۆماندا گوتومانە کە سۆسیالیزمی بونیادنراو بەشێوەیەکی گشتی مێژووی تێکۆشانە کۆمەڵایەتییەکانی بنبەست کردووە. لەهەمان کاتیشدا تێکۆشانی سۆسیالیستی بنبەست کرد و بۆ 60-70 ساڵی دیکە بواری هەناسەدانی بەئیمپریالیزم بەخشی. ئەگەر لەشوێنی دروستکردنی دیواری بەرلین و جیاکردنەوە و دانانی سنووری بەمجۆرە, خۆی وەك خۆی بمایە, ئەوا ئەنجامی باشتری بۆ نەتەوەکان و گەلان دەبوو. سۆسیالیزم پێویستی بەدیوارەکان نییە, بەپێچەوانەوە پێویستی بە رووخاندنی دیوارەکان هەیە. وەلێ تەواوی وڵاتە سۆسیالیستەکان لەوڵاتە سەرمایەدارەکان و تەنانەت لەپرەنسیپە نەتەوەپەرستییەکانی ئەوان زیاتر, دیواری ئەستوورتریان دروستکرد. چونکە سۆسیالیزم سیستەمێك نییە کە هەوڵبدات بەقەڵاکان خۆی بپارێزێت. قەڵاکان لەچەرخی ناوەڕاستدا هەبوون. هەروەها لەدامەزرانـدنی سـەرمایەداریدا دەوڵەتـە سەرمایەدارەکان خواسـتیان ناوچـە داگیرکراوەکـانی خۆیـان لـە رێگـای گرووپـە نەتەوەپەرستییەکان بپارێزن و دیوارەکانی گومرکیان بەرزکردەوە. هەروەکو چۆن سۆسیالیزم قەڵای لەوان پتەوتری دروستکرد, واتە دامەزراندنی دیوارەکان هەڵبـژاردنێکی هەڵـەبوو, بەپێچەوانەوە ئەوەی کە پێویست بوو بیکات, ئەوەبوو کە هێرش بکاتە سەر دیوارەکانی سەرمایەداری. سەرمایەداری مرۆڤەکانی لەشێوەی چین, تیرە و ... هتد دابەشکردووە, گەلێك نابەرابەری خوڵقانـدووە. شـتی هـەرە راسـت ئاراسـتەکردنی ئەوانەیـە لـە رێگـای بەدیموکراسییەتی سۆسیالیستییانە و دەستپێشخەری سۆسیالیستییانە. بەمجۆرە دەکرا مرۆڤی سۆسیالیست پێ بگەیەنرین و ئەو مرۆڤانە لەهەر لایەکدا دابنرێن. ئەمریکا و ئەوروپا بەتەواوەتی بەشێوەیەکی سەرمایەداری دەسەڵاتیان بەسەر مرۆڤی خۆیان بەڕێوەبرد و ئەوەش رێگای لەبەردەم گەیشتنی سەرمایەداری بەهێزێکی وەها کردەوە کە بەهیچ جۆرێك نەیبوو. بەتەواوەتی سۆسیالیزمی سۆڤییەت, لەئەنجامی سیاسەتی بێ واتای دروستکردنی دیوارەکان پێکهات و بۆیە لەئەنجامی ئەم 70 ساڵەدا گەلێك شتی لەدەستدا.

ئێستا ئەمە دەربازدەکرێت. پێویستە ئەمە بەخراپی نەبینرێ. لەکاتێکدا کە سۆڤییەت هەڵدەوەشایەوە, ناتوانین بڵێین لەوێدا پاشماوەکانی سۆسیالیزم هیچ نەبوو. بەپێچەوانەوە

گوتمان کێشەکانی سەرمایەداری گرانتر دەبێت راستینەی ئەمەش دەردەکەوێت. جگە لەوە هاتنەئارای زەمینەیەکی باشتر بۆ تێکۆشانی سۆسیالیستی جێگەی باسە. ئەمە ئێستا زیاتر دەرکی پێدەکرێت.

بەرووخاندنی بیروکراسییەکان پێشکەوتنێکی باشتر دێتە ئاراوە و، مرۆڤەکان دووبارە تەڤلی یەکتر دەبنەوە. ئەم تەڤلیبوونە پێویستە، چونکە ئەگەر لەنێوان دوو لایەندا بەربەست دروست بکرێت، ئەوا دەتوانن بەبۆمبای ئەتۆمی هەڕەشە لەمرۆڤایەتی بکەن. سەرمایەدارێکی شێت و هار دەتوانێ بەئاسانی بۆمبای ئەتۆمی بەکار بهێنێ، وەکو دەرکەوت لەلایەن ئەمریکاوە بەکار هێنرا ئەمەش بەواتای کۆتایی هاتنی مرۆڤایەتییە. ئەگەر تەنیا لەبەر مەترسی بۆمبای ئەتۆمیش بێت، چۆن دەتوانیت مرۆڤەکان بپارێزیت؟ لەم پێناوەدا دەبێ تێکۆشانی چینایەتی تاوەکو نێوجەرگەی ئەمریکا درێژ بکەیتەوە و مرۆڤایەتی لەنێو یەکدا وەها بڵاو بکەیتەوە کە نەبێتە ئامانجێکی دیاریکراوی بۆمبای ئەتۆمی، کە لەلایەن سەرمایەدارییەوە بەرهەم هاتووە.

واتە تاکەڕێگای بێ کاریگەرکردنی چەکی ئەتۆمی، گشتگیرکردنی سۆسیالیزم و کردن بە موڵکی هەر نەتەوەیەکە. بۆ رێگاگرتن لەو مەترسییەش، هەروەکو پارچەکردنی جیهان بۆ کامپەکان، راست نییە، ئەوا پێویست دەکات جێگایەك بۆ شتی نابەجێی وەك بۆمبای ئەتۆمی سۆسیالیست، بۆمبای ئەتۆمی سەرمایەداری، نەهێڵدرێتەوە.

بۆ ئەوەی سۆسیالیزم ببێتە موڵکی گشت مرۆڤایەتی، پێویستە ببێتە موڵکی مرۆڤ لەهەر شوێنێك بێت، مرۆڤی وڵاتە سەرمایەدارەکان، مرۆڤی وڵاتە بندەستەکان، ئەمەش بەگوتنی " لایەنێك ئەوەندە سۆسیالیستە و، لایەنی دیکەش ئەوەندە سۆسیالیست نییە " نابێت، بەڵکو بۆ ئەمە تێڕوانینێکی هاوسەنگ پێویست دەکات.

تەنانەت دەتوانی ببیت بەدەوڵەتێکی سۆسیالیستی، وەلێ دەبێ لەگەڵ هەرکەسێك پەیوەندیت هەبێت. تەنانەت لەگەڵ ئەمریکاش پەیوەندیت هەبێت. ئەم پەیوەندییانە، خۆبەدەستەوەدان یاخود داخوازی سەرمایەداری نییە. ئەمانە پەیوەندی تاکتیکین و هەموو کاتێکیش پێویست دەکات. لەم پەیوەندییەدا، هەم ئەو کاریگەری لەسەر تۆ دەکات، هەم تۆش کاریگەری لەو دەکەی. ئەو دەیەوێت گرووپێکی ئەڵقەلەگوێی ئیمپریالیزمی لەنێو تۆدا بخوڵقێنێ، هاوکات تۆش دەتەوێ لەنێو ئەودا گرووپێکی سۆسیالیستی بخوڵقێنی. ئەو بەتۆوە گرێ دەدرێ، تۆش گرێدراوی ئەو دەبیت. ئەمە دەرفەت بەشەڕە جەماوەرییەکان و شەڕ و قڕکردن نادات و هەروەها رێگا لەبەردەم پێشکەوتنی گشتی دەکاتەوە. نەك تەنیا پێشکەوتنی نەتەوەیەك، بەڵکو توانست بۆ پێشکەوتنی تەواوی نەتەوەکان بەیەکەوە دەکاتەوە. لەسۆڤیەتدا ئەوەی لەڕێگای سۆسیالیزم پێشکەوت، زیاتر نەتەوەی رووس بوو، نەتەوەکانی دیکە

پاشکەوتوو مان، تەنانەت لەگەڵێك نەتەوەی دەرەوەی سۆڤیەتیش پاشکەوتووتر مان. وەلێ لەگەوهەری سۆسیالیزمدا نەتەوەیەك، تەنانەت لەناوخۆی نەتەوەیەکیشدا دژایەتیکردنی چینێك لەدژی چینەکانی دیکە، بۆ نموونە: لەسۆسیالیزمدا مرۆڤ و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی هاوسەنگانە بەبنەما وەردەگیرێت.

**"سۆسیالیزم کێشەیەکی چۆنایەتی و خۆ بەکۆمەڵایەتیکردنی مرۆڤە"**

لەڕاستیدا پێویست دەکات ڕەوشی سیاسی ڕۆژانە هەڵبسەنگێنرێت. پێویستە بەگوتنی:" تا ئەو ڕادەیە نەکەوتە نێو کامپەوە " خەم بۆ ئەوە نەخۆی. لەڕابردوودا زاراوەی وەك: گوایە سێ یەکی دونیا سوسیالیزم بوو! پێش هەموو شتێك سێ یەکی دونیا، چوار یەك، یاخود شەش یەکی سۆسیالیزم بوو، زێدە ڕاست نییە. کێشەی سۆسیالیزم کێشەی چەندایەتی نییە، ئاشکرایە کە ئێمە بەگوتنی سێ یەکی یاخود شەش یەکی دونیا بۆتە سۆسیالیزم، خۆمان هەڵناخەڵەتێنین.

بەڕاستی سۆسیالیزم کێشەیەکی چۆنایەتی و خۆ بەکۆمەڵایەتیکردنی مرۆڤە.

ئەگەر دە کەس بەتەواوەتی خۆیان بکەنە سۆسیالیست، ئەوا دەتوانرێت دونیایەکی سۆسیالیستی بونیاد بنرێت، کە باشتر بێت لە شەش یەکی دونیا.

بۆیە ناکرێت سۆسیالیزم بخرێتە چوارچێوەی زاراوەیەکی جوگرافیایی. تەنانەت گوتنی:" ئەوەندە مرۆڤ کاریگەر بوون بەسۆسیالیزم " سەرکەوتنی سۆسیالیزم دیاری ناکات. دەتوانرێ سەرکەوتنی سۆسیالیزم بەپێکهێنانی لەلایەن مرۆڤەوە دیاری بکرێت. ئەمەش کێشەیەکی چۆنایەتییە نەك چەندایەتی. نوێنەرایەتیکردنێکی زۆر بەهێزی سۆسیالیزم لەلایەن ناوەندێکی پێکهاتوو لەدە کەس، لەدە ملیۆن سۆسیالیستی دەبەنگ، یاخود لەتەواوی ئەو مرۆڤانەی لەژێر کاریگەری سەرمایەداریدان، بەهێزترە. ئەگەر لەنێو هەر نەتەوەیەکدا ناوەندێکی بەمجۆرە هەبێت، ئەوا لەوە بەنرخترە کە شەش یەکی ئەم دونیایە سۆسیالیستی دەبەنگ بێت. ئەمە هەم دەبێت و هەم ڕاستیشە.

هەڵبەتە پێویست بەمجۆرە زاراوانەش دەکات. واتە پێویست دەکات مرۆڤی سۆسیالیستی کە بێ ئەوەی جیاوازی نەتەوەیی بکات، لەهەموو جێگایەك بخوڵقێنرێت. سیستەمی سۆسیالیستی باڵا، یاخود ئەوەی کە دەسەڵاتداری بەسەر گەلاندا بکات، چارەنووسی گەلان دیاری بکات، ئەگەر بەشێوەیەکی هاوسەنگ مرۆڤی خاوەن توانست، بەبایەخدان بەبنەمایەکی ڕاستەقینەی ئایدیۆلۆژییانە، پێشبخات و، هاوپەیمانی و هاوکاری و هەروەها گوزارشتکردنی ئەنتەرناسیۆنالی ئەو پارتییانەی کە وەکو بۆمبایەکی ئەتۆمی لەدژی کۆمەڵ و مەترسی مەزنی جیاجیا کە لەلایەن سەرمایەدارییەوە دادەمەزرێنرێن و بە سیاسی دەکرێن و بەسەر مرۆڤایەتیدا دەسەپێنرێ، پێشبخات، لەمەزنکردنەکانی وەك " ئەم چارەنووسەمان ڕزگار کرد،

دیسانیش یارمەتی ئەو چارەنووسە دەکەین ". هەروەك لەئەزموونی پێش ئێستای سۆسیالیزمی بونیادنراودا دەرکەوت, واتادارترە.

بێگومان ئەمە بەو واتایە نایە کە سۆسیالیزم لەهەرجێگەیەکدا بەهێز دەبێت. وەلێ بەهێزبوونی سۆسیالیزم لەشوێنێکدا و نەبوونی لەشوێنێکی دیکەدا, مەترسیدراە و ئەمە گوزارشت لە لەرێ لادان دەکات, هەموو شوێنێك بەشێوەیەکی گشتگیر نابێ بە سۆسیالیست. واتە سۆسیالیزم ئایدیۆلۆژیایەکی وەهایە کە ئەگەر لەلایەکەوە رێگا لەپێشی بکەیتەوە و لەلایەکی دیکەشەوە رێگا لەبەردەم رەوشێکی وەکو فاشیزم بکەیتەوە, ئەوا بەدەستی خۆت سۆسیالیزم پووچەڵ دەکەیتەوە. ئەمە بۆ پارتییەکیش بەمجۆرەیە. ئەگەر بەشێکی زۆر سۆسیالیست و بەشێکی زۆریش لادێیی بێت, ئەوا ئەمە بەواتای لەنێوبردنی پارتی دێت. واتە لەگەوهەری سۆسیالیزمدا پێشخستنی هاوسەنگ هەیە.

ئەگەر سەیری سۆسیالیست بوونی منیش بکەن, ئەوا دەردەکەوێت کە لەنێو پارتیدا, لەپێناو خوڵقاندنی پارتییەکی سۆسیالیستی تا چ رادەیەك شەڕی مەزنم بەڕێوە بردووە و لەکوردستاندا بەپێشەنگایەتی PKK لەپێناو رێگاکردنەوە بۆ پێشکەوتنێکی سۆسیالیستییانە, هاوکات لەگەڵ خۆشم لە چ پێشبڕکێیەکدا بووم. پێداویستی سۆسیالیزم بەمجۆرەیە.

بۆ نموونە من دەتوانم ببمە سۆسیالیستێکی بیرۆکرات! دەتوانم وەکو تورکە چەپە بیرۆکراتەکان بم, کە دوو گوتن دەکەن و هەموو شتێك لەدوای خۆیانەوە جێ دەهێڵن, یاخود دەتوانم ئەوانە وەك مێگەل بەڕێوە بەرم! وەلێ لەبەر ئەوەی چەمکی سۆسیالیزم ئەمە پەسند ناکات, بۆیە هەرگیز رێگای ئەمانەم لەکەسایەتی خۆشمدا نەهێشتۆتەوە.

سۆسیالیزم بەشێوەیەکی گشتی گوزراشت لە تێکڕای ئاستی سۆسیالیستی پارتێك دەکات.

ئاستی سۆسیالیزمی پارتێك, پێویستە رەنگدانەوە لەئاستی ئازادی جەماوەر بکات و هاوکات دەبێ ئەمەش بەمجۆرە دەربازی گۆڕەپانی نێودەوڵەتی بکرێت. منیش لەبەر ئەوەی کە خۆمم پابەندی پێناسەیەکی سۆسیالیستی بەم شێوەیە کردووە, بۆیە توانیومە ببم بە سۆسیالیستێکی راستەقینە و بەکاریگەر.

لەکاتێکدا تەواوی سۆسیالیستە بیرۆکراتەکان دەڕووخێن و تەنانەت تەواوی دەوڵەتە لەپێشینەکان دەڕووخێن, من چۆن توانیومە خۆم بەهێز بکەم؟ گەلێك ئەزموون و وانە هەن کە دەبێ دەرکی پێبکرێ. خۆی لەخۆیدا هەموو کەسێك دەپرسێ کە:" سۆسیالیزمی کلاسیکی رووخا, ستالینیزم رووخا, وەلێ تۆ وەکو دوایین سۆسیالیست چۆن دەتوانی لەسەر پێی خۆت بمێنی؟ " هەڵبەتە دەرك بەوە ناکەن کە ئێمە چ جۆرە سۆسیالیستێکین. ئێمە تەنانەت سۆسیالیستە بونیادنراوەکان, سۆسیالیستە بیرۆکراتییەکان, سۆسیالیستە فیودالییەکان, سۆسیالیستە بۆرژوازییە بچووکەکان, هیچ ناناسین, یاخود دوور و نزیك پەیوەندییەکمان

لەگەڵ ئەواندا نییە. بەپێچەوانەوە لەبونیادی PKKدا لەبەرامبەر ئەواندا زۆر بەدژواری تێکۆشان بەڕێوە دەبەین. لەنێو PKK دا دەستەیەکی ئاغا، بۆرژوازی بچووك و گوندی سۆسیالیستی هەن، ئێمە لەبەرامبەر هەموویان تێکۆشانێکی دژوارمان بەڕێوە برد. دەرئەنجامی ئەمەش ئەوەی کە پێکهات سۆسیالیزمی PKK یە.

هەموو کەسێك دەزانێ کە لەئاستی هەڵسەنگاندن و پێکهێنانی سۆسیالیزم، PKK بۆتە هێزێك کە بتوانێ ڕۆڵی خۆی لەئاستی نێودەوڵەتیدا بگێڕێت. ئێمە ئەوەمان پێکهێنا. بە چەمکێکی ڕاستی سۆسیالیستییانە، PKK بەتەواوەتی نوێنەرایەتی سەرۆکایەتی، گەل، پارتی و دیموکراسی کردووە. وەڵامی کێشە بنچینەییەکانی مرۆڤ و داسەپاندنەکانی ئیمپریالیزمی بەشێوەیەکی ڕاست داوەتەوە. بەڵێ ئەمەش پێشکەوتنێکە.

دەتوانین زۆر بەئاسانی ئەوە بڵێین:" ئاستی چارەسەری و ئاستی پێکهێنانی ئەوە بەواتای بەدەستخستنی سەرکەوتنی سۆسیالیزم دێت ". ئێوە و دوژمنیش ناتوانن نکوڵی لەمە بکەن. چونکە ئەوەی کە پێکم هێناوە لەبەرچاوانە. ئێمە ئەمەمان سەلماند. لەڕێگای ئەم چەمکانە، لەڕێگای ئەم هەڵوێست و هەڵسوکەوتانە، لەڕێگای ئەم شێوازی تێکۆشانە، ئەمانەم پێکهێنا.

منیش مرۆڤێکم وەلێ چۆن مرۆڤێك؟ مرۆڤێ کە پەیوەندی ئایدیۆلۆژی، پەیوەندی لەگەڵ سیاسەتی پراکتیکی، پەیوەندی بەتێکۆشانی سەرمایەداری، پەیوەندی بەبەرزکردنەوەی مرۆڤە چەوساوەکان، واتە چەندەی دەتوانن بیر بکەنەوە و، هەروەها گەلێك پەیوەندی دیکە لەخۆوە دەگرێت. دەرئەنجام هەڵسەنگاندنی سۆسیالیزمی لەنێو PKK دا، لەنێو ڕاستینەی گەلی کورددا، تادێت بەکاریگەربوونی لەناوچەکەدا، ڕەنگدانەوەی لەگۆڕەپانی نێونەتەوەییدا، خۆی لەخۆیدا پێشکەوتنێکە. بەکورتی دەتوانرێ ئەمانە سەبارەت بەئاستی پێکهاتن و هەڵسەنگاندنی لە PKK و لەڕەوشی سیاسی نێودەوڵەتی، بگوترێ.

واتە هەروەکو چۆن شوێنی خۆ مەزن دیتن نییە، ئەوا بەگوتنی:" ئیدی سۆسیالیزم هەڵوەشایەوە و ـ کە ئەمە زیاتر بۆ چەپی تورك بەمجۆرەیە ـ ئەوەی ماوەتەوە ڕێگای سەرمایەدارییە". ڕەوشێکی وەها کە هەرکەسێك بەئارەزووی خۆی بجوڵێتەوە، جێگایەك بۆ ئەمەش نییە. ئێمە وەکو سۆسیالیزمی بونیادنراوی رابردوو سەرخۆش نەبووین و، مۆراڵیشمان لەگەڵ رووخانیدا خراپ نەبوو.

بەپێچەوانەوە لەڕێگای خۆماندا بەباشتر و بەواتاوە، لەئەستۆمان گرت. مەزنبوونی بەهای هەڵسەنگاندنەکان و، هەروەها پێویستی بە سۆسیالیزم بوون و پێکهێنانی زیاتری ئەوانمان، هەم باوەڕ کرد، هەم زانیمان و هەم لەسەری سوور بووین. دەرئەنجام چەپی بیرۆکراسی یاخود ساختە و چەپی سۆسیالیزمی بونیادنراویش دەرباز کرا و جارێکی دیکەش نەیانتوانی خۆیان کۆبکەنەوە. وەلێ ئێمە هەموو ڕۆژێ پێشکەوتن لەسەر پێشکەوتنمان تۆمار کرد. ئەگەر بەم

خێراییە بەرێوە بچین ( تێکۆشان بکەین ), بەراستی لەدەیا پێنجی سۆسیالیستی بەهێز دەبێت, ئەگەر شێوازی سەرۆکایەتیمان بەبنەما وەربگیردرێ, ئەوا فاشیزمی تورك و دواکەوتوویی خۆرهەلاتی ناوین نامێنێ, تەنانەت ئەگەر کەسایەتی سۆسیالیستی خاوەن بانگێشە دەربکەوێت, ئەوا ئەگەر هەمان شێواز و رەوت ئەوان بەگوێرەی جێگا و قۆناخ بەشێوازی تێکۆشانی گونجاو پێکبهێنن و بەرێوەی ببەن, ئەوەش دەبێتە ئەنتەرناسیۆنالێکی مەزن.

ئێمە تا دوارادە هەست بەپێداویستی دڵنزمبوون دەکەین, وەلێ ئەگەر هەندێك, تەنانەت بشزانن پابەندی ئەو شێوەیەین کە پێکدێت, ناتوانرێ بیر لەوە بکرێتەوە کە ئەنتەرناسیۆنالێك گوزارشت لەهیچ بەهایەك ناکات.

ئێمە ئەو ئاستەی کە لەنموونەی بەرچاوی کوردستاندا پێکمان هێناوە, زۆر بەسانایی دەتوانرێ دەربازی خۆرهەلاتی ناوین بکرێت. خۆی لەخۆیدا دەکرێ یەکسەر دەربازی تورکیا بکرێت. دەرئەنجام ئەمەش بەواتای هەژاندنی گۆرەپانی نێودەولەتی دێت. ئەگەر ئەوە ئەنجامبدرێت, ئەوا لەئەزموونی بۆلشەویك زیاتر جێگای خۆی لەمێژوودا دەکاتەوە.

وەلێ ئێمە ئێستا بە ئاستی نەتەوەیی و تەنانەت بەناوەرۆکی پارتییەوە خەریکین. ئێمە نەك تەنیا بەبونیادی نەتەوەکانی دیکە تەنانەت بەئاستە سیاسیە جیاجیاکانی کوردستان و هەروەها بەپێشخستنی ئاستی ناوەوەی خۆمانەوە خەریکین و شتی هەرەراستیش ئەمەیە. تەنانەت من لەنێو PKK دا بەکەسێك خەریك بووم, خەریکی خودی خۆم بووم, خەریکی خەباتگێر بووم. بێگومان شتی هەرە راستیش ئەمەیە و ئەمەش بەباشترین شێوە ئەنجامگیر دەبێت.

**"پێکی دەهێنین, بەرهەم دەهێنین, تێکۆشانێکی راست بەرێوە دەبەین"**

شیکردنەوەکان تادوارادە تاکە کەسی لەخۆوە گرتووە؛ بەجۆرێك لەوردترین کون و کەلەبەرەکانی تاکە کەسیش قوولبۆتەوە. راستینەی شێوازی ئەمە دەرکەوتووەتە روو. خۆی لەخۆیدا سۆسیالیزم ئایدیۆلۆژیایەکە لەهەر شتێك زیاتر پەیوەندیدارە بەمرۆڤ و لەدۆگماکان دوورە و توانستی بینینی مرۆڤ لەهەموو رەهەندێکەوە, مەیسەر دەکات. ئێمەش بەم جۆرە واتامان بەخشییە ئەمە و پێکمان هێنا. دەرئەنجام ئەو مرۆڤەی کە کراوەتە گرێکوێرە و بەئاژەڵ کراوە, لەنێو PKK دا گەیشتووە بەمرۆڤێکی شکۆمەند و توانستی چارەسەرکردنی لەلا پەیدا بووە.

بە گەیشتن بەمرۆڤێکی وەها لەنێو PKK دا گەیشتن بەئاستی نەتەوەیی و چالاکی و بەلاوەنانی شەری تایبەتی دڕندەترین فاشیست, جێبەجێ بووە. ئەمە پێشکەوتنێکی مەزنە و سەلمێندراوە. بەهای مەزنی نێونەتەوەیی بوونی PKK ش لێرەوە دەردەکەوێتە روو, چونکە

لەپشت ئـەو شـەڕە تایبەتـەی کـە تـورك دەیسـەپێنێ، ئـەورووپا و ئـەمریکا و پاشـڤەڕۆیەتی خۆرهـەڵاتی ناوەڕاسـت هەیـە و ئەوانـە سـات بەسـات چـاوەڕوانی سـەرکەوتنی شـەڕی قڕێـژ و گـەماریان دەکـرد. هـەر بۆیـە ئـەو شـەڕەی کـە لـەنێو PKK دا بـەڕێوەمان بـرد شـەڕێکی ئەنتەرناسیۆنالیزمی مەزنە، واتە هەم لایەنی نەتەوەیی و هەم لایەنی ئەنتەرناسیۆنالیستیشی هەیـــە. لایـــەنی نەتـــەوەیی لـــەدژی سیاســـەتی قڕکردنـــی داگیرکـــەری و، لایـــەنی ئەنتەرناسیۆنالیستیشی لـەدژی هـەموو ئـەو هێزانەیـە کـە خاوەنـداریێتی لەشـەڕی تایبـەتی فاشیست دەکەن.

بێگومان ئەمە نرخ و بەهایەکی مەزنی ئەنتەرناسیۆنالیزمی هەیە.

لەنێو ئێمەدا مرۆڤ لەهەمان کاتدا بەرهەم دەئافرێنێ.

بەرهەمی سیاسی، ئایدیۆلۆژی ئەم مرۆڤە، بەرهەمی سەرلەنوێی پارتییە.

چونکە لەقۆناخە گرنگەکانی پارتیمان نزیکبوونی خوڵقکاری هەیە. هەڵسەنگاندنی راستی هـەر قۆناخێـك، دیـاریکردنی ئەرکـەکان و بـەگوێرەی ئـەوەش پـەروەردەکردن و پێگەیانـدنی مرۆڤـەکانمان و خسـتنە نێـو شـەڕیان، جێگـەی باسـە. دەرئـەنجام، ئـەوەی کـە PKK دەکاتـە پارتێك یاخود رێکخستنێك کە شکست نەناسێ، پێشکەوتنی بەردەوامانەیـەتی. لـەنێو ئـەوەدا چـەمکی راسـتی خـەباتگێڕ و سـەرۆکایەتی هەیـە؛ ئەمـە تادێـت بـەرەو چـەمکی راسـتی فەرمانـدەیی و سـەربازی دەچێت. ئەگـەر ئـەم چـەمکە بـەتێکڕای ئـەم لایەنانـەوە بـەقووڵی بەردەوام بکرێت، ئەوا بۆی هەیە رێگا لەپێش سوپایەکی زۆر مەزن بکاتەوە.

پێشکەوتنی سوپایەکی مەزنی گەل لەکوردستاندا، لەتوانایـدا هەیـە خۆرهـەڵاتی ناوەڕاسـت بهەژێنێ. ئەم سوپایە دەرئەنجام دیموکراسی و سۆسیالیزم و ئەنتەرناسیۆنالیزم لەگـەڵ خۆیـدا دەهێنێ.

ئەمانە پێشدەکەون؛ ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە دەبێ لەلایەن ئێمـەوە ئەمـە بسـەلمێنرێ. بـۆ نموونـە مـن خـۆم وەکـو سـەلماندنێکی مـەزنیش لەقەڵـەم دەدەم. پابەنـدبوونم بەسۆسـیالیزم، سەلماندنی خۆمە، لەم لایەنـەوە. ئەگـەر مرۆڤـی سۆسـیالیزم بـەم جـۆرە خـۆی بسـەلمێنێ، ئـەوا ئەمە دەبێتە وەڵامێکی مەزن. بێگومان نەك تەنیا لەنێو راستینەی نەتەوەییـدا، بـەڵکو لـەنێو راسـتینەی نێونەتەوەییشـدا هـەموو کەسـێك دەتوانـێ ئێمـە وەکـو سۆسیالیسـتێکی راسـتەقینە پێناسە بکات. سەرمایەدارەکان سـەرەڕای تـەواوی هـەوڵ و کۆششـەکانیان هێزیـان بەشـی ئـەوە ناکـات پێشـکەوتنی ئێمـە و بەتایبـەت ئـەو تێکۆشـانەی لەکەسـایەتی ئێمـەدا بەڕێوەدەچـێ، ئاسـتەنگی بـۆ دروسـت بکـەن. گوایـە سیسـتەمی سۆسـیالیزمی بونیـادنراو پەرتـەوازە بـووە و، سۆسـیالیزم بـێ بـەهابووە! ئەگـەر ئەمـە راسـت بێـت ئـەدی بۆچـی نـاتوانن ببنـە بەربەسـت لەبەرامبـەر مـن؟ چـونکە مـن خـۆم بەڕاسـتی بەرهـەم دێـنم، بەڕاسـتی دەژێـنم و بەڕاسـتی

تێکۆشان بەڕێوەدەبەم. ئەگەرچی من لەشوێنێکی تەنگ و سنووردار دام, وەلێ ئەوەی کە گرنگە خۆ بەڕاستی پێگەیاندن بەئایدیۆلۆگ کردن, سیاسی کردن, بەگەل کردن و بەمرۆڤ کردنە. دەرئەنجامی ئەمەش پێشکەوتنێکە کە هیچ کەسێك ناتوانێت پێشی لێ بگرێت. هەروەها ئەم پێنج, دە ساڵەی دوایی کە تێیدا سەرمایەداری خۆی لەهەر کات سەرکەوتووتر بینیوە, گۆڕی بۆ ساڵی گەورەترین پێشکەوتن.

لەکاتێکدا کە گوایە سۆسیالیزمی بونیادنراو هەڵوەشاوەتەوە و سەرمایەداری سەرکەوتنی بەدەست هێناوە, کەچی لەلایەکی دیکەدا ئێمە قازانجمان کردووە و ئەمەش لەخۆوە نەهاتۆتە ئاراوە. لە راستیدا ئەوەی قازانجی کرد سەرمایەداری نەبوو, بەڵکو ئەوەی کە لەنێو چوو, تەنیا لایەنی پووچی سۆسیالیزم بوو.

هەروەها لەنێو جوڵانەوەیەکی وەکو ئێمەدا کە هەرچەندە لە رەوشێکی دژواردا ژیانی بەسەربردووە, وەلێ نە لەلایەنی سەرمایەداری, نە لەلایەنی سۆسیالیزمی بونیادنراودا رەوایی پێ نەدراوە, بەڵام قۆناخی تێکچوونی ئەوان, وەکو دەرفەتێکی باش هەڵدەسەنگێنێ و, سەرکەوتنی دەرکەوتنێکی سۆسیالیستی راستەقینە بەدەست هاتووە. بە بەڕێوەبردنی ئەوانە بەتاکتیکی گونجاو لەژێر رێبەرایەتی PKK دا پێکهاتووە. ئەگەر خیانەتی لێ نەکرێت, ئەوا ئەو ئاستەی بەدەست هاتووە لەتوانایدا هەیە سەرکەوتن بەدەست بهێنێ. بەکەسایەتییەکی سۆسیالیستی کە بەشێوەیەکی هەرە راست مرۆڤ هەڵدەسەنگێنێ, ئێمە گەیشتینە ئەم هێزە. ئەمەش سەرکەوتنێکی مەزنە بۆ مرۆڤایەتی.

پێویستە ئێوە ئەمە جێبەجێ بکەن, تاوەکو بەهەزاران پێکهێنەری سۆسیالیزم دەربکەون. ئێوە دەتوانن بیر بکەنەوە و لایەنی سەرکەوتنی ئەوە بەدەست بهێنن. وەلێ پێویستە تێبکۆشن. سۆسیالیزم بەواتای تیۆری, تاکتیك, خەبات کردن و بەمرۆڤ بوون دێت. بەتایبەتیش بۆ میللەتێکی وەکو ئێمە کە کراوە بەئاژەڵ, بەواتای بانگێشەیەکی هەرە مەزنی مرۆڤ و هەڵسەنگاندنی مرۆڤ و سەرلەنوێ خۆ ئاواکردنەوەی مرۆڤ دێت. مۆدێلی ئێمە یان شێوازی جێبەجێ کردنی ئێمە کە دەتەوێن پێکیبهێنن با ببێتە هێزی پێکهێنانی ئێوە؛ ئەو کاتە دەبینن کە ئاستی قازانج کردن چۆن پێشخراوە. وەلێ ئەوەش وەکو گوتم زانستی و ئیرادەییە, هێزی هزر و پراکتیکە, تیۆری و چالاکییە. ئەوانە بەیەکەوە و بەجۆرێك دەبێ کە لەگەڵ یاسا بگونجێت, دەبێ بزانن تا دواڕادە گرێدانی خۆتان بەئەندازەی ستراتیژ بەبنەماکانی تاکتیك دروستبکەن. ئێوە خەباتگێڕێکی پتەون و وەکو چۆن نەتوانراوە من رابوەستێنن, بەهەمان شێوەش ئەم خەباتگێڕییە کەس ناتوانێ بیوەستێنێ.

بێگومان رۆڵی مێژوویی تاکە مرۆڤێك سنووردارە. ناتوانیت ئەو بخەیتە سەرووی سرووشت, هەروەها ناتوانیت تێکڕای چاخەکان لەکەسێتی ئەودا بەبنەما وەربگری. بێگومان

رۆڵی مێژوویی تاکە مرۆڤێکیش هەیە و ئەو رۆڵەش دەنوێنێ, وەلێ ئەوانەی لەدوای ئەوەوە دێن, ئەو بەهایانە تەواو دەکەن. تەنانەت لە رۆژگاری ئەمرۆشماندا سەرۆکایەتی دەزگایەکە و رۆڵی ئەو دەزگایە هەیە. هاوکات رۆڵی خەباتگێریش وەکو دەزگایەکە و رۆڵی ئەویش هەیە. ئەگەر هەر کەسێك بەپێی پێویست رۆڵی خۆی بەگوێرەی شوێن و جێگای خۆی بگێڕێ, ئەوا ئەو کارە سەرکەوتووتر دەبێت. ئەگەر پێی مرۆڤێك ببڕدرێتەوە ئەو مرۆڤە سەقەت دەبێت. هەر بۆیە ئێمە شێوە پارتییەك بەبنەما دەگرین کە هەر کەسێك بتوانێ رۆڵی خۆی تێدا بگێڕێ. ئەگەر بەشێوەیەکی هاوسەنگ بەرەی پارتی و سوپاکەی و خەباتی گەل و خەباتی سەربازی و رێکخستنی ناوەوە و چۆنییەتی ئایدیۆلۆژی و ئاراستەی سیاسی بەڕێوە ببرێ, ئەوا ئەو پارتییە یان ئەو دەزگای سەرۆکایەتییە بنکەوتنی بۆ نییە.

ئەزموونی PKK لەمە پێك دێت. تێنەگەیشتنی ئێوە لە هەموو لایەنێکەوە کەموکورتی ئێوەیە. هەر بۆیە بەئێوە دەڵێم کە:" رەوشێك هەیە و پێکهاتووە."

من لەگۆڕەپانی نێو نەتەوەییدا دەژیم.

بۆچی ناتوانن یەك میلیم لەشوێنی خۆم پاشەکشەم پێبکەن؟ بە پێچەوانەوە هەر رۆژ حاکمیەت و کاریگەری خۆم زیاتر پێشدەخەم. چونکە من هەڵسەنگاندنی جیهان و, هەڵسەنگاندنی پەیوەندییەکانم بە شێوەیەکی راست و دروست ئەنجامدەدەم. من سۆسیالیستێکی واقیعیم. من لەکوێ و چۆن بجووڵێمەوە, لە کوێ و چۆن چ تاکتیکێك بەڕێوە ببەم, لە کوێ و چۆن هزری دۆستایەتی دەسەپێنم, لە کوێ و چۆن رێککەوتن دەکەم, لە کوێ و چۆن هەڵوێستی خۆم دادەنێم؟ من تەواوی ئەوانەم بەشێوەیەکی واقیعی جێبەجێ کرد. بەرۆح و زانیاری خۆم و هەنگاوی گونجاو, ئەمانە جێبەجێ دەکەم.

من سەردەکەوم و بەسەرکەوتوویی دەژیم. پێویستە ئێوە نەڵێن کە:" تۆ موعجیزە و خەیاڵیت."

من تا دواڕادە زانستیم.

واقیع بینم.

بەگوێرەی هەمووتان, بەگوێرەی راستی کوردستان و, بەگوێرەی راستی نێونەتەوەیی, من کەسێکم هەتا دوایی گرێدراوی ژیانم. PKK ش پارتییەکی وەهایە کە هەوڵدەدات وەکو ئێمە بێت. ئەگەر PKK سەرکەوتنی خۆی دوانەخات و, هەندێ کەس لەناوەوە و لەدەرەوە دووچاری شکستی نەکەن, ئەوا شێوازی ئێمە تابێت حاکم دەبێت, ئەمەش بەتەواوی دەبێتە سەرکەوتن. ئەگەر ئێوە ئەمە بەهەموو لایەنەکانییەوە ببینن, هەڵبەتە ئەوکاتە بەرپرسیارییەك دەکەوێتە ئەستۆتان. ئەگەر وەڵامی راست بۆ پێداویستی ئاستی رێکخستنی ــ سیاسی و ئایدیۆلۆژی بدەنەوە, کە ئەمەش لەئێوە دەخوازرێ. ئەوا دەبنە بەشداربوویەکی باش. ئەوکەسەی بەشداربوونێکی باش بکات, ئەوا کارێکی باش دەکات و سەرکەوتن بەدەست

دێنێ. وەلێ ئەگەر ئێوە چاو لەمانە بگرن و کێشەکان نەبینن و، نەکەونە سەر ڕێی چارەسەری، ئەوا مەحاڵە بە ئاسانی بڵێن:" با سەرکەوتن بێت ،" ئەمە نابێ. ئەگەر گرێدانی خۆتان بە ڕێکخستن و ئایدیۆلۆژی زانستییەوە دابڕێنن و دەست لەسەرکەوتن بەربدەن، ئەوا ئەوکاتە دەبنە هۆکاری شکستێکی زۆر گران و، لەگەڵ خۆشتاندا، ڕەنگە گەلێك کەس و گەلێك شت لەناو ببەن و، گەلێك لەئێوەش بەمجۆرەن. ئەو ئاستەی کە ئێمە ئەمڕۆ لەPKK دا پێی گەیشتووین، هەم زۆر بەکاریگەرە و، هەم ئاستێکی مێژوویی سیاسی ـ ئایدیۆلۆژی پێکهاتووە.

بەتایبەت کاتێ مرۆڤ بەگوێرەی راستینەی نێونەتەوەیی دەیپێوێ، ئەوا بەبەراوردکردن لەگەڵ سۆسیالیزمی هەڵوەشاوە و پارتییە فەرمییە کۆمۆنیستەکان، کە هەندێکیان ماوە لەنێو بچن، پارتی ئێمە تادێت هێز قازانج دەکات و تادێت دەبێتە خاوەن بانگەشەی مەزن. ئێمە خۆمان مەزن نابینین وەلێ ئێمە یەکێك لەو پارتییانەین کە خاوەن بانگەشەیەکی مەزن و ئەنتەرناسیۆنالیزمێکی گونجاوین.

شۆڕشی کوردستان، شۆڕشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستە.

شۆڕشی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیش لەواتای نێونەتەوەییدا دەبێتە شۆڕشێکی هەرە پێشکەوتوو و هەرە ئەنجامگیر.

کاتێك کە تەواوی ئەمانە هەڵدەسەنگێنین بەپێویستم نەزانی لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا تایبەتمەندییەکانی ئایدیۆلۆژیایی ئایینی ( کە دەیەوێت بەکاریگەر بێت)، هەڵبسەنگێنم، تەنانەت ئەم تایبەتمەندییە دەبێتە پارتی و، بەخێرایی دەسەڵات بەدەست دێنێ، ئەم تایبەتمەندییانەش دەبێ بە بەرفراوانی گفتوگۆی لەسەر بکرێ.

بەتایبەت لەخۆرهەڵاتی ناوین وشیاربوونەوەیەکی نوێی ئیسلامی، یان پێشکەوتنێکی بەشێوەی دەوڵەت بوون لەئارادایە. بێگومان ئەمەش دەتوانرێت وەکو رۆژەڤێکی ( بابەتێکی بەرفراوانی گفتوگۆ ) لەپەیوەندییەکانی نێوان ئیسلامی راستەقینە و کێشە رۆژانەییەکان و کێشە نەتەوایەتی و چینایەتییەکان بەدەستەوە بگیرێت.

جگە لەوەش نەتەوەپەرستی بۆرژوازی و بۆرژوازی بچووك و بەکرێگیراویش هەیە. بەگوێرەی ئەمەش وەك چۆن لەهەموو جیهاندا رێکخراوی هەیە، ئەوا لەخۆرهەڵاتی ناوین و بەتایبەت لەکوردستان دەیانەوێ تادواڕادە بەکاریگەر بێت. هەروەکو چۆن لەڕابردوودا لایەنە ئایدیۆلۆژی و سیاسی و رێکخستنەکانی بە چ واتایەك دەهات، ئەوا ئەمڕۆش دەتوانرێ ئەو لایەنانە بەباشترین شێوە ببینرێ. بەتایبەتی مۆدێلێکی بەکرێگیراوی لەباشوور پێکهاتووە کە کۆمەڵێك داخوازی ریفۆرمیستانەی هەیە. لەڕابردوودا ئەوانەمان زۆر رەخنە کرد و ئەوانەش رەخنەی راست بوون.

ئێستا دەتوانین ئەم رەخنانە زیاتر بکەینە رۆژانەیی.

ئەوانـە لەبەرامبـەر جولانەوەکەمانـدا لـە چ رەوشـێکدان, چـۆن لێیـان نزیـك دەبینـەوە. لەبواری سیاسییەوە چۆن نزیکی جولانـەوەی ئیسلامی, نەتەوەپەرستی و بۆرژوازی بچووك, نەتەوەپەرستانی بـۆرژوازی بچووك, دەولـەتی فیـدارلی مـۆدێرنی بـەکرێگیراو دەبینـەوە؟ چ توانستێ هەیە بۆ شیکردنەوەی سیاسییانەی زاراوەی ناسراو بەرێبازی چارەسەری سیاسییانە؟ ئەگـەر شـتێکی بـەمجۆرە لەئارادایـە گرێـدراوی چـییە؟ لـەکام ئاسـتی سـەربازیدا چارەسـەری سیاسییانە لەبار و گونجاوە؟ سەپاندنی فیدراسیۆن بەسەر تورکیا وەکو قۆناخێك لـەکام واتادا راستە و واقیعبینانەیە. لە رووی گەوهەرەوە چ جۆرە فیدراسیۆنێك دەتوانێ بێنێتە ئاراوە؟ چ پەیوەندییـەکی لەگـەڵ دیموکراسـییەتی تورکیـا و تێکۆشـان لەپێناویـدا هەیـە؟ لـەم واتایـەدا پێشـکەوتنی چـەپی تورکیـا یـان هێـزە شۆڕشـگێڕەکانی تورکیـا چ واتایـەك دەبەخشـێ, چ کاریگەرییەکیان دەبێ هەبێ, پێویستە ئەوان پەلکێشی چ جۆرە پێشکەوتنێك بکەین؟ پێویست دەکات ئەم تایبەتمەندییانە بەشێوەی مانشێتی جیاجیا و بەبەرفراوانی لێکۆلینـەوەی لەسـەر بکرێـت. هـەروەها پەیوەندییـە سیاسـییەکان بـەئیمپریالیزم, ئـەوروپا, ئـەمریکا و تەنانـەت بەدەولەتـە جۆربـەجۆرەکانی ناوچـەی خۆرهـەلاتی نـاوین بـەچ واتایـەك دێـت؟ ئایـا نـەبوونی پەیوەندی راستە؟ ئەگەر راست نەبێت و پەیوەندی سیاسی وەکو پەیوەندییـەکی تەسلیمییەت نەبینرێ, ئەوا شێوەی راستی ئەوە چییە؟ لەشوێنی نموونەی دەولەتی فیدراسیۆنی بەکرێگیراو یان دامەزراوەی دیکەی دەستەیەك بۆرژوارزی بچووك کـە پەیوەنـدی سیاسی بەشێوازی خـۆ بەدەستەوەدان بەدەستەوە دەگرێت, هەلوێستی راسـت بـۆ بەسـتنی پەیوەنـدی لەگـەڵ تورکیـا, دەولەتانی ناوچە و هەروەها ئەمریکاش بێ قەرەبوو (تعويض)دان لـە سـەربەخۆیی و ئـازادی چییە؟ دەتوانرێ لەتەواوی ئەم بابەتانەدا هەم زاراوەکـان, هـەم ئاسـتی پێشـکەوتنی پراکتیکـی هەلبسەنگێنرێ. ئەو هەلسەنگاندنانەی دەکرێن دەتوانرێت پێش بخرێن. ئێمە ناخوازین زیاتر بکەوینە نێو کون و کەلەبەرەکانی ئەم تایبەتمەندییانە. ئەوەی کـە بـۆ ئێمـە پێویسـت دەکـات کون و کەلەبـەرەکان نییـە, بـەلکو خسـتنەڕووی ئـەم بنەمایەیـە. سـەرەڕای ئەمـەش لەگـەلێك هەلسەنگاندنـدا کون و کەلەبەریشمان دەرخستۆتە روو. PKK لەم رووەوە خاوەنی توانستێکی بـەهێزی هەلسـەنگاندنە و, ئەمـەش تـادواڕادە سـەلمێنراوە. بێگومـان ئەوانـەی کـە لـەدۆزی پارتیماندا خاوەن بانگەشەن, هێندەی نان و ئاو پێوستییان بەمـە هەیـە. بەگەیشـتن بەمـەش, بۆ خودی خۆشیان ئـەو ئەنجامـەی پێویسـت دەکات دەری دەخەنـە روو, ئـەو شـتانەی لەئێمـە خوازراوە هەر لەزووەوە پێشکەش کراوە. ئەوەی ماوەتەوە تەنیا ئەوەیـە کـە فێـر ببن و ببنـە خەباتێگێڕی پارتی.

هیچ کەسێك ناتوانێ بانگەشەی ئەوە بکات, وەك گەلێك کەس باوەڕ دەکەن, کە جولانەوەی PKK هـەر لـەخۆوە و بـە چـەند چـالاکییەك بـەرێوە دەچـێت. لـەو بـاوەڕەدام پـێم وانییـە ئەوانەی کە کراون هەمووی جولانەوەی سەربازی بووبن.

هەندێ هەوڵ و کۆشش هەیە, وەلێ مسۆگەر ئەمانەش (هەروەکو PKK پێشبینی دەکرد) پێویستی بەرێکخستنێك هەیە. هەر لەسەرەتای تێکۆشاندا ئەمەمان گوت و ئێستاکەش جەختی لەسەر دەکەینەوە. تا ئێستاش کێشەیەك کە لەبەرامبەرمان بەهەڵواسراوەیی ماوەتەوە, رێبازێکی سەربازی و رێکخستنی وەهایە کە PKK پەسندی بکات.

لەپاڵ ئەمانەدا رێکخستنی گەلیش کێشەیەکە. تەنانەت لەم گۆڕەپانەشدا لەواتای دەربازکردنی ئایدیۆلۆژیادا, کێشە لەئارادایە. پڕوپاگەندە و ئاژیتاسیۆنی ئایدیۆلۆژی لەڕێگای ئۆرگانەکانی راگەیاندن, ئەرکێکی جددییە. بەکارهێنانی رۆژنامەکانی پارتی بەشێوەیەکی راست کە رۆڵی گونجاوی ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆژی بگێڕێت, سنووردارە, ئەگەرچی توانستی راگەیاندنی زۆر مەزنمان هەیە, وەلێ بەکار ناهێنرێن و بەپێی پێویستیش وەکو دەخوازرێت پڕوپاگەندە ناکرێت و رێك ناخرێت, وەکو ئامرازێکیش زۆر بەهای لەبەرچاو ناگیرێ. لەڕووی کێشەی ئایدیۆلۆژیشدا پێویستە ئەمە ببینرێت؛ واتە پێویستە بۆ بڵاوکردنەوەی ئایدیۆلۆژیا, راگەیاندن بەبنەما بگیردرێ. ئێستاکەش کەمێك ماوە کە تەلەفیزیۆن بکەوێتە گەڕ و هەرچەندەش بخوازرێت دەکرێ رادیۆش دروست بکرێت. راگەیاندن خۆی لەخۆیدا لەئارادایە و ئاشکراشە ــ لەدەرەوە و ناوەوەی وڵاتیش توانستی گرنگ هەیە ــ پێویستە ئەمانە بەباشی بەکار بهێنرێت.

لایەنی سیاسیش رەوشی پێشکەوتنی زۆر مەزنی دەرخستۆتە ڕوو. ئەمڕۆ بەملیۆنان کەس لەجەماوەر شێلگیرانە وەکو برسی پێداویستی بۆ بەسیاسی بوون دەبینن. نوێنەرێکی باشی پارتی دەتوانێ ئەوانە (جەماوەر) بگەیەنێتە رێکخستنێکی سیاسی. بەمرەنگە لە هەر شوێنێکدا کە گەل بتەوێت دەتوانێ دەسەڵات بگرێتە دەست و ببێتە نوێنەری ئەو. بۆیە پێویستە راستینەی نوێنەرایەتی پارتی و نوێنەرایەتی دیموکراسی بەڕێوە ببرێت. ئیدی ئەوەی بخوازێ دەتوانێ بەئەندازەی هیواکانی رێکخستن دابمەزرێ.

هەروەکو گوتم توانست و دەرفەتی چارەسەری تا دواڕادە هەیە.

دەبینن کە ئاستی پێکهێنانی ئایدیۆلۆژی ــ سیاسی PKK پێشکەوتنێکە کە تەنیا نەتەوەیی, تەنانەت شیاوی قۆناخێکی مێژوویش نییە, بەڵکو لەئاستێکی وەهادایە کە واتای ناوچەیی و نێونەتەوەییش لەخۆوە دەگرێ و هەم دۆست و هەم دوژمنیش بەرێزێکی زۆرەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن. بێگومان ئێوە وەکو خەباتگێڕانی ئەم پارتییە, پێویستە بەئەندازەی بینینی ئەم ئاستە و تێگەیشتنی ئەمانە بەتەواوی بنەما سیاسی و ئایدیۆلۆژییەکانەوە, لەهەمووان زیاتر لەڕێگای گەیشتنە شیکردنەوە بەشێوازی هەرە وردبینانە و لەهەمووانیش گرنگتر پێکهێنانی ئاستی بەدیهاتن و سەرکەوتن لەخودی خۆتاندا, هەروەها هەڵگرتنی قەڵەمبازێك لەخۆتاندا و بەم شێوەیە یەکبوون لەگەڵ راستینەی سیاسی و ئایدیۆلۆژی پارتی, تەواو بکەن. ئەگەر ئەمە پێك بهێنن, ئەوا دەبێتە پێشکەوتنێکی بێ بەراورد و بۆ ئێوە

دەبێتە مایەی سەرکەوتنێکی گەلێك مەزن. پارتییەك کە سەرلەنوێ بەخەباتگێڕی بەمجۆرە پێکبێت، بەهەمان ئەندازەی کە باوەڕی سەرەکی بەسەرکەوتنە، بەهەمان رادەش ئەو کاروانی سەرکەوتنەی کە دەیگرێتە بەر، بێ پسانەوە بەئەنجامی دەگەیەنێت.

# هیچ کاتێك ئەمریکا و دەوڵەتی تورکیا ئەم وتەیە لەئێمە نابیسن کە بڵێین: " ئەو تێکۆشانەی بەڕێوەمان بردووە تیرۆریزمە "

**دەیڤید. ئە. کۆرن:** بەڕێز عەبدوڵڵا ئۆجەلان، سەرۆکی گشتی پارتی کرێکارانی کوردستان! پێش چەند ساڵێك بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کاروباری دیپلۆماسیم دەکرد، ئێستاکە خانەنشین بووم. لەم میانەدا هەروەکو چۆن بەچڕوپڕی سەبارەت بەکێشەی کورد بابەتم دەنووسی، لەم دواییانەشدا هەمان شت سەبارەت بەکوردانی تورکیا، ئەنجام دەدەم.

ئێستا دەخوازم دەرهەق بە PKK لێتوێژینەوە بکەم و لەسەری بنووسم. دەخوازم ئەمە دیار بکەم؛ پێم وایە کە لەلایەن میدیای نێودەوڵەتی، PKK بەشێوەیەکی زۆر رووکەشیانە و

سادە و ساکار ناسێنراوە و باسی لێوە کراوە. بۆ ئەم نووسراوەشم, خواستم لەگەڵ ئێوە چاوپێکەوتنێك ئەنجام بدەم. بەداخەوە لەبەر ئەوەی نەمتوانی سەردانی خۆرهەڵاتی ناوین بکەم, ناچارمام پرسیارەکانم بەشێوەی نووسراو ئامادە بکەم. هەربەدەم ئەم بیرکردنەوەیەوە پرسیارەکانم ئامادە کرد. هەر لەئێستاوەش دەتوانم بۆ وەڵامدانەوەتان سوپاسی خۆم رابگەیەنم. درێژەی وەڵامەکانیش, بۆ ئێوە بەجێ دەهێڵم. باوەڕ دەکەم کە ئەم تکایەم پەسند بکەن و هەر لەئێستاشەوە, سوپاستان دەکەم.

**عەبدوڵڵا ئۆجەلان:** سوپاسی پەیوەندیداربوونتان دەکەم, بەرێز دەیڤید. ئە. گۆرن . ئەمە جاری یەکەمە کە دیپلۆماتێك لەدەوڵەتی ئەمریکادا ئەرکی وەرگرتبێ و وەکو کەسێك بتەوێت لەسەر رەوشی گەلی کورد بابەت بنووسێ, ئەو پەیوەندی دارییەی کە سەبارەت بەPKK دیاریتان کرد, بەهادار و واتادارە. هەروەکو لەسەرەتاوەش دیاریتان کرد, بەڕاستی دەخوازرێ سەبارەت بەپارتیمان ناهەقترین و شێواوترین بیر و بۆچوونی, لەئاستی رای گشتی نێودەڵەتی, پێشبخرێ. بێگومان, ئێوەش زۆر بەباشی دەزانن کە لەپێشخستنی بیر و بۆچوونی چەواشە و پێچەوانە تا ئەم ئەندازەیە, دەوڵەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا جێگایەکی سەنگینی هەیە.

دەتوانم ئەوە بەبیر بهێنمەوە کە ئەمڕۆ بریکاری سەرۆکی CIA لەگۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا پارتیمان وەکو نوێنەری هەرە مەزنی تیرۆریزم ناوەزد دەکات و بەسانایش لەکۆمیسیۆنە جیاجیاکانیشدا ئەم تێڕوانینە درێژە پێدەدات. ئەو بەڕێزە, کەسێکی هەروا سادە نییە. هەروەها دەرك بەوەش دەکەن کە CIA لە ئاستی جیهاندا چ رێکخراوێکی بەکاریگەرە. بێ ئەوەی لەگەڵ ئێمە چاوپێکەوتن بکەن, یاخود بێ ئەوەی لەڕاستی ئێمە بکۆڵنەوە, ئەگەر لێکۆڵینەوەش بکەن, ئەوا راگەیاندنێکی یەکلایەنەی بەمجۆرە مەترسیدارە. لەڕاستیدا گەلێکی کە بۆتە قوربانی هەرەمەزنی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی و, PKK یەك کە جگە لەئامانج و رێگای بەکارهێنانی مافی پیرۆزی بەرگری کردن, هیچ رێگایەکی دیکەی نەماوە و, هەڵسەنگاندنێکی بەمجۆرە هەم بێ بەختییەکی مەزنە و, هەم شێوازی دوژمنایەتییەکی وەهایە کە هیچ سنوورێك ناناسێت.

گەلێك کە ڕووبەڕووی قۆناخی قڕکردن بووبێتەوە, تەنیا و تەنیا جگە لە بەرەوپێش بردنی ناسنامەی نەتەوەیی و داخوازییە نەتەوەیی ـ دیموکراسییەکانی, کێشەیەکی دیکەی نییە. لێرەدا بۆچی بەرخۆدان لەدژی ژینۆساید ببێتە تیرۆریزمی نێودەوڵەتی؟ ئەمە هەڵسەنگاندنێکی ناڕەوایە و تەنیا بیر و بۆچوونێکی ئیمپریالیزمە کە هیچ سنوورێك ناناسێ. ئەمەش پەیوەندی بەدادپەروەری و مرۆڤایەتی و تەنانەت راستییە سیاسییە ئاساییەکانیشەوە نییە. ئەمە تێڕوانینێکی ئۆترا ئیمپریالیستییانەیە, کە بوختانکردن بە PKK وەکو مەعریفەت دەبینن.

بەڕێز بریکاری CIA باش دەزانێت کە, ئێمە ئەمڕۆ ئەو گەلەین قوربانی هەرەمەزنی تیرۆریزمین. باش دەزانرێت کە هەر لەسەروبەندی مێژووەوە بەربەریەتی کۆماری تورکیا هێزی ڕەشەکوژی گەلان و کولتوورەکانە. پێداویستی ڕەهای مرۆڤایەتی, پێداویستی هیومانیزم, مافی پیرۆزی ژیانی خۆی, مافی ناسنامە و, ڕەشەکوژی, بەبیروبۆچوونێکی ئاوەژووی بەمجۆرە, بەقورسترین تاوانبارکردن هەڵدەسەنگێنین. ئەمە بۆ ئێوە بەجێ دەهێڵم کە ئەم بیر و بۆچوونە نزیکە لەبیروبۆچوونی فەرمی ئەمریکا و, ئێوەش لەنزیکەوە ئەمە دەزانن. بەڕاستی هەوڵ دەدەم تێبگەم کە بەرژەوەندی ئەمریکا وەکو دەوڵەت تا چ ڕادەیەك گرێدراوە بەو بیر و بۆچوونانەوە. لەسەر ئەم بنەمایە پرسیارەکانت وەکو ڕوونیشمان کردەوە, پێناسەکردنی ( ناساندنی ) PKK بەوجۆرە سادەییە و هەڵەیە, تاڕادەیەك بەلاوە دەنێت. بەوجۆرەش باوەڕ دەکەم کە لەڕێگای ئەو وەڵامانەی دەیدەینەوە ئەگەر کەمێکیش بێت, ئەوا ئەو هەڵسەنگاندنە هەڵانە نامێنێت و بەلاوە دەنرێت.

هەر بەم هۆیەشەوە, ئومێدەوارم کە تاڕادەیەك چەمکی نزیك لەڕاستی, بەرجەستە بکەن, خوازیارم کە ئەمریکا بگاتە ڕەوشێك کە تێڕوانینەکانی سەبارەت بە ئێمە, لەڕێگای ئێوەوە تاڕادەیەك ڕاست بکاتەوە. دیسان بۆ پەیوەندیداربوونتان سوپاستان دەکەم.

**"کاردانەوە و کینی ئێمە لەبەرامبەر هەموو ئەو ئایدیۆلۆژیانە هەیە کە پێشکەوتنی تاکەکەس, ئاستەنگ دەکەن"**

**دەیڤید. ئە. کۆرن:** بەڕێز ئۆجەلان, بەشێکی مەزنی ڕاگەیاندنی نێودەوڵەتی, بەردەوامن لەسەر ڕەنگدانەوەی ئەوەی کە PKK وەکو " ڕێکخستنێکی جوداخوازە " باس لەوە دەکەن کە " دەڵێن " ئامانجی PKK دامەزراندنی " دەوڵەتێکی مارکسی ـ لینینی سەربەخۆیە". ئاخۆ بەڕاستی " سەربەخۆیی " ئامانجی PKK یە؟ جگە لەوەش, ئایا ئایدیۆلۆژیای PKK مارکسیزم ـ لینینیزمییە؟

**عەبدوڵڵا ئۆجەلان:** هەڵسەنگاندن و جەختکردنەوە لەسەر ئەوەی کە پارتیمان ڕێکخراوێکی جوداخوازە و, نرخی ئەوە چی دەبێت بابێت, هەموو شتێکی خستۆتە خزمەتی ئەوەی کە بەدوای دەوڵەتێکی جیاوازەوەیە, زێدەڕۆییە. هەروەها بەراوردکردنی بە هاوشێوەی پارتە کۆمۆنیستە کلاسیکیەکان, هەڵسەنگاندنێکە لەجێگای خۆیدا نییە. هەروەکو ئاماژەمان پێکرد ڕێبازی سیاسی و ئایدیۆلۆژی پارتیمان, وەکو شێوازی کۆمۆنیستی کلاسیکی نییە. ئەگەر بەمجۆرە ببوایە, ئەوا هەروەکو چۆن لەگەڵ هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو, ئەو پارتییانە هەڵوەشانەوە, ئێمەش هەر لەزووەوە هەڵدەوەشاینەوە. دوایین پێشکەوتنە نێودەوڵەتییەکان, بەتایبەت هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی سۆڤیەت, زۆر بەڕوونی ئەوە دەردەخاتە ڕوو کە پێویستە ئێمە بەمشێوەیە هەڵنەسەنگێنرێین. هەڵبەتە هەر لەسەرەتاوە,

ئەو سۆسیالیزمەی کە پارتیمان بەبنەمای گرت راست و دروستە. وەلێ ئەمە سۆسیالیزمێکە کە لەسەر بنەمایەکی زانستی وەرگیراوە. ئێمە لەو باوەڕەداین PKK لەتوانایدایە کە بەشێوەیەکی زانستی راستینەی کۆمەڵگاکان دەستنیشان بکات. تا دێت لەم بابەتەدا چەمکێکی سۆسیالیزمی تایبەت بەخۆمان, پێشدەخەین. ئەمە هەم لەلایەن ئێمە و هەم لەلایەنی ئەو ناوەندانەی کە بەئێمەوە پەیوەندیدارن, بەمجۆرەیە. پێویستە پێشخستنی بیر و بۆچوونی ئایدیۆلۆژی خۆمان و پێداویستی چەمکی مرۆڤایەتی و کۆمەڵگا, بەشێوەیەکی سروشتی بژمێردرێت. کۆمەڵگا و گەل بێ ئایدیۆلۆژیا بوونیان نییە. بەپێی ئەو راستییانەی کە تێیدایە وەکو رێگایەکی چارەسەری, دەتوانێ هەرکام لە ئایدیۆلۆژیایەك, پەسند بکات.

بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا دەتوانین ئەوە بڵێین کە؛ هەروەکو چۆن سۆسیالیزمی بونیادنراو و ئەو پارتانەش کە ئەو ئاراستەی کردوون, راستینەی کوردیان هەڵنەسەنگاندووە, ئەوا لە نکۆڵی لێکردنی تەنانەت لەبەهێزکردنی دەوڵەتی تورکیاش تا ئەو رادەیە, ئامراز و پێداویستی سەرەکییان پێشکەش کردووە.

ئێمە, وەکو پارتی و گەل, لەو سۆسیالیزم و کۆمۆنیزمە زەرەر و زیانمان پێگەیشت.

وەلێ سەرەڕای ئەمەش بەهێز بوونی چەمکی ئازادی و یەکسانیمان, بە ئەندازەی قووڵایی خۆشەویستی مرۆڤە, بۆیە هەموو کاتێ بینینی پێداویستی و پێشخستنی مافی هەر گەلێك بۆ ئازادی و یەکسانی هەیە و تێکۆشانیشی لەپێناودا دەکەین.

ئێمە خاوەن رێبازێکی وەهاین کە بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ گەوهەری مرۆڤ پێشدەکەوێت و لەبەرامبەر هەموو جۆرە نایەکسانی و ناهەقییەکدا, رادەوەستێ؛ ئەمە نەك تەنیا لە نێوان نەتەوەکاندا, تەنانەت نەك تەنیا لەنێوان چینەکاندا؛ لەنێوان ئایینەکاندا, لەنێوان ئایینزاکاندا, لەنێوان رەگەزەکاندا, لەنێوان کولتوورەکان و بەکورتی لەئاستی نەتەوەیی و نێونەتەوەییدا, دژ بە هەموو ئەو چەمك و هەڵوێستانە رادەوەستین کە ئاستەنگن لەبەردەم ئازادبووندا. لەم نێوەندەدا کە پیسبوونی ژینگە, هەڵایسانی ژمارەی دانیشتوان و هەروەها مەترسی " ئەتۆم " تا دێت رەوشێکی زۆر مەترسیدار, بەخۆوە دەگرێت؛ هەڵسەنگاندنی ئێمە وەکو جوڵانەوەیەك کە دەیەوێت ببێتە خاوەن رادیکاڵترین تێڕوانین لەدژی ئەم مەترسییانە و ئەم رایکاڵ بوونەش وەکو پێداویستییەکی چەمکی سۆسیالیستییانە دەبینێت و هەروەها دەیەوێت خۆی وەکو پارتییەکی فرەپرەنسیپ, بخولقێنێ و ببێتە خاوەن چوارچێوەیەکی ئایدیۆلۆژییانەی بەم شێوەیە؛ ئەمەش گەلێك واقیعبینانەترە.

زۆر بەکورتی؛ من لەرەوشێکی وەها نیم کە هەموو رەهەندەکانی ئەوەی کە خاوەن چ جۆرە چەمکێکی سۆسیالیزمین, بۆ ئێوە روون بکەمەوە. بەساڵانە گەلێك هەڵسەنگاندنی جۆربەجۆرمان پێشخست, لەو بڕوایەدام لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن. وەلێ دەتوانم بەئاسانی

ئەوە دیار بکەم کە چەمکی ئێمە بۆ سۆسیالیزم، وەکو ئەو وڵاتانە نابێت کە سۆسیالیزمی بونیادنراو تێیدا باڵادەست بووە و دیموکراسی تێیدا بوونی نەبوو، هەروەها ئەو سۆسیالیزمەش نابێت کە هەرچی لەتوانایدا هەبێ تاکەکەس بچووک بکاتەوە و دەوڵەتیش مەزن بکات.

تەنانەت ئێمە خاوەن چەمکێکی دیموکراسییانەی وەهاین کە لەگەڵێك وڵاتی سەرمایەداری زیاتر، زۆرینە بەبنەما دەگرین؛ بەتوندی پابەندی ئەوەین کە چەمکی دەوڵەت لەواتا کلاسیکییەکەی دەربکەوێت. هەروەها باوەڕیمان بەوە هەیە کە سەرمایەداری دەوڵەتی و هەروەها سۆسیالیزمی پشت بەستوو بەو، نزیکبوونێکی ئابوورییانەیە کە پەسندمان نەکردووە؛ دیسان لەو باوەڕەداین کە پێویستی بە سەر لەنوێ رێکخستنەوەیەکی ئابووری وەها هەیە کە بتوانێ بەشێوەیەکی سەربەست تواناکارییەکانی تاکەکەس پێش بخات.

کاردانەوە و کینمان لەبەرامبەر تەواوی ئەو ئایدیۆلۆژیانەیە کە بەناوی دەوڵەت ئاستەنگی لەبەردەم پێشکەوتنی تاکەکەس دروست دەکەن.

لەم نێوەندەدا، دەمانەوێ ئەمە دیار بکەین کە نەبوونی ئازادی رەهای کولتووری لەپێکهاتەی کۆمەڵگایەکی " مۆنۆلۆتیك " زۆر مەترسیدارترە. بەکورتی چەمکێکی وەهای کە هەر تاکە کەسێك تا دواڕادە کولتوور و تواناکارییە زۆر دەوڵەمەندەکانی بەرەو پێشەوە ببات، یەکێکە لەو پێداویستییانەی ئایدیۆلۆژیاکەمان کە گەلێك بایەخمان پێداوە. بەتایبەت ئێمە تا دواڕادە دوورین لە چەمکە مەترسیدارەکانی وەك دەوڵەت هەموو شتێکە ـ تاکە کەس هیچ شتێك نییە یاخود تاکە کەس هەموو شتێکە ـ، بەرژەوەندییە کۆمەڵایەتییەکان هیچ شتێك نییە، بەرامبەر ئەمانە کاردانەوەی ئێمە هەیە.

ئەو تایبەتمەندییانەی کەهەوڵماندلوە وەك پرەنسیپ پێوەی گرێدراو بین، ئەوەیە کە ئێمە هێندەی پێداویستی کۆمەڵایەتی، مافەکانی تاکە کەس، هێندەی بەرژەوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و رای گشتی بۆ تاکە کەس، بە بنەما دەگرین. لەو باوەڕەدام کە ئەمە بۆ خۆناساندنمان تاڕادەیەك بەس بێت.

**"هێندەی ئەمریکا فیدراڵیزم دەتەوێن"**

ئەگەر بێینە سەر مەسەلەی " جوداخوازی "؛ ئەوا ئێمە لەژێر هەر هەل و مەرجێکدا بێت با ببێت، پێداگری لەسەر " دەوڵەتێکی جودا " ناکەین.

زۆر بە ئاشکرایی ئەو بابەتەی کە دەتەوێن بیڵێین؛ مۆدێلێکی دەوڵەتە، کە مافە سەرەکییە ئابووری، کولتووری، کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی میللەتێك بپارێزرێت. هەروەکو چۆن دەتوانرێت لەژێر سێبەری هەمان دەوڵەت ئەم مافانە بەکار بهێنرێ، ئەوا دەتوانرێ لەژێر سێبەری دەوڵەتێکی جیاوازیشدا بەکار بهێنرێت. ریزبەندی شێوەکانی دەوڵەت، بەشێوەیەکی

ئەوەندە توندئامێزانە ( ڕەها )، یان زۆر ئونیتەر یاخود بەشێوەیەکی جوداخوازانە، لەگەڵ ڕاستییەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان ناگونجێت. ڕاستینەی نێودەوڵەتی جیاوازە.

لەسەردەمێکدا دەژین کە تیایدا تادێت یەکێتییە سیاسییە فرەجۆرەکان پێشدەکەون ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش بۆ خۆی سیستەمێکی دەوڵەتی فیدراڵییە. هەرچەندە ئەڵمانیاش لە یەك نەتەوە پێکدێت، کەچی سیستەمەکەی دەوڵەتی فیدراڵییە، هەرچەندە بەلژیکاش لەنەتەوەی جیاجیا پێکهاتووە، کەچی فیدراسیۆنێکی دوو نەتەوەییە. ئیسپانیا دەوڵەتێکی خاوەن ئۆتۆنۆمییە فراوانەکانە. یەکێتی دەوڵەتانی باکووری ئەمریکا لەپێشکەوتندایە. یەکێتی ئەوروپا هەیە، تەنانەت یەکێتییەکی تورکیاش لەپێشکەوتندایە. پێویستە کۆمەڵەی دەوڵەتە سەربەخۆکانیش لەوانە، زیاد بکرێ. هەروەها پێویستە دروست بوونی فیدراسیۆن لەناو ڕوسیا وەك نموونەیەکی باش، بخرێتە بەرچاو. هەروەکو چۆن لەتەواوی ئەم نموونانەدا توانستی ئەوە هەیە کە گەلان لەسێبەری هەمان دەوڵەتدا لەمیانەی سیستەمێکی فیدراڵیدا ژیانیکی ئازاد و سەبەرخۆ بەسەر ببەن، ئەوا لەشێوەی دەوڵەتی جیاوازیشدا بن، ئەو دەوڵەتانە بەیەکێتی جۆربەجۆر، توانای ئەوە هەیە کە بەشێوەی فیدراسیۆنی بێنە لای یەکتر و ڕەوتەکان تادێت گۆڕانکارییەکی پلە بەپلەی لەم لایەنەدا دەنوێنێ.

بەلەبەرچاوگرتنی تەواوی ئەم ڕاستییانە، بۆمان دەردەکەوێ باسکردن لەوەی کە PKK بەهەموو شێوەیەك هەوڵی جودابوونەوە دەدات ڕاست نییە؛ ئەوا بەهەمان ڕادەش مانەوە لەناو بونیادێکی ئونیتەری کۆکەرەوە و باڵادەست کە لەسەر فاشیست ترین دەوڵەتی وەکو کۆماری تورکیا دەسەڵاتدارە و هەروەها ناکرێ ئەمەش پەسند بکرێت.

ئەگەر سەرنج بدرێتە بونیادی ئێستای دەوڵەتی ئۆنیتەری، لەڕاستیدا لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا لەلایەن موستەفا کەمالەوە ئەم شێوازە پێشخرا کە بە سۆسیالیزم ـ کە ئەو کاتە ستالین نوێنەرایەتی دەکرد ــ و هەرەزێدەش بە هیتلەر و مۆسۆلینی کاریگەر ببوو. مسۆگەر هەمووشتان دەزانن کە تورکیا دەوڵەتێکی دیموکراسی نییە. ئازادی بۆ هیچ کولتوورێك نییە و دیموکراسییەکەشی ساختەیە و ئەمڕۆ هەر کەسێك دەزانێ کە سوپاکەشی مشەخۆرە.

بونیادی ئێستای دەوڵەتی ئۆنیتەری کۆماری تورکیا، یەکێکە لەو بونیادانەی کە دژە دیموکراتییە

هەر بەتەنیا بەنکوڵی کردنی مافەکانی گەلی کورد و کەمینە نەتەوەییەکانی و دان پیا نەنانیان، ڕاناوەستێ، بەڵکو بونیادێکی دەوڵەتی وەهایە کە لەناوخۆشیدا لەدژی مافی مرۆڤی گەلەکەی خۆشیدایە و، ئەمە ڕاست نییە، دیموکراسییەکەشی لەڕووکەشییانە بەو لاوە هیچ بەهایەکی دیکەی نییە. لەکوێوە سەیر دەکرێ با بکرێت، ئەوە بونیادی دەوڵەتێکی فاشیستییە

بۆیە ئێمە لەدژی دەوڵەتێکی بەوجۆرەین و بەگشتیش لەپێناوی دیموکراتیزەکردنی تەواوی تورکیا، تێکۆشان دەکەین. ئەگەر بەتێکۆشانێکی بەمجۆرە بگوترێ " تێکۆشانی جوداخوازی "، ئەمە یاریکردنە بەڕاستییەکان و جددی نەگرتنیەتی. ئەگەر بەمە بگوترێ تێکۆشانی دیموکراسی، یاخود تێکۆشانی داخوازییە دیموکراسییە نەتەوەییەکان، راستتر دەبێت.

ئەگەر سەرنج بدرێت، تەواوی پێشکەوتنە سیاسییەکانی تورکیا بەشێوەیەکی گرێدراو بەتێکۆشانی ئێمەوەیە و گۆڕانکاری پلە بەپلە نیشان دەدات و، رژێمی کەمالیست بەخاڵێك گەیشتووە کە بەتایبەتی بەو ئۆپەراسیۆنەی دوایی لەسەر باشووری کوردستان ئەنجامیدا، یان ئەوەتا بەئاراستەی ریفۆرم، گۆڕانکاری پلە بەپلە ئەنجام دەدات و تەمەنی خۆی پێ درێژ دەکات، یان لەنێو قاڵبی ئۆنیتەری تەنگدا تەنگەتاوتر دەبێ و لەقەیرانێکەوە بۆ قەیرانێکی دیکە دەچێت، یان ئەوەتا دەڕووخێت و لەنێو دەچێت.

هەربۆیە، ئێمە گەلێك جاران ئەوەمان دیار کردووە کە " ئێمە ئامادەین "، ئەگەر کۆماری تورکیا بیەوێت پێشکەوتنی دیموکراسی لەڕێگای ریفۆرمەکانەوە جێبەجێ بکات. تەنانەت ئێمە گوتمان کە دەبینە هێزی هەرە پتەو و گەرەنتی پێشکەوتنێکی دیموکراسی بەمجۆرە.

ئێمە زۆر بەڕوونی بەئێوە دەڵێین کە نەخۆشییەکی وەهامان نییە "هەر دەبێ جیا بینەوە".

ئەگەر لایەنی بەرامبەر باوەڕی بەخۆی هەبێت و بۆ دیالۆگێکی سیاسی کراوە بێت، ئەوا لەنێو ئەو سنوورانەی کە لەئارادان، دەکرێ بۆ گەلان، ئەنجامی نزیکی ئازادی و یەکسانی بەدەست بخرێ. دەشێ داخوازییە دیموکراسییە ــ نەتەوەییەکان لەئاستی پێشکەوتوودا فۆرمیلە بکرێت. دیموکراسی دەتوانێ لەئاستێکی پێشکەوتوودا، پێشکەوتن بۆ تورکیا بخوڵقێنێ. ئێمە دەڵێین: "بۆ ئەمە ئامادەین". بۆیە ناو بەناو هەڵسەنگاندنی ئەمە " وەك جوداخوازی "، هیچ واتایەکی نییە.

هەڵبەتە، هەرەکەم بەڕادەی ئەمریکاییەك کە لەتاکە نەتەوەیەك پێکهاتووە، "فیدراڵیزم"مان دەوێت. ئێمە هێندەی ئەڵمانیا و ئیسپانیا دیموکراسییەتێك دەتەوێن و خوازیاری سیستەمێکی فیدراڵین وەکو پێداویستییەکی پێشکەوتووی ئەم دیموکراسییە.

بۆچی داخوازی ئەمە جوداخوازی بێت؟

ئایا ناتوانرێ بەسانایی بەجوداخوازبوون و شۆڤێنی بوون بەناو بکرێت، ئەو چەمکەی کە ناخوازێت ناسنامە و تەنانەت ناوی گەلێك بناسێ، کە تا ئێستاکە یەکەم هەنگاوەکانیشی نەهاوێشتووە؟ ئایا نکوڵیکردن لەناسنامەی نەتەوەیەك کە ژمارەی دەگات بە ملیۆنان و هەروەها کۆنترین گەلە لەمێژوودا، دەگمەنترین شێوازی جوداخوازی نییە؟ بۆچی ئەم

راستییانە نەبینرێ و کاتێ کە ئێمە بەشێوەیەکی زۆر گونجاو بەرگری و پاراستنی ڕەوامان لەخۆمان کرد, ئەمە وەکو جوداخوازی هەڵدەسەنگێنرێت؟

ئێوەش بەباشی دەبینن کە ئێمە ڕووبەڕووی دادگایی کردنێکی گران و چەوت و, هەروەها لاڕێ بوینەتەوە. هەرچەندە دەخوازرێت بەوە بڵێن:" پشتی خۆی بەئایدیۆلۆژیای توند ئامێزی مارکس ــ لینینی دەبەستێ ", یان چەندەی دەیانەوێ بڵێن:" جوڵانەوەی هەرە تیرۆریستی جوداخوازی "؛ ئەمانە هەمووی تاوانبارکردنە. تەنانەت هیچ لایەنێکی راستیشی نییە. لەوانە زیاتر راستی گرێدراوی ئەم تێڕوانیانەیە کە من هەوڵم دا بیهێنمە سەر زمان.

**"ئێمە تەنیا فیداکاری لەگەلەکەمان دەتەوێن"**

**دەیڤید**. ئە. کۆرن: بەڕێز ئۆجەلان, لەم ساڵانەی دواییدا PKK لایەنگری کوردەکانی تورکیای بەدەستخستووە و تەنانەت دەشگوترێ کە بەشێوەیەکی چالاکانە هاوکاری ئەوانیش وەردەگرێ, ئایا ئەمە بەچییەوە گرێ دەدەن؟

**عەبدوڵڵا ئۆجەلان**: زۆر ئاشکرایە کە ئەگەر خولیای گەلەکەمان بۆ مێژوو زۆر سنووردارییش بێت, ئەوا ئەم ڕەوشە پابەندە بەتوانستی وەڵامدانەوەی PKK. هەروەها پێویستە لەبیر نەکرێت کە, جاری یەکەمە گەلی کورد لەتێکۆشانی PKK دا بەفیداکارییەکی مەزنەوە, لەهەلومەرجی هەرە سەخت و دژواردا, بەپێی پێویست هەزاران مرۆڤی قارەمان بەتەنیا گیانیان بەخت کرد و لەپێناو ناسنامەی نەتەوەیی, دیموکراسی و هەروەها لەپێناو گەلدا, بێ چاو تروکاندن ژیانی خۆیان پێشکەش کرد؛ لێرەدا هۆکاری سەرەکی پەیوەندی و هاوکاری گەلیش دەگەڕێتەوە بۆ بینین و هەڵسەنگاندنی ئەم راستیە.

گەلی کورد گەلێك جار لەمێژوودا فریو دراوە. هەربۆیە ناخوازێ هەروا بە ئاسانی باوەڕی خۆی بەهەر سەرۆکێك بهێنێت. هەرکاتێك بەچاوی خۆی ببینێ کە لەپێناویدا مەزنترین فیداکاری ئەنجام دەدرێ و هەروەها پاشەکشە ناکات لەبەخشینی بەهادارترین سەرمایە کە گیانیەتی بەقارەمانێتی, ئەوا ئەوکاتە بەسەففەربەرکردنی ئەو توانستەی کە هەیەتی هاوکاری ئەم جوڵانەوەیە دەکات و دەبێتە پشت و پەنای.

PKK ئەو جوڵانەوەیەیە کە بەپەیڕەوکردنی تاکتیکی زۆر گونجاو و لەکات و شوێنی خۆیدا, توانیویەتی لەماوەی ئەم بیست ساڵەدا پێشکەوتنێ بهێنێتە ئاراوە, کە تێیدا ئەو داب و نەریتی یاخیبوونە سەرەتاییە تێپەڕێنێت کە لەمێژووی گەلی کوردیشدا زۆر بینراوە و زۆر جار لەماوەی چەند مانگێکدا ڕێگای لەپێش دەرئەنجامی خراپ و مەترسیدار کردۆتەوە.

هاوکات لەگەڵ دەستپێکردنی سەرهەڵدان و بە لەناوبردنی تایبەتمەندی تێکشکان, ئەو سەرهەڵدانەی بەتەنیا دەستم پێکرد بوو, وردە وردە بەرفراوانم کردەوە؛ نواندنی تواناکاری پەرەپێدانی سەرهەڵدان لەلایەن ئێمەوە وایکرد کە تاکەکەسێك بگاتە ئاستی بوون

بەجـەنگاوەری گـەلێك, ئەمـەش ڕێگـای لەبـەردەم خۆشەویسـتی مـەزنی گـەل و تەنانـەت هەڵسەنگاندنی ئێمەی بەشێوەیەکی موعجیزە ئامێزانـە کـردەوە. ئەمـە ڕووداوێکـە کـە یەکـەم جارە لەمێژووی کوردستاندا پێکدێت. ئەگەر بەڕاستی دەیانەوێ ئاستی ئەم هاوکارییە تێبگەن, ئەوا دەبێ هێڵێك بەژێر ئەم ڕاستییەدا بکێشن. لەبەر ئەوەی گەل لەتێکڕای سەرهەڵدانەکاندا سڵی کردۆتەوە و خۆی دوورەپەرێز گرتووە ـ لەکاتێکدا کە هەموو سەرهەڵدانەکان بەئاسانی تێکشکێنران و ڕێگایـان لـەپێش سـتاتۆیەکی خـراپتر کردۆتـەوە ــ بۆیـە گـەلی کـورد هـەروا بەخۆڕایی و بێ لێکدانەوە هاوکاری و یارمـەتی پێشکەش نـەدەکرد. وەلێ لەکاتێکدا کە گەل بینی پارتیمان تێك ناشکێ و نەخشەی سەرکەوتنی مەزنی کێشاوە, ئەوا بەشێوەیەك گرێدان و هاوکاری نیشاندا کە باوەڕ ناکرێت.

ئەگەر ئەم گەلە سەرەڕای پـەیڕەوکردنی تیرۆرێکی بێ بەزەییانـە لەسـەری کـە تـەنیا 11 سـاڵ لەمیانـەی قەڵـەمبازی 15ی ئـابی دەربـاز کردبـێ و ــ بـەجۆرێك کـە بەهـەزاران لەمرۆڤـەکانمان لەشـێوەی تـاوانی بکـەری نادیـار کـوژراوە و بـە ملیۆنـانیش لەگونـدەکانیان ڕاگـوێزراون و دووچـاری برسـی بـوون کـران و بەهـەزارانیش ئەشـکەنجە دران و, هـەروەها بەهـەزارانیش تـاوەکو ئێسـتاکەش دەستبەسـەرن ــ بەیارمەتییـەکی مەزنـەوە تـا ئێسـتاکە بەهـەموو شـتێکییەوە هاوکـاری PKK بکـات, ئـەوا هـەر لەبـەر ئەمەیـە کـە ئـەم پارتییـەش بەشێوەیەی زۆر قارەمانانە لەهەڵپەی ئەوەدایە کە خاوەنی مێژوویەك بێت, بۆ ئەوەی بتوانێ شایەنی ئەم گەلە بێت. ئەگەر ئەم ڕاستییە نەبوایە, ئەوا ئەم گەلە بەهیچ پاساو و هۆکـارێکی دیکەوە تا ئەم ئەندازەیە هاوکاری ئەم پارتییەی نەدەکرد.

ئێمە تەنیا فیدارکاری لەگەڵەکەمان دەتەوێن.

ئێمـە جگـە لەئامانجـە ڕەسـەنەکان ( پیرۆزەکـان ), هـیچ بەرژەوەندییـەکی بچـووکمان پێشکەشی ئەم گەلە نەکرد و, پابەندی بەرژەوەندییە مادییەکانیشمان نەکردن. بەپێچەوانەوە پارتێکی وەهامان بەدەست خستووە کە بـوون ـ نـەبوونی لـەپێناو مەزنایـەتی و پیرۆزبوونـدا دەبەخشـێت؛ هـەروەها گەوهـەری ئـەم هاوکارییـەشمان لەئـەنجامی پێشکەشـکردنی بەهـەزاران شەهیدی قارەمان بەدەست خستووە.

سەرەکیترین هۆکـار بۆ ئـەم هاوکارییانـەی کەپێشکەشی ئێمـە دەکرێن ئەوانـەن. بێگومـان لەتـەواوی شـێوازەکانی تێکۆشـانماندا چـالاکییەکانی ڕێکخسـتن و پڕۆپاگەنـدەیی بـەرفراوان؛ لەشێوازی گەریلاوە بگرە تاوەکو کامپانیاکانی خـەباتی ئاشـتی, لەهەمانکاتـدا دەرخسـتنەڕووی تەواوی ئەمانە بەشێوەیەکی گونجاو و هەنگاونانمان لەهەر قۆناخێکیشدا بەشێوەیەکی تایبـەت و ڕاست و دروست, لەلایەنی تاکتیکیدا, ڕێگـای لـەپێش گەلەکـەمان کردۆتـەوە کـە بـاوەڕی بـە

ئێمە لەلا دروست ببێت. فاکتەری دووەمیش لایەنی توانستی بەڕێوەبردنی ڕێکخستنە. لە ئەنجامی ئەمانەدا تا دەچێت گرێدان و هاوکاری گەلەکەمان بەرزتر دەبێتەوە.

**"کۆماری تورکیا دوژمنی هەموو شتێکی کوردە"**

**دەیڤید** . ئە. کۆرن: بەڕێز ئۆجەلان، پێشتر بانگەوازیتان بۆ حکومەتی تورکیا لەپێناو چارەسەری سیاسیدا کردبوو و گوتبووتان " با گفتوگۆ بکەین "، بۆ ئەمە چ وەڵامێکیان دایەوە؟

**عەبدوڵڵا ئۆجەلان:** لەبەر ئەوەی کارەکتەری ئەو ڕژێمەی لەبەرامبەرماندایە گوزارشت لە دیوارێکی لەبەرد دروست کراو دەکات، بۆیە بەداخەوە بانگەوازییەکانی ئێمە نابیسێ و ناشخوازێ ببیسێ. ڕەوشێك جێگەی باسە، کە وەك بڵێی بۆ دیوار قسە دەکەین. لەو باوەڕەدا نیم لەدونیادا ڕژێمێکی دیکە هەبێ کە تا ئەم ئەندازەیە کەللەڕەق و وشك بێت.

ئێوەش زۆر بەباشی دەزانن کە دەوڵەتێکی مەزنی وەك ئەمریکا لەبەرامبەر گەلێك کێشەدا، وریا و هەستیارە و بەشێوەیەکی سیاسی نزیك دەبێتەوە. وەلێ ڕژێمی تورکیا لەنێو مێژوودا لەبەرامبەر گەلان زۆر بێ بەزەییانە هەڵسوکەوتی کردووە. لەهەرەدواییشدا ئەوەندە بە قوتدانی گەلی کورد خاوەن بڕیارە کە تەنانەت ناخوازێت دەنگێکیش چییە، بەناوی ئەم گەلە، کە هەرچەندە مرۆییانە و دیموکراسییانەش بێت، ببیسێ. ئەگەر دەنگێکی وەهاش ببیسێ، ئەوا پێی وایە ئەمە تاوانێکە و پێویستە کپ بکرێتەوە. ناچارم هێڵ بەژێر ئەم ڕاستییەشدا بکێشم. ئەم ڕژێمە بەشێوەیەکی وەها بیردەکاتەوە کە پێویست دەبینێ دان بەبوونی ئەم گەلە نەهێنێ و نکوڵی لەمێژووەکەی بکات. بێگومان ئەم کارەش لەمیانەی دەسەڵاتی خۆیدا، لەمێژووی بەربەرێتی ئەودا، دەبێتە تاوانێکی مەزنی مێژوویی کە بەدرێژایی تەواوی ئەم مێژووە دانی بەبوونی هیچ گەلێکدا نەهێناوە و لەم پێناوەشدا تا دوایی شەڕی کردووە. ئەوەندەی لەدەستی هاتبێ لەناوی بردووە، ئەوەی نەشی توانیبێ لەناوی ببات، ئەوا زەبری هەرە کاریگەری لێوەشاندووە و، پاش کاولکردن و سوتاندنی، پاشەکشەی کردووە. لەبەرامبەر گەلی کوردیش هەمان هەڵوێست و سیاسەتی پەیڕەو کردووە. تا دوایی بۆ نکوڵی کردن لەبوونی و تەخت کردنی لەگەڵ زەوی، خاوەن بڕیارە. ئەگەر سەرکەوتنیش بەدەست نەهێنێت، ئەوا پاشەکشە دەکات و دەستبەرداری دەبێت. بەهۆی ئەم داب و نەریتە مێژووییەی کە هەیەتی ناخوازێت بچووکترین نزیکبوون و هەڵوێستی مرۆیی ـ دیموکراسی شایەنی گەلی کورد ببینێ. مسۆگەر کێشەکە لەتێنەگەیشتن یاخود لەڕادیکاڵ بوونی زۆر توندی لێدوانەکانی ئێمەوە سەرچاوەیان گرتووە. نەخێر! بەڵکو لەفەلسەفە و تێڕوانینی ژیانی ئەواندا، جێگەی هیچ گەلێك و کولتوورێك نییە، بۆیە بەم ئەندازەیە دڕندە و هار بووە.

ئەوانەی کە لەنزیکەوە کۆماری تورکیا و عوسمانییەکان دەناسن, دەتوانن ئەوە دەستنیشان بکەن کە شێوەی بالادەستی تەنانەت لەبەرامبەر گەلەکەی خۆشیدا زۆر زاڵ و تاکڕەو و دژە ـ دیموکراسییە. بەتایبەت لەبەرامبەر گەلی کورددا خاوەن چەمکێکی گەلێك خراپترە. چونکە کوردان بەدەیان سەرهەڵدانیان بەرپا کرد, کەچی هەموویانی بەشێوەیەکی ستەمکارانە دامرکاندۆتەوە و تەفر و تونای کردووە.

سلێمان دەمیرل هەڵسەنگاندنێکی هەیە کە دەڵێ:" ئەمە بیست و نۆیەمین سەرهەڵدانە (مەبەستی PKK یە ) و, ئەمەش تەفروتونا دەکەین". تەنانەت ئەمڕۆکەش لە " شیلی " دا دەڵێ:" لەتورکیادا کێشەیەك بەناوی کوردان لەئارادا نییە " ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کە ناخوازن دان بەگەلی کورد و کێشەکەیدا بهێنن. کەواتە پێویستە پێمان سەیر نەبێ ئەگەر بێت و ئەو روونکردنەوەی ئێمەش چەواشە بکرێت کە تیایدا گوتوومانە:" دیوارێك لەچیمەنتۆ ".

لەڕاستیدا لەبەر بەرژەوەندییە ستراتیژییەکان, هێزەکانی گۆڕەپانی نێودەوڵەتی لەسەرووی هەمووشیاندا ئەمریکا, لەپشت خۆی کۆدەکاتەوە و ئێوەش دەتوانن ئەمە هەڵبسەنگێنن کە ئێمە رووبەڕووی هەڵوێستێکی تا چ رادەیەك ترسناکین و, گوێ بەهیچ بانگەوازییەکانی چارەسەری مرۆیی ـ دیموکراسییانەی ئێمە نادات. ئەگەر ئێمە هەندێ ریفۆرم پێشنیاریش بکەین, ئەوا ناخوازێ هیچ گوێی لێبێت. نەك تەنیا لەگەڵ PKK, بەڵکو ناخوازێ لەگەڵ ئەو رێکخراوانەش گفتوگۆ و دیالۆگ بکات کە پەیوەندییان بەتێکۆشانی چەکداریشەوە نییە, چونکە کۆماری تورکیا دوژمنی هەموو شتێکی کوردە.

ئەو راستییەی کە پێویستە ئەمریکا, بەتایبەت لەڕێگەی ئێوەوە ببینێ, ئەمەیە. بۆ ئەوەی ئەم دیوارەی کە لەبەرد دروست کراوە تۆزێك نەرم بکرێت, پێویست بەهەوڵ و تەقەلای ئێوە هەیە. ئەمەش ئەرکێکی ئێوەیە. چونکە لەپشتی تورکیادا ئێوە هەن؛ وا پێدەچێ ئێوە لایەنگری ئەوە نەبن کە تا ئەم رادەیە تورکیا کەللەڕەق و وشك بێت. چونکە ئەمە تاوانێکی مرۆڤایەتی مەزن و رەشەکوژییە.

من بانگ لەویژدانی ئێوە دەکەم!

ئایا هەڵوێستی مرۆیی ـ دیموکراسی لەکام لەئێمەدا هەیە؟ مێشکێکی ژەنگ گرتوو و, دڵێکی رەقی وەك چیمەنتۆ لەکام لەئێمەدا هەیە؟ پێویستە ئێوە ئەم مەسەلەیە هەڵبسەنگێنن.

**"بۆ گەلەکەمان سیستەمی فیدراڵی پێویست دەکات"**

**دەیڤید.** ئە. کۆرن: بەڕێز ئۆجەلان, بابڵێین حکومەتی تورکیا بۆ کەمینەی کورد چارەسەرییەکی فیدراڵی پەسند بکات, ئایا ئەم چارەسەرییە کاریگەری دەبێت؟ چونکە

بەشێکی مەزنی کوردان لەدەرەوەی باشووری رۆژهەڵات ( مەبەست باکووری کوردستانە ــ چارەسەری ) لەشارە گەورەکانی دیکەی رۆژئاوا و ئەنکەرە, ئیزمیر و ئەستەمبوڵدا دەژین. ئەگەر چارەسەری فیدراڵی وەکو رێگایەك بۆ دامرکاندنەوەی ئێش و ئازارەکانی کوردان, نەبینن, لەئاسۆدا چ جۆرە ئەلتەرناتیفێك بەدی دەکەن؟

**عەبدوڵڵا ئۆجەلان:** لەکاتێکدا مۆدیلی دەوڵەتی خۆتان بێننە بەرچاوان, ئەوا دەتوانن باشتر ئەوە هەڵبسەنگێنن کە پێشخستنی سیستەمێکی فیدراڵی, واقیعی دەبێت یان نا, دەشتوانن لەچۆنێتی پێداویستی پێشخستنی چارەسەرییەکی جیاوازتر, تێبگەن.

پێش هەموو شتێك, ئەوە راستە کە نزیکەی نیوەی کوردان بۆ شارە گەورەکانی تورکیا کۆچیان کردووە. بەڵام هەبوونی وڵاتێکی وەك کوردستان کە تاکو ئێستا خاوەن سنوورە و بەزۆرینەوە کوردێکی سەرکوتکراو تێیدا دەژی, بەهەمان ئەندازەش راستییەکی حاشاهەڵنەگرە. پێویستە لەبیر نەکەین کە لەپێش زاییندا " گەزنەفۆن " لەگەڵ هەزاران سەرباز کە گەڕایەوە لەکاروانە دوور و درێژەکەیدا, ناوی ئەم وڵاتەی ( واتە کوردستان ــ چارەسەری) دەستنیشان کردووە و ئەمەش راستییەکە. کەچی تورکان لەسەدەی دەیەمی زاییندا بۆ یەکەم جار پێی خۆی دەنێتە سەر ئەم خاکە بە هەڵسەنگاندنی راستینەی ئەم خاکە, واتە دەوڵەتی تورکیا تەنانەت سەدەیەك لەمێژوودا, دەرباز ناکات. پێویستە ئەوەش بزانین کە لەکاتێکدا هەبوونی کوردان لەمێژوودا چوار هەزار ساڵ تێدەپەڕێنێ, بەڵام هەرچی هەبوونی تورکیایە, لەمیانەی ئەم سەدەی دواییدا هەوڵی داوە وەکو نەتەوەیەك گوزارشت لەخۆی بکات.

ئەمانە لەلایەك, بۆ نموونە بۆچی ئێوە کە لەکاتێکدا هەمان نەتەوەن, سیستەمێکی فیدراڵی پەیڕەو دەکەن؟ بگرە 52 دەوڵەتی فیدراڵیتان هەیە. لەڕەوشێکی بەمجۆرەدا, لەکاتێکدا گەلێك, لەگەڵ ئەوەی لەنێو مێژوودا کۆنترین گەلە, بەناوی خۆی و بەناوی وڵاتەکەی سیستەمێکی فیدراڵی نەبێت؟ جگە لەمە هۆکاری هەبوونی ژمارەیەکی زۆری گەلەکەمان لەشارە گەورەکاندا, دەگەڕێتەوە بۆ کێشە ئابووری و ئەشکەنجە و ستەم و ئەو فشارانەی کە لەئارادان. ئەو جەماوەرەی لەکوردستاندان کێشەکانی گەلی تورکی رۆژئاواش, قورس دەکات. بێگومان ئەوان خۆشیان لەژێر باری زۆر قورسی هەل و مەرجەکانی ژیاندا دەژین.

ئەگەر سیستەمێکی فیدراڵی پێش بکەوێت, ئەوا بە ملیۆنان مرۆڤ لەژێر یەك سایەدا دەگەڕێنێتەوە بۆ نیشتمانی خۆیان. لەئەورووپاشدا نزیکەی دوو ملیۆن کورد هەیە. ئێمە ئاگادارین کە ئەوانیش بەهۆی کێشە ئابوورییەکان و ستەم و چەوسانەوە, کۆچیان پێکراوە. هەروەها دڵنیاین کە لەڕێگای پێشخستنی سیستەمێکی فیدراڵیدا ئەوانیش بێ ئەوەی ببنە

کێشـەیەك بەسـەر ئـەوروپاوە، بـۆ وڵاتـی خۆیـان دەگەڕێنـەوە. دەشـێ بـۆ چارەسـەرکردنی کێشەکانی کوردانی دیکەش، بیر لەچوارچێوەیەکی دیموکراسی بکرێتەوە.

لەدوای ئەوەی کە دیموکراسییەکی بەرفراوان بۆ تورکیا فەراهەم ببێت، ئەوا ئەو کوردانەی لـە شـارە گەورەکانـدان لەتوانایانـدا دەبێـت قوتابخانـە بـۆ خۆیـان دابمـەزرێنن و، هـەروەها لەتوانایانـدا دەبێـت دام و دەزگاکـانی راگەیانـدن ــ بڵاوکردنـەوە پـێش بخـەن. بۆچـی لەمـەدا سەرسـام بـین؟ ئەگـەر بـەمجۆرە ببێـت، بۆچـی بکەوینـە نێـو لێکدانـەوەوە؟ لەڕەوشـی بەرقەراربوونی دیموکراسییەکی بەرفراواندا، ئەوەی بخوازێ لەڕۆژئاوادا دەمێنێتـەوە و ئـەوەی بشخوازێ دێتەوە رۆژهەڵات ( مەبەست باکووری کوردستانە ـ چارەسەری ).

لەبەر هۆکارە مێژوویی، کۆمەڵایـەتی، سیاسی و کولتوورییـەکان، پێویست بەسیستـەمێکی فیدراڵی دەکات. باش دەزانن کە گوتنی " گونجاو نەبوونی سیستەمێکی فیدراڵی، تـەنیا بـەپێی سەیرکردنی دیموگرافی و پـەرش و بڵاوبوونـەوەی دانیشتوان، لەگـەڵ راستینەی دەوڵەتەکەی ئێوەدا یەکناگرێتەوە.

ئایا دەشێ بیر لەشێوەیەکی دیکە بکرێتەوە؟ هەروەکو لەسـەرەتاوە ئاماژەم پێکرد، شێوەی یەکێتی جۆربەجۆر هەیە و کۆنفیدراسیۆنەکان و هەروەها شێوەکانی یـەکێتی ئارەزوومەندانـە و شێوەکانی ئۆتۆنـۆمی هەیـە و، دەشـێ تـەواوی ئەمانـە، بـە گفتوگـۆکردن ــ دیـالۆگی سیاسی بـەرفراوان و خسـتنەواری کردارییـەوە، ئـەنجامگیر بکـەین. لەبـەر ئـەوەی ئـەو چـەمکەی لەبەرامبەر ئێمەدایە لە دیوارێکی لە بەرد دروستکراوە، بۆیـە ناخوازێت لـەهیچ جۆرە شێوە گونجاوەکانمان و سەرلەنوێ رێکخستنەوەی دەوڵـەت تێبگـات. ئەگـەر نـا تواناکـاری ئـەوە هەیـە لەشێوەیەکی گونجاوی دەوڵەتدا داخوازییە نەتەوەیی ـ دیموکراسییەکانی گەلی کـورد فەراهـەم بکرێت و هەروەها ئەمەش دەربازی یاسای بنچینەیی بکرێت. تەنانەت ئەمە تاکەڕێگای راست و دروستە بۆ رزگاربوونی تورکیا لەم قەیرانە قورسـەی کـە ئێستا پێوەی دەناڵێنێ. پێویستـە لەبیر نەکەین کە ئەمڕۆ لـەدونیادا تورکیـا لـەنێو قورسـترین قـەیرانی سیاسی، کۆمەڵایـەتی و ئابوریـــدا دەژی و، هـــەروەها تورکیـــا بەدروســـتکردنی زۆر و زەحمـــەتی بـــۆ ســـنووره نێودەوڵەتییەکان، تیرۆریزم پەیڕەو دەکات. رێگای دەربـازبوون لـەم رەوشـەش، بـە هاتنـەئارای بونیادێکی نوێی دەوڵەت، لەمیانەی دیالۆگی سیاسییەوە، مەیسـەر دەبێ. لـەدەرەوەی ئەمـەش رێگایەکی دیکەی رزگاربوون بۆ تورکیا لەئارادا نییە.

**"مافی بەرخۆدانی پیرۆزی خۆمان بەکار دەهێنین"**

**دەیڤیـد** ئـە. کـۆرن: بـەڕێز ئۆجـەلان، هـەم حکومـەتی تـورك و هـەم حکومـەتی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا PKK وەك رێکخراوێکـی تیرۆریسـت لەقەڵـەم دەدەن. ئەگـەر بەگوێرەی بیر و بۆچوونی ئێوە ئەمە وا نەبێت، ئەوا چۆن بیر دەکەنەوە؟

**عەبدوللا ئۆجەلان:** بۆ پرسیاری یەکەمتان روونمان کردەوە کە چەمك و پێکهێنانی مەزنترین تیرۆریست بە چ واتایەك دێت. ئێمە یەك دڵۆپە خوێنی هیچ گەلێك و تەنانەت بێگانەیەکیشمان بەناهەق نەڕژاندووە. دەتوانم بە ئێوە بڵێم لەوڵاتی خۆماندا، بێگومان وەك پێویستییەك بێجگە لەبەمرۆڤ بوون هیچ چارەیەکمان نەبوو، واتە جگە لەوەی کە وەکو گەل و نەتەوەیەك ناسنامەمان بمانەوێو خوازیاری پەسندکردنی هەندێك لەمافەکانمان بین و بۆ ئەمەش بەپێی پێویست بەرخۆدان بکەین.

ئایا تیرۆریزم لەکوێی ئەمەدایە؟

ئێوە ببنە کەفیل، ئەگەر بڵێن:" فەرموو ئەوە مافە دیموکراسی ـ نەتەوەییەکانتان و ناسنامەی خۆتان بگرن،" ئەوکات پەیمان دەدەم ئێمە یەك ساتیش چییە، توندوتیژی بەکار نەهێنین. وەلێ ئێوە بەڵێن نادەن دان بە مافەکانی مندا بنێن و ئەمریکا و تورکیاش بەڵێنی ئەمە نادەن. بەپێچەوانەوە کۆماری تورکیا دەڵێ کورد وەکو گەل " بێ بەش "ە و نابێت هیچ مافێکی بەرەو پێشەوە بچێت. هەربۆیە لەمێژووەوە تاوەکو رۆژی ئەمڕۆ دەخوازێ لەڕێی هێزێکی هەرەزۆردار و بەربەرییەوە ئێمە قڕ بکات و لەنێو ببات. ئەگەر ئەمە گەورەترین تیرۆریزم نەبێت، ئەی چییە؟

ئێوە هەوڵ ئەدەن راستییەکان ئاوەژوو ببینن. تێکۆشانێك کە جگە لەنوێنەرایەتیکردنی مافی بەرخۆدانی پیرۆزی گەلێك کێشەیەکی دیکەیان نییە، ئێوە وەکو هێزێکی تیرۆریستی هەرەمەزنی نێودەڵەتی هەڵدەسەنگێنن. ئایا ماف، دادپەروەری و راستی لەکوێی ئەمەدایە؟

ئایا بەگوێرەی ئێوە نکوڵی کردن لەبوونی گەلێك، پەسندکردنی ژیانێکی زەلیلی بێ رەگ و ریشە، پێداویستییەکی شارستانییە؟

ئێوە لەشەڕی سەربەخۆیی ئەمریکادا گەلێك شێوازی چالاکیتان تاقی کردەوە. کە تادواڕادە بەواتای تیرۆریزم دێت و رزگاری نەتەوەیی ئەمریکاشتان بەمجۆرە بەدەست خست. هەر لەم چوارچێوەیەشدا ئایا راست دەبێت من ئێوە وەك تیرۆریست لەقەڵەم بدەم؟ لەکاتێکدا ئێمە ناخوازین بەئەندازەی ئێوە ببینە دەوڵەتێکی مەزنی سەربەخۆ. ئەوەی خوازیارین هەندێ داواکارییە بنچینەییەکانی مرۆڤە لەژێر سایەی هەمان دەوڵەتدا. لەنێو ئەمانەشدا مافی بەکارهێنانی کولتوور و زمانی نەتەوەیی خۆی هەبێت. لێرەدا بۆچی داخوازی کردنی ئەمانە ببێتە تیرۆریزم؟ ئەگەر لایەنی بەرامبەر بڵێت:" من ئامادەم ئەم مافانە بدەم،" ئەوا ئێمە دەتوانین لەبەرامبەر ئەمەدا لەرۆژێکدا توندوتیژی بوەستێنین.

ئەگەر تەنیا بەئامانجی قڕکردن نەیەنە سەرمان و ئێوەش ناوبژیوانی پەسند بکەن، ئەوا لەهەر ساتێکدا بۆ راوەستاندنی شەڕ ئامادەین.

ئەگەر راستی ئەمە بێت و تۆش هەڵسی بڵێی:" ئەمریکا و کۆماری تورکیا ئێوە وەك تیرۆریزم لەقەڵەم دەدات و لەبەرامبەر ئەمە چی دەڵێن؟ ئەوا ئەمە گاڵتەپێکردنە بەڕاستییەکان پێویستییەك نابینم بەگوتنی " تیرۆریست نین " بەئەنجامدانی ساختەکاری لەپێناو هەڵێنانی چەند هەنگاوێك و هیچ کاتێکیش ئێمە خۆمان وەك تیرۆریست, بەو واتایەی کە ئێوە دەیانەوێ بیڵێن هەڵناسەنگێنم. ئێمە شەڕێکی مرۆڤایەتی زۆر پیرۆز و زۆر بەقارەمانێتی بەڕێوە دەبەین. ئێمە نەك تەنیا لەپێناو کورد, بەڵکو لەپێناو ئەو کولتوورەی کە بە ئەندازەیەکی زۆر لەڕۆژهەڵاتی ناوین دووچاری لەنێوچوون بۆتەوە, شەڕ دەکەین. چونکە لەڕۆژهەڵاتی ناویندا کولتووری هێلینی, ئەرمەنی, سوریانی, عەرەب و چەرکەس هەیە و گەلێك کولتووری بچووك ـ مەزنی تریش وەکو ئەمانە هەن. واتە ئێمە لەپێناو بێ ژماری سەربەخۆیی کولتووری گەلیشدا شەڕێك بەڕێوە دەبەین. بۆچی بەمە بگوترێت: "تیرۆریزم؟" ئەوەی ئەمە ناناسێ, لایەنی بەرامبەرە. ئەوەی بەستەمکاری و بێ بەزەییانە سەرکوت دەکات, کۆماری تورکیایە. ئەگەر تیرۆریزم ئەمە نەبێت, ئایا چییە؟

ئەم شەڕەی کە بەناوی مرۆڤایەتییەوە بەڕێوەمان بردووە, هەرگیز وەکو تێکۆشانێکی بەخەوش هەڵناسەنگێنم. من هەموو شتێك پەسند دەکەم, وەلێ گوتەیەکی وەك:" ئەو تێکۆشانەی بەڕێوەمان بردووە تیرۆریزمە و ئامادەم لێی پەشیمان ببمەوە " هیچ کاتێك ئەمریکا و کۆماری تورکیا لەمنی نابیستن.

**"ئیسرائیل هاوکاری هەرەمەزنە بۆ شەڕی تایبەتی تورکیا"**

**دەیڤید** ئە. کۆرن: بەڕێز ئۆجەلان, ئایا چ جۆرە پەیوەندییەکی PKK لەگەڵ ڕێکخراوە توندڕەوە فەلەستینییەکان هەیە کە چالاکییە تیرۆریستییەکان لەبەرامبەر ئیسرائیل ئەنجام دەدەن یاخود چ جۆرە هاوکارییەکتان پێشکەش دەکەن؟

**عەبدوڵڵا ئۆجەلان**: لەسەرەتاکانی 1980 هەندێ پەیوەندی سنووردارمان جێگای باس بوو, وەلێ بەتایبەت کاتێك کە ڕێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستین بیرۆی خۆی لەئەنکەرەدا کردەوە, لەوە بەدواوە لەئێمە دوور کەوتەوە و هەر لەساڵانی 1982وە ئێمە هەر خۆمان لەڕۆژهەڵاتی ناوین و لەنێو کۆمەڵگای گەلی کورد پێشکەوتین. ئەگەرچی ئێمە هەوڵیشمان دابێت بۆ پێشخستنی پەیوەندی, وەلێ لەبەر داکۆکییەکانی تورکیا, ڕێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستین لەگەڵ ئێمەدا پەیوەندییەکانی بەرەوپێشەوە نەبرد. بۆیە هەر بەهێزی گەوهەری خۆمانەوە درێژە بەبوونمان دەدەین.

ئەگەر بێینە سەر کێشەی ئیسرائیل, ئەوا پێویستە بەشێوەیەکی جیاواز لێی تێبگەین. سەودا و مامەڵەپێکردنی رژێمی تورکیا لەگۆڕەپانی نێودەڵەتی و هەروەها تاوانبارکردنی PKK بەشێوەیەکی قورس لەگۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا بەشێکیش بەپلەی یەکەم

بەرپرسیارێتی لەئەستۆی ئیسرائیل دایە ـ بەتایبەت ئەوانەش کە پەیوەندی پتەویان لەگەڵ تورکیادا هەیە ــ . ئەوانە بۆ سەودا و مامەڵەپێکردنی تورکیا لەگۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا ئەرکێکی چالاکانەیان وەرگرتووە. مەزنترین پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ و مەزنترین رەشەکوژی لەتورکیادا هەیە. بەداخەوە, ئەوانەی دەڵێن:" تورکیا تاکە وڵاتێکە کە لەگەڵ ئیسرائیل دۆست بێت " ئەوا تەواوی تاوانەکانی تورکیا و ئیسرائیل کە بەهەموو شێوازێك و بەتێکڕای هێزی خۆی هێرشمان دەکاتە سەر, پەردەپۆش دەکەن.

ئێمە وەکو گەلێك کە بەدژوارترین شێوە رووبەڕووی رەشەکوژی هاتووین, جموجۆڵی گەلی یەهوودی, بەتایبەت ناوەندە گرنگەکانی دەوڵەتی ئیسرائیل و پەیوەندی بەستن لەگەڵ تورکیا لەبەرامبەر گەلی کورد, تادواڕادە بەمەترسی لەقەڵەم دەدەین. ئەگەر ئیسرائیل نەبوایە, ئەوا تورکیا بەتەنیا نەیدەتوانی بەم ئەندازەیە لەگۆڕەپانی نێودەڵەتیدا هێرشمان بکاتە سەر. بەگوتنی گوایە لەنێو دەوڵەتە ئیسلامییەکان " تەنیا تورکیا هاوکاریم دەکات ", دەبووایە ئیسرائیل لەبەرامبەر گەلێك کە بەم ئەندازەیە زوڵمی لێکراوە, ماڤی بەرخۆدانی پیرۆزی خۆی بەکار دەهێنێ, بەمرەنگە نەبوایە.

ئێمە هیچ هێرشێکمان لەبەرامبەر ئیسرائیل ئەنجام نەداوە.

ئێمە لەوە تێناگەین بۆچی ئیسرائیل یەك لایەنە و بەم ئەندازەیە هاوکاری رژێمی تورکیا دەکات و هێرشمان دێننە سەر. ئێمە لەو باوەڕەداین کە راستتر دەبێت هەرچی زووە ئیسرائیل دەست لەم هەڵوێستانەی بەر بدات و پاشگەز بێتەوە. پێم وایە هۆکاری هێرشی بێ سنووری ئەمریکاش بۆ سەر ئێمە بەهۆی کاریگەری هەندێك لەلۆبیەکانی ئیسرائیلە. تورکیا هەندێ بەڵێن دەدات بەوان و ئەوانیش بە بڕواکردن بە بەڵێنەکانی تورکیا یاخود بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆیانی دەبینن و بەمرەنگە بەشێوەیەکی بێ سنوور هێرش دەهێننە سەرمان. لەم رێگەیەوە دەیامەوێ بەبیر بێنمەوە کە ئەمە تا دواڕادە زیان بەخش, ناڕەوا و هەروەها یارمەتیدانە بۆ ئەم هەموو رەشە کوژییەی لەسەرمان بەڕێوە براوە.

### "بازرگانی هیرۆیین مەزنترین بوختانە"

**دەیڤید** ئە. کۆرن: بەڕێز ئۆجەلان, تورکیا و هەندێ دەوڵەتی دیکەش دەڵێن کە PKK بەفرۆشتنی هیرۆیین خۆی بەڕێوە دەبات. سەبارەت بەم تاوانبارکردنە دەتوان چی بڵێن؟

**عەبدوڵڵا ئۆجەلان:** ئەمەش مەزنترین درۆیە و بۆ پەردەپۆش کردنی تاوانەکانیانە, کە خستوویانەتە ملی لایەنی بەرامبەر. ئەمە لەرق و کین بەولاوە هیچ واتایەکی دیکە لەخۆوە ناگرێت. جوڵانەوەکەمان لەلایەنی بازرگانی ماددە بێ هۆش کەرەکانی نێودەوڵەتی, دوورەپەرێزە و ئەوەی هەرە زێدە لەدژی رادەوەستێ ئێمەین و تەنانەت زۆر بەڕوونی دەڵێم: لەنێو ئێمەدا بەرامبەر ماددە بێ هۆش کەرەکان و مەشروبات, هەڵوێستی هەرە رادیکاڵانە

هەیە. ئێوەش زۆر باش دەزانن ئەو مرۆڤانەی کە مادده بێ هۆش کەرەکان بەکار دەهێنن، دەرکەوتنە مەیدان و ئەو مرۆڤانەش کە بوونەتە ئامرازی مامەڵەکردن بە مادده بێ هۆش کەرەکان، لەنزیکەوە گرێدراوی سیستەمی نێودەوڵەتی هەنووکە و ئەو دەوڵەتانەن کە شێوازی مافیاییان هەیە.

هەڵسەنگاندنی PKK وەکو ئامرازێکی بازرگانی ماددەی بێ هۆش کەر، مەزنترین درۆ و چەواشەکارییە. ئەگەر بانگەشەی تیرۆریزم درۆیەکی مەزن بێت، ئەوا گوتنی وەك: PKK پەیوەندی بە مادده بێ هۆش کەرەکانەوە هەیە، تەواوکردنی درۆی یەکەمە. من زۆر بەباشی دەزانم کە دەرفەت و توانا‌کاری ئەوە نییە کە لەنێو ئێمەدا، بگرە تاکەکەسێکیش بەمادده بێ هۆش کەرەکانەوە خەریك بێت. ئێمە نەفرەت لەمادده بێ هۆش کەرەکان دەکەین و، ئەگەر هەرکەسێکیش وەکو ئێمە بوایە، ئەوا کەسێك لەم دونیایە نەدەما کە ماددەی بێ هۆش کەر بەکار بهێنێ. هەربۆیە بازرگانیش نەدەبوو.

دەخوازم سەرنجتان بۆ ئەمە رابکێشم کە هەر لەسالآنی 1980وە پۆلیسی تورکیا هەوڵی دەدا پشت بەم تێزە ببەستێت. لەکاتێکدا هەوڵی دەدا لەگەڵ رژێمی 12ی ئەیلول رێژەیەکی زۆری گەلەکەمان دووچاری کۆچکردن بکات و، هاوکات بۆ رەشکردن و ناوزڕاندنی ئەو تێکۆشانەی، کە ئەگەری ئەوەی هەبوو لەئەورووپادا پێشی بخەین، تەڵەزگەیەکیان بۆ نایەوە. هەروەها بۆ رێگاگرتن لەتەڤلیبوونی لاوەکانی ئەورووپا بۆ نێو تێکۆشان، بازرگانی ئەفیونی وەکو شێوازێك هەڵبژارد.

ئەمە جاری یەکەمە بۆ ئێوە دەڵێم کە پێداویستی هەڵسەنگاندنی ئەمە بە وشیارییەوە دەکەم. بەڕاستی ئەمە گەمەیەکە و مسۆگەر دەبێ لەمە بکۆڵنەوە و دەرك بەئەنجامەکانی بکەن. پێویستە دەرك بەوە بکرێت کە پۆلیسی تورك بۆ ئەو تۆڕە بێ هۆش کەرانەی کە دروستی کردوون، بەشێوەیەکی بەرفراوان گەنجە کوردەکانی بەکار هێناوە. ئێستا بەهەزاران لەئەڵمانیادا دەست بەسەرن. ئەوەی ئەمانەشی ئەنجام داوە وئەنجامی دەدات، پۆلیسی تورکە. بۆچی؟ نموونە بە بەردێك لە چەند چۆلەکەیەك دەدات. یەکەم: ئەو لاوانە فێری مادده بێ هۆش کەرەکان دەکات. دووەمیش: ئەو داهاتەی لەم رێیەوە دەستی دەکەوێت بەشی زۆری دەکەوێتە گیرفانی پۆلیس. بەشێکی گرنگی داهاتی کۆنتراگەریلاش ئەمەیە و لەتورکیادا لەنێو " JITEM "دا واتە لەنێو رێکخستنی سیخوڕی ژەندرمە، کراوە بەبابەتی گفتوگۆکردن. لەبەڵگەکانی رووداوی " جەم ئەرسەڤەر " ئەمە باس کراوە. هەر خۆشیان دەڵێن کە بەشێوەیەکی بەرفراوان لەڕێگای بازرگانی مادده بێ هۆش کەرەکان پێداویستی خۆیان لەڕووی ئابوورییەوە دابین دەکەن. سێیەم: دەیانەوێ بەمەش ناوی تێکۆشانەکەمان، بەو کوردانەی لەتۆڕی مادده بێ هۆش کەرەکان جێگە دەگرن، بزڕێنن. بۆ ئەم لاوانەش دەڵێن:" گرێدراوی

PKK "ن هەربۆیە پڕوپاگەندەی ئەوە دەکەن کە گوایە " PKKش گرێدراوی بازرگانی ماددە بێ هۆش کەرەکانە. "

بۆ ئەوەی لە گۆڕەپانی نێودەڵەتیدا دەستەڕۆکردنێکی بەمجۆرە ناپاك و ترسناك دەربخەمە ڕوو, ئەمانەتان بۆ باس دەکەم ـ تاوانی "ئۆڵف پالمە"ش هاوشێوەی ئەمە بوو, ئەم تاوانە لەلایەن خودی دەوروبەرە تاریکەکانەوە ڕێکخراوە و, ئامانجیش ئەوە بوو لەگۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا بیسەلمێنن کە ئێمە تیرۆریستین. کۆماری تورکیا وڵاتەکەمانی لەلاوان چۆڵ کرد و گیرۆدەی ماددەی بێ هۆش کەری کردن و ئەمانەشی لەگۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا بڵاو کردەوە. تەنانەت لاوێکی کوردیش نەدەکرا بە بێ یارمەتی پۆلیسی تورك تا ئەو ئەندازەیە بەدونیادا سەرگەردان بێت و لەترافیکی ماددە بێ هۆشکەرەکاندا جێگە بگرێت. هەڵبەتە من ئەم پاسپۆرتانەم پێیان نەداوە. ئەگەر بخوازرێت, دەکرێ لەڕۆژێکدا ڕێگاکانی دەربازبوونیان بۆ ئەوروپا دابخرێت. هاوکات ئەم رژێمە وەکو سیاسەتی کۆکوژی نەتەوەیەك, چۆلکردنی تەواوی لاوان لەوڵاتی خۆیانی, کردۆتە سیاسەتی بنچینەیی خۆی. لەلایەکیتر ئەو لاوانەی کە لەوڵاتی خۆیان دەمێننەوە, لەنێو تەریقەتەکاندا ڕێکدەخرێن.

ئەمرۆ لەتورکیادا هەندێ ڕێکخراوی تەریقەتی هەن هاوشێوەی " حزب اللە " کە هەوڵ دەدرێ لەسەر بنەمای ئایینی لەدژی PKK بوروژێنرێن. پۆلیسی تورك لەمەدا رۆڵی مەزنی هەیە و هەوڵ دەدات, یەکەم جار لەڕێگای گیرۆدەکردن بەئەفیون و, دووەم بەگیرۆدەکردنی ئایین و تەریقەتە ساختەکان, ئاستەنگی لەپێش تەقلیبوونی پۆتانسیلی لاوان بۆ نێو تێکۆشانی رزگاریخوازی نەتەوەییمان دروست بکات. لەئەوروپادا بەڕاگەیاندنی گەلێك زانیاری ساختە و دەستخەرۆکردنی پۆلیسی ئەلمانیاش, پڕوپاگەندەی ئەوە دەکەن کە گوایە PKK بەشێوەیەکی کاریگەر جێگای خۆی لەنێو بازرگانی ماددە بێ هۆش کەرەکاندا گرتووە. هەروەکو گوتم, ئەمە تاوانبارکردنێکی قورسە و, بەشێوەیەکی رەها نالێم لەدوور و نزیکەوە پەیوەندیمان نییە, بەلام بەتوندی لەدژی ئەمە رادەوەستین.

دەبا دادگاکانی نێودەڵەتی بیسەلمێنن ئەگەر یەك راستی هەبێت سەبارەت بەگیرۆدەبوونی PKK بەبازرگانی ماددە بێ هۆش کەرەکان, ئەوکات من هەموو تاوانبارییەکانی ئێوە پەسند دەکەم. وەلێ تاکە بەلگەیەك بۆ تاوانبارکردنێکی بەمجۆرە لەئارادا نییە. ئەوەی هەیە تەنیا پڕوپاگەندە و چەواشەکارییەکی هاوبەشە. لەسەر گەنجەکانمان گەمەی مەزن لەئارادایە. ئێوەش دەتوانن سەرنج بدەن کە لەڕابردووشدا لەسەر " زنجی "یەکانیش گەمەی هاوشێوەی ئەمە پەیرەو کراوە. ئێمە بووینەتە قوربانی ئەمە و, راستییەکان وەکو ئەوەن کە من گوتم.

ئێمە هەموو کاتێ نەفرەت لەماددە بێ هۆش کەرەکان و ئەوەی بەکاری دەهێنێ و ئەوەی بازرگانی پێوە دەکات, دەکەین. لەوەلامی ئێمە بۆ پرسیاری:" ئەو جولانەوە و گەلە کێیە کە

هەرە زێدە لە مادده بێ هۆش کەرەکان دوورەپەرێزە و لەدژی بازرگانی و بەکارهێنانی دەوەستێت؟" دەڵێن:" جوڵانەوەی PKK و گەلەکەمانە."

**"لەوباوەڕەداین لەئەمریکاش دۆستانی هێژا هەن"**

**دەیڤید** ئە. گۆرن: ئایا PKK هیچ کاتێك بەرژەوەندی یاخود کەسانی نێو دامودەزگا ئەمریکییەکانی لە تورکیادا یاخود جێگەیەکی دیکەدا وەك ئامانجێك هەڵبژاردووە؟

**عەبدوڵڵا ئۆجەلان:** بەدڵنیاییەوە تاوەکو ئێستاکە بە شێوەیەکی راستەوخۆ لەبەرامبەر کەسایەتی و دام و دەزگاکانی ئەمریکا چالاکی ئێمە نەبووە و, لەم بارەیەوە هیچ ئامانجێك هەڵنەبژێدراوە. تەنانەت لەکوردستاندا هەندێك ئەمریکی گیرابوون و بەشێوەیەکی زۆر باش میوانداری کران و دوای ئەوەش ئازاد کران.

لەکاتێکدا کە لەگەڵ ئەمریکادا لەنێو هیچ شەڕێکدا نەبووین, کەچی لام سەیرە کە ئەمریکا و دەورووبەرە سیخوڕییەکان, PKK لەدونیادا وەك مەترسییەکی هەرە مەزن دەبینن. ئێمە چیمان لەئەمریکا کردووە کە بەم رادەیە لەئاستی دونیادا هێرش دەکاتە سەرمان؟ ئەمە هەڵوێستێکی یەکجار سەیر و سەمەرەیە. لەکاتێکدا کە بەشێوەی نهێنی و ئاشکرا شەڕی ئێمە لەبەرامبەرئەمریکا نەبووە و تەنانەت بچووکترین هێرشمان لەدژی تاکەکەسێك جێگەی باس نییە, باشە بە چ مافێکەوە بەم ئەندازەیە دێتە سەرمان؟ بەڕاستی دەخوازم لەڕێگەی پرسیارکردن, لەم هۆکارانە تێبگەم. ئێمە لەکوێ هێرشمان کردۆتە سەر بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا, تاوەکو هێرشمان بۆ بهێنێ؟ هەموو رۆژێ لێدوان لەسەر لێدوان رادەگەیەنێ و دەڵێ:" هاوکاری تورکیا لەدژی تێکۆشانی PKK دەکەین ", بۆچی؟ ئایا لەسەر هەقە؟ ئەگەر ناخوازی تورکیا نکوڵی لەهەبوونی گەلی کورد بکات و گەلی کورد دوچاری رەشەکوژی نەبێت, ئەوکات بۆچی هاوکاری و پشتگیری پێشکەش دەکەیت؟ باشە تۆ هاوکاری کۆماری تورکیا لەدژی PKK دەکەی, وەلێ هەندێ رێکخراوی دیکەی کورد هەن داوای ماف دەکەن, ئایا بۆچی هاوکارییان ناکەیت و داواکارییەکانیان جێبەجێ ناکەیت و دەچی بێ پسانەوە و بەردەوام هاوکاری فاشیزمی تورك دەکەی؟ ئەمە هێندەی ئەوەی کە هاوکارییەکی زۆر ناڕەوایانەیە, ئەوەندەش هەڵوێستێکی هێرشکەرانەیە لەدژی گەلی کورد و پارتیمان. پێویستە ئەم هەڵوێستە بگۆڕدرێ. ئێوە دەڵێن گوایە گەلی کورد ناتوانێ بەباشی خۆی لەبەرامبەر ئەمریکادا بپارێزێ, باشە ئایا بەم ئەندازەیە پێویست بە هێرشێکی وەها دژوارانە دەکات؟

پێم وایە کە مرۆڤی وەکو ئێوە کەم نەبن، کە هەوڵ بدەن راستییەکان لەچوارچێوەی پێوانە بابەتییەکاندا هەڵبسەنگێنن, وەلێ وێڕای ئەمەش دەخوازم ئەوەتان بەبیر بهێنمەوە

کە, وەك سیاسەتی باڵادەستی دەوڵەتەکەتان, لەجێ و شوێنێکی ناڕەوادان و بەساڵانە لەژێر ناوی " هاوکاری تورکیا دەکەین " بوونەتە ئامرازی سیاسەتێکی زۆر مەترسیداری رەشەکوژی.

ئەوەی پێویستی بەهاوکاری هەیە تورکیا نییە. ئەگەر بەڕاستی باوەڕیتان بە دیموکراسی هەیە, رێزتان بۆ مافەکانی مرۆڤ هەیە, تاکە شتێك کە پێویستە ئەنجامی بدەن ئەمەیە کە؛ ئێمە وەك جوڵانەوەیەك ببینن کە مافەکانی مرۆڤ دەپارێزێ و تێکۆشان بۆ دیموکراسی دەکات. ئەوەی لەبەرامبەر مەزنترین رەشەکوژی کە لەمێژوودا ناسرابێ, هەوڵی پاراستنی پیرۆزی هەبوونی خۆی داوە, گەلی کوردە. بۆ دەبێ یارمەتی رێکخستنێك نەدرێت کە لەهەلومەرجی هەرە دژواردا تێکۆشان بەرێوە دەبات, لەدژی رژێمێکی درندە کە لەمێژوودا هیچ هاوتایەکی نییە و تەنانەت زۆرداری ئەو زێدەترە لەو ستەمەی " رۆما " کە لەبەرامبەر حەزرەتی " عیسا " ئەنجامی دا.

ئەگەر ئێوە ئەمە جێبەجێ بکەن ئەوا دەتوانن لەبەرامبەر مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسی و پێشخستنی شێوازی پەیوەندی شارستانییانە لەگۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا, هاوکاری بکەن. لەسەر ئەم بنەمایەش باوەڕ دەکەم کە توانیبێتم هەندێك شت بۆ ئێوە رۆشن بکەمەوە. لەو باوەڕەشدام کە لەسەر ئەم بنەمایە ئێوەش, کە دەورووبەری بەرفراوانتان هەیە, بتوانن لەرێگەی خۆتانەوە ئەوانەی وەکو ئێوەن, رۆشن بکرێنەوە. لەبەر ئەوەی ئێوە داواتان کرد, بۆیە هەوڵمدا وەلامی هەندێ لەراستییەکان بەشێوەیەکی هەمە لایەنە بدەمەوە. پێم وایە ئەو پێشکەوتنانەی لێرە بەدواوە روودەدەن بەشێوەیەکی باشتر بێ و, توانستی دیالۆگێکی شیاوتر لەگەڵ ئێوە برەخسێ.

سلاو و رێزم بۆ ئێوە دیاری و پێشکەش دەکەم

# دەمانەوێ مرۆڤ رزگار بکەین و

# هەرگیز تەسلیمی سەرمایەداری نابین

ئەمڕۆ شۆڕشی کوردستان بۆتە ناوەندی ئەنتەرناسیۆنالیزمی دونیا, ئەمە رەوشێك نییە کە هەروا بە ئاسانی و لەخۆڕا پێکهاتبێت. گەلێك هۆکار هەن دەبنە زەمینەی پێکهێنانی ئەم ناوەندە.

پێش هەموو شتێك دوای هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو و ئەنجامگیر نەبوونی شۆڕشە رزگاریخوازە نەتەوەییەکان بەشێوەیەکی گشتی لەساڵانی 1980 بەدواوە نیگاکان کەوتوونەتە سەر شۆڕشی کوردستان, هەروەها لەم چوارچێوەیەشدا پێویست دەکات شانبەشانی راستییە نێودەوڵەتییەکان کاریگەری مەزنی داگیرکاری تورکیاش ببینرێت. جێگرتنی تورکیا وەك دەوڵەتێك لەناتۆدا هەروەها رۆڵی گرنگی ئەم وڵاتە لەخۆرهەڵاتی ناویندا, رۆڵی گرنگی تێکۆشانی ئێمەشی دەرخستۆتە مەیدان.

پێشکەوتنی شۆڕشی کوردستان, بە واتای پێشکەوتنی شۆڕشێك دێت لەنێو وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوین. شۆڕشێکە کە بەئەندازەی شۆڕشەکانی ئۆکتۆبەر و فەرەنسا کاریگەری مەزنی لەئاستی نێونەتەوەییدا هەیە.

ئەو هۆکارانەی سۆسیالیزمی بونیادنراوی بەرەو هەڵوەشانەوە برد, لەلایەن ئێمەوە نەك تەنیا لەلایەنی جوگرافی, بەڵکو لەلایەنی گەوهەریش چارەسەر کراوە و تێپەڕێنراوە. ئەو سۆسیالیزمەی کە پێکهات, کەسایەتی سۆسیالیستی و دیموکراسییەتی سۆسیالیستی نەخولقاند. هەر لەبەر ئەمەشە کە شۆڕشی کوردستان بۆ ئاستی شۆڕشێك بەرز بۆوە کە تایبەتمەندی گەردوونی لەخۆوە دەگرێ. خۆی لەخۆیدا ئەگەر بە چەمکی کلاسیکی شۆڕش و بەچەمکی ئەو پارتییەی کە سۆسیالیزمی بونیادنراوی خولقاند هەڵسوکەوتمان بکردایە, ئەوا سەرکەوتنمان بەدەست نەدەخست. ئەو سەرکەوتنانەی لەدوای رووخانی سۆسیالیزمی بونیادنراو بەدەستمان خست, سەرچاوەی خۆی لە پێشکەوتنی خەباتی سیاسی, سەربازی و دیپلۆماسی, بەرەوپێشەوە بردنی مۆدیلێکی نوێی پارتی و سەرۆکایەتیمانەوە بەشێوەیەکی زۆر رێکخراوەییانە وەردەگرێت.

ئێمە ئامادەین مرۆڤایەتی خۆمان لەگەڵ دونیا و جولانەوە شۆڕشگێڕییەکان و تەواوی مرۆڤایەتی دابەش بکەین. ژیان بەسەر بردنمان لەسەر خاکی میزۆپۆتامیا, کە خاوەنی جێگایەکی دیاریکەرە بۆ لەدایك بوونی مرۆڤایەتی. شارستانییەتە سەرەکی و بنچینەییەکان لێرەوە بەدونیادا بڵاو بوونەوە. مرۆڤایەتی لەگەڵێك رووەوە قەرزداری ئەم خاکەیە. ئەو شەوەزەنگەی کە ئەمرۆ مرۆڤایەتی تێیدا دەژی و هەروەها رەوشی جیهان کە وێڕای ئەو کاولکارییە کۆمەڵایەتییانە, وای لێهاتووە ئیدی ناتوانرێت ژیانی تێدا بەسەر ببرێت, وایکردووە هەست بە پێداویستییەکی مەزن بکرێت بۆ ئاسۆ, فەلسەفە هەروەها ئیرادەیەکی شۆڕشگێڕانەی نوێی رزگاری. هەروەها ئەم خاکە ژمارەیەکی زۆر پێغەمبەر و فەیلەسوفی دەرخستۆتە مەیدان. ئێستاش بۆ پێشکەوتنێکی بەمجۆرەی شۆڕشی کوردستان, جارێکی دیکە مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە.

ئیمپریالیزم شێوە مرۆڤێكی دروست كردووە كە پێچەوانەی راستینەی مرۆڤایەتییە. ئەمە پێچەوانەی سروشت و كارەكتەری مرۆڤە, ئێمە ئەم رەوشە رەت دەكەینەوە. بگرە هەر لەرەگ و ریشەوە رەتی دەكەینەوە. سەرەكیترین وانە كە ئێمە بتوانین بیدەین, وانەی رەگ و ریشەی مرۆڤایەتییە.

ئێمە وەكو جولانەوەی PKK باوەڕیمان بەخۆمان هەیە. ئێمە بەڵێن نادەین بە تەكنیك و دەوڵەمەندی و, هەروەها ناڵێین:" بووژانەوەی ئابووری بەوجۆرە ئەنجام دەدەین و لەرێگای دەوڵەمەندی سەرخان و ژێرخانێكی بەمجۆرە, هاوكاری پێشكەش دەكەین " ئێمە لەپێناو بە مرۆڤ بوون دەژین و هیچ كاتێكیش لەم كارە پاشگەز نابینەوە. ئێستا بە پێچەوانەوە, ئەوەی لەئارادایە, " بەربەری "یەتە. ئێمە لەبەرامبەر ئەم بەربەریەتە بەرخۆدان دەكەین. تادواڕادە بڕوام بە سەركەوتنمان هەیە. رەنگە هەندێ كەس هەبن كە ئێستاش نەخوازن ئەو ئاستەی پێی گەیشتووین ببینن. دەتوانن لەشوێنی بەربەرییەتی و تیرۆریزمی بێ بەزەییانەی خۆیان, ئێمە بە تیرۆریست لەقەڵەم بدەن. ئەوەتا ئیمپریالیزمی ئەمریكی هەر دوێنێ بوو, من ناڵێم بە تیرۆری ترسناك, بەڵكو بە چەكێكی هەرە بەربەری هیرۆشیما و ناكازاكی تەفروتونا كرد.

لەڕەوشی هەنووكەدا كامە سیستەم لەپشت تاوان و رەشە كوژییەكاندایە؟ مەزنترین تیرۆریزم لەكام سیستەمدا هەیە؟ لەكام دەوڵەتدا هەیە؟ ناتوانین دەستبەرداری نرخاندنی ئەمانە ببین. بە پێداگرتنەوە دەڵێین: ئەمانە گەورەترین تیرۆریستن.

سیستەمی نوێی جیهانی, لەڕاستیدا گەورەترین بێ سیستەمییە كە مێژووی مرۆڤایەتی بەخۆوەی بینیوە. ئەوەی لەمەیداندایە سیستەم نییە بەڵكو هەموو جۆرە ناهەقییەك كە لەئەنجامی لەرێ لادان و خراپكردنی هاوسەنگی سروشتی و رزینی كۆمەڵایەتییەوە دروست دەبن, ناهاوسەنگییەك هاتۆتە ئاراوە كە تا دێت گرانتر دەبێت. ئێستا هەركەسێك دەتوانێت بەڕادەیەكی باشتر ئەنجامەكانی ئەم ناهاوسەنگییە ببینێت. دارزان پێشكەوتووە, كێشەكان قورس بوون. ئێستا دووبارەكردنەوەی قۆناخێك كە بە تێكۆشانی شێوازی كلاسیك یاخود بەشێوازەكانی شەڕی گەلێری كلاسیك, ئەگەر لەجێگای خۆیدا بێت ئەم وتەیە " مۆدێلی ئەمە بەسەر چووە. " مسۆگەر بۆ سیستەمێكی نوێی مرۆڤایەتی پێویستی بە روانگەیەكی سۆسیالیستی پێشكەوتووتر و گونجاو لەگەڵ رۆژانە هەیە كە بۆ كێشە سەرەكییەكانی مرۆڤایەتی هەم لەبواری فەلسەفی و مۆراڵ, هەم لەسەر بنگەیەكی زانستییانە چارەسەری بهێنێت و ئەمەش راستییەكی حاشاهەڵنەگرە.

لەم واتایەدا لەبەرامبەر بێ سیستەمی ئیمپریالیزم, ئەنتەرناسیۆنالیزمێكی نوێ خۆی دەسەپێنێت.

سەرچاوەی ئەو کێشە زەبەلاحانە هۆکارەکەی سیستەمی سەرمایەداری ـ ئیمپریالیزمییە. کێشەی شارە گەورەکانی ئیمپریالیزم، لەڕابردوو زیاتر قورس بووە، چ دەبێ با ببێ، دەتوانین لەناوەندی ئەوروپا و ئەمریکادا بە بەربەریەت بوونێکی جیاوازتر ببینین. ئەو وڵاتانەی کە بە دواکەوتوویی هێڵراونەتەوە و، هەروەها بە هۆی تەقینەوەی ژمارەی دانیشتوان و جۆرەها نەخۆشییەوە گەیشتوونەتە رەوشێك کە تێیدا ژیان بەسەر بردن زەحمەت بێت. مرۆڤایەتی لەسەدەی بیست و یەکەمیندا، کێشەکانی لەسەدەی نۆزدە و بیست زیاتر گرانتر دەبێت. هەربۆیە نەك بەشێوازی کلاسیکی شەڕی گەلێری یاخود شۆڕش لەسەر بنەمای چەمکە کلاسیکییەکان، بەڵکو رێگایەکی سۆسیالیستی کە مرۆڤ بە بنەما دەگرێت و بە بنەما وەرگرتنی سروشتی مرۆڤ و جێ و شوێنی ئازادی ئەو لەنێو کۆمەڵگا و مسۆگەر پێشخستن و پێشکەوتنی نوێکردنەوەی سۆسیالیزم، پێداویستییەکی دەست لێبەرنەدراوە.

ئێمە هێزی خۆمان لەرزگاری نەتەوەیی زیاتر، لەپێناو گەیشتن بە پارتییەکی کۆمەڵایەتی، مرۆڤ دۆست و ئەنتەرناسیۆنال سەفەربەر دەکەین. چونکە ئاسۆی مرۆڤایەتی تاریك کراوە و پێویست دەکات ئەم ئاسۆیە رۆشن بکرێتەوە. ئێستاش لەهەرکاتێك زیاتر بەوە گەیشتووین کە بتوانین نوێنەرایەتی بانگەشە مرۆڤایەتییەکان بکەین. هەلومەرجەکان چەندە قورس دەبێت بابێت، دەبێ لەمەدا رشت و شێلگیر بین. ئەمەش ئێمە بەرەو قۆناخی ئەنتەرناسیۆنالیزمێکی نوێ دەبات. ئەگەر شۆڕشی ئێمە وەکو هەر شۆڕشێکی دیکەش ببینرێ، ئەوا ئەمرۆ بەو رەهەندانەی پێی گەیشتووە، گرنگی و کاریگەری ئەنتەرناسیۆنالی دەرخستۆتە مەیدان.

گەلێك هێرشی چڕوپڕ لەسەر سۆسیالیزم هەیە، لەدوای هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراویش هێرشەکان لەسەر سۆسیالیزم درێژەی پێدەدرێ. ئەوروپای ئەمڕۆ بۆ لەگۆڕنانی سۆسیالیزم هەوڵ و تەقەلایەکی مەزن دەدات.

ئەوەی پێویست دەکات ئەنجام بدرێت، بەرۆژەڤ کردنی سۆسیالیزمی زانستییە وەك زانستێك.ئێمە باوەڕ دەکەین ئەمەمان لەلایەن پارتی خۆمانەوە ئەنجامداوە. لەم واتایەشدا ئەوەی کە پەرش و بڵاو بووەوە، بنەماکانی سۆسیالیزم نەبوو، بەڵکو ئەو پەرش و بڵاو بوونەوەیە بۆ هەندێ لەو هەڵە تاکتیکی و ستراتیژیەی قۆناخی رابردوو دەگەڕێتەوە، کە لەتوانایدا نییە وەڵامی ئەم قۆناخە بداتەوە.

لەهەر قۆناخێك زیاتر بانگەشەکانی سۆسیالیزم بۆ مرۆڤایەتی پێویست دەکات. مرۆڤایەتی یان لەگەڵ سۆسیالیزم دەژی، یان بەدەستی بەربەرییەتی سەرمایەداری لەنێو دەچێت و تەفروتونا دەبێت. ئەگەر نەخوازین مرۆڤایەتی لەنێو بچێت، ئەوا دەبێ تاوەکو دوایی پێداگری لەسەر سۆسیالیزم بکەین. ئەمڕۆ شۆڕشگێڕەکانی دونیا وەکو بڵێی هەریەکەیان وەك تاوانبارێك بن، گومان لەخۆیان دەکەن. ئەمە بە هیچ جۆرێك نزیك بوون و هەڵوێستێکی

ڕاست نییە. ئەوانەی کە پێویستە گومان لەخۆیان بکەن و شەرم بکەن شۆڕشگێڕەکان نین, بەڵکو ئیمپریالیزمە. ئێمە وەکو جوڵانەوەی PKK دەتوانین تادوایی بەدەنگێکی بڵند بانگەشەی شۆڕش بکەین. لە کاتێکدا کە ئەمە پەیڕەو دەکەین, ئەوە وەك هەڵئاوسانێکی (مەزن بینین) ناوەخن بۆش, هەروەها وەکو دەرکەوتێکی بێ بنەمای تیۆری پشت بەستوو بە ئیرادە, هەڵناسەنگێنین.

لەلایەن ئێمەوە سروشتی مرۆڤ بەشێوەیەکی زۆر باش هەڵسەنگێنراوە و شیکراوەتەوە. ئێمە ڕێزی مەزن لەتایبەتمەندییە ( کارەکتەر ) بنچینەییەکانی مرۆڤ دەگرین.

ئێمە دەتەوێن ئەو مرۆڤە رزگار بکەین کە سیستەمی ئیمپریالیزمی ـ سەرمایەداری شێواندوویەتی و خراپی کردووە. هەرگیز تەسلیمی ئەم سەرمایەدارییە نابین. ئەگەر تەواوی دونیاش یەکبگرێ و, تەواوی شۆڕشەکانیش لەنێو بچن تا دواڕادە بە بانگەشە مرۆڤایەتییەکانی خۆمان, لەبەرامبەر ئەو ژیانەی سەرمایەداری سەپاندوویەتی, بەرخۆدان دەکەین.

شۆڕشی کوردستان شۆڕشێکی بەرتەنگی نەتەوەیی نییە, بەڵکو لەڕووکەشدا نەتەوەییە, وەلێ لەگەوهەردا شۆڕشێکی مرۆڤایەتییە. تەنانەت ئەم شۆڕشە ئەگەر سەربکەوێت, ئەوا نەك شۆڕشی کۆمارێکی نەتەوەییە, بەڵکو شۆڕشی کۆمارێکی مرۆڤایەتییە.

سنوورەکان بۆ ئێمە زێدە گرنگ نین. کێشەی ئێمەش دروستکردنی سنوورەکان نییە. وەلێ بۆ سەربەخۆیی مرۆڤ و گەلان تا دواڕادە ئامرازێکی بێ ئامانین و, لەپێناوی ئەمەشدا شەڕێکی مەزنی ئێمە جێگای باسە. ئێمە ئەو مرۆڤەی کە فەتح دەکات و ئەو گەلەی کە پێویستی بە فەتح کردن هەیە, دەردەخەینە مەیدان. ئەمەش بۆ سۆسیالیزمی زانستی هاوکاری و دەسکەوتێکی مەزنە.

هەروەها ئەگەر ئەمڕۆ سەیری پەیوەندییەکانمان بکەین لەنێوان گەلی کورد و تورك, ئەوا ئاڵۆزییەك دەبینین. ئیمپریالیزم لەسەر هەردوو گەل بە پشت بەستن بە شێوازە جیاجیاکانی نۆکەرایەتی سیستەمێکی چەوساندنەوە و داگیرکاری زۆر تێکچڕژاوی پێکهێناوە.

ئەمڕۆ کۆلۆنیالی تورك دەیەوێت گەلی کورد و کۆنترین کولتوور کە مێژوو ناسیویەتی لەنێو ببات. بەرژەوەندی رەهای تاکڕەوانە, هەروەها ستراتیژی هەندێك دەوڵەتی وەکو ئەمریکا و ئەڵمانیا دەیانەوێ ئەم مرۆڤایەتییە و گەنجینە کولتوورییەکانی بەشێوەیەکی وەها لەناو تاریکییەکانی مێژوودا بشارنەوە و لە گۆڕ بنێن, کە ئیدی جارێکیتر نەتوانرێت زیندوو بێتەوە.

ئەو رەوشەی کە ئێمە تێیدا ژیاوین ڕووداوێکی کۆلۆنی ئاسایی و سەرکوتکردنێکی ڕەهای سیاسیش نییە. تەنانەت رەوشێك نییە کە بتوانرێت بە سەرکوتکردنی نەتەوەیی گوزارشتی

لێ بکرێت. بەڵکو سیاسەتێکی ڕەشەکوژی وەها لەسەر گەلەکەمان بەڕێوە دەچێت کە نموونەی نەبینراوە. ئیمپریالیزم ناخوازێ ئەمە ببینێ. لەبەرئەوەی نەیدیوە بۆیە کاتێ باس لە " بۆسنا " دەکرێت, هاوار دەکات و, کە باس لە " چیچان " دەکرێت سەرهەڵدان دەکات. هەر رۆژ دەیەوێت بە کێشە بچووك و بێ ماناکانەوە لەنێو رای گشتییەوە خۆی خەریك بکات. هاوکات سەبارەت بە کێشەی کورد دووڕووە و تا دواڕادە بەهاوکاریکردنی رژێمی تورکیای فاشیست ناخوازێت بەهیچ شێوەیەك تاوانی ئەم کۆکوژییە ببینێ. لێرەدا مسۆگەر پێویستە کەسایەتییە دیموکرات و سۆسیالیستییەکانی رۆژئاوا, دووڕوویی وڵاتەکانی خۆیان ببینن. ئەمە دەبێتە پشتیوانییەکی هەرە گرنگ و ئەنتەرناسیۆنالی لەنێو گەلی کوردی ستەم دیدە و گەلانی دونیادا. هیچ تاوانێك هێندەی تاوانی کۆکوژی نییە کە لێبوردنی بۆ هەبێت.

لەکوردستاندا رەوشی تاوانێك لەئارادایە و تێکڕای وڵاتە سەرمایەدارەکان لەم تاوانەدا بەشدارن. لەخۆڕایی نییە کە لەدونیادا وەکو هێزی تیرۆریستی پلە یەك ناوزەد دەکرێین. ئەمانە وەکو نموونەی "دز"ێکی سامناکن, هەم قورسترین تاوانی مرۆڤایەتی ئەنجام دەدەن و هەم ئێمەش بە تاوانکار لەقەڵەم دەدەن. هەربۆیە لە ئەوروپادا گەمە مەزنەکان رێکخران. بۆ نموونە تاوانی ئۆڵف پاڵمە لەقۆناخێکدا ئەنجامدرا کە لەنێو ناتۆدا هێزە پاشڤەڕۆکان و هەروەها " ریگان ", " هیلمۆت کۆڵ " لەسەر کار بوون کە لەسەرەتاوە تاوەکو کۆتایی بۆ لەقەڵەمدانی PKK وەك تیرۆریست و قووڵکردنەوەی دوژمنایەتیکردنی سۆسیالیزم ئەم تاوانە ئەنجامدرا. جوڵانەوەی ئێمە وەك جوڵانەوەیەکی مارکسی ـــ لینینی و بە مەترسیدارترین جوڵانەوە لەدونیادا هەڵدەسەنگێنن کە هەتا ئێستا لەسەرپێی خۆی ماوەتەوە.

ئێمە لەمەدا هەست بە شانازی دەکەین. هێرشکردنی ئەڵمانیا بەم ئەندازەیە بۆ سەر ئێمە لەبەر ئەنجامدانی هەندێك چالاکی توند و تیژی ئێمەوە نییە. بەڵکو ئەوان لە ئێمە و لەسۆسیالیزم دەترسن. دەیانەوێ لەکەسایەتی ئێمەدا سۆسیالیزم لەنێو ببەن و لەبەرئەوەی لەمەدا سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە, کین و تووڕەیی نیشان دەدەن. ئێمە لەبوونمان بە پارتییەك کە لە ئەوروپادا رووپاك و بە قارەمانێتییەوە گرێدراوی بانگەشەکانی سۆسیالیزمە, هەست بە شانازی دەکەین.

شۆڕشی کوردستان شۆڕشێکی بەرتەنگی نەتەوەپەرستی نییە. شۆڕشی کوردستان هاوکات شۆڕشی تورکیاشە. شۆڕشی سەرکەوتووی کوردستان و, شۆڕشی سەرکەوتووی تورکیایە. تەنانەت شۆڕشی کوردستان, شۆڕشی خۆرهەڵاتی ناوین و قەفقاسیا و بەڵکانیشە.

ئێمە هەردەم ئامادەین لەگەڵ گەلی تورکیادا پەیوەندییەکانمان سەر لەنوێ رێك بخەینەوە. تەنانەت بێ ئەوەی کێشەی سنوورەکان بکەینە رۆژەڤ, ئامادەین لەنێو یەکپارچەیی خاك و

جوگرافیایەکی دیاریکراودا, سەرلەنوێ پەیوەندییەکان لەسەر بنەمایەکی ئازادی سیاسی و کولتووری و مێژوویی گەلان رێك بخەینەوە. ئەوەی ئێمە لەبنەمادا دەتەوێن ئەوەیە کە, کۆتایی بەرەشەکوژی گەلی کورد بهێنرێ و پەیوەندییەکانیشی لەسەر هەمان خاکدا بەشێوەیەکی مرۆییانە رێك بخرێتەوە. رژێمی تورکیای کۆلۆنی. زیاتر بە خوێن رشتن و شۆڤێنیزم وەلامی ئەم داخوازییەمان دەداتەوە. گەلی تورك خراوەتە ژێر کاریگەری قورسی شەپۆلێکی شۆڤێنی. وێڕای ئەوەی کە ئێمە لەنێو نزیکبوونێکی ئەنتەرناسیۆنالیداین, کەچی شۆڤێنیزمی تورکیا, کە گەلێك کاریگەرە, بە پێشخستنی ئەم رۆحە لەنێو گەلی تورکدا ئاستەنگی دروست کردووە. هەوڵ و تەقەلا و پێداگری ئێمە, گەلی تورك بۆ ئەم خاڵە راستە دەهێنێت.

لەخاکی خۆماندا لەگەڵ گەلی تورك ئەنتەرناسیۆنالیزمێکی نموونەیی, پێشدەخەین. ئێمە ناکەوینە نێو نەتەوەپەرستییەکی تەنگ و دەرفەت بەوە نادەین کێشەی سنوورەکان ببنە ئاستەنگ. ئێمە ناکەوینە نێو گفتوگۆی سادە و ساکاری لەشێوەی " ئەوەندە زەوی بۆ تۆ و ئەوەندەش بۆ من" ئەوان کە دەڵێن " هیچ شتێکی پێنادەین و هەموو شتێکی لێدەگرین... " دوای ئەوەی ئازادی گەلان فەتح بکرێ, ئەوا بۆ ئێمە بەواتای پێکهێنانی ئەنتەرناسیۆنالیزمێکی هەرە گرنگە, ئەمەش نوێبوونێکە و باوەڕ دەکەم لەمەدا سەرکەوتن بەدەست دەخەین. تادێت شۆڕشی کوردستان زیاتر دەرفەتەکانی پێشکەوتن و سەرکەوتن دەڕەخسێنێ. ئەمەش نیشانەی شکست خواردنی نییە. گەلی کوردستان گەیشتۆتە راستینەی گەلێکی شەڕکەر.

ئێمە, پێداویستی لەنێوبردنی سیستەمی ئیمپریالیزمی نێودەوڵەتی, وەکو ئامانجێکی یەکەمین دەبینین, ئێستا بەرخۆدانێکی گەلێك دژوار و زەحمەت بەڕێوە دەبەین. ئەگەر ئێمە بتوانین ئیمپریالیزم لەبەرەی کوردستان دەربپەڕێنین, ئەوا شۆڕشی ئێمە هاوشێوەی شۆڕشی ئۆکتۆبەر دەبێت, تەنانەت دەبێتە شۆڕشێك کە لەویش بەکاریگەرتر بێت.

شۆڕشی کوردستان بە ئەندازەی ئەوەی تێکشکان ناناسێت و هیواکانی رزگاری گەلی کورد و هەروەها پێکهێنانی هەنگاو بەهەنگاوی رزگارییە, بەهەمان ئەندازەش وەکو شۆڕشێکی بێ وێنەیە بۆ گەلانی ناوچەکە و تا دەچێت دەبێتە موڵکی سەرجەم گەلانی جیهان. هەروەها لەئاستێکی بڵندتردا توانستەکانی نوێ بوونەوەیەکی سۆسیالیستی, شۆڕشی ژن, شۆڕشی مۆراڵ و, لەم واتایەدا, توانستەکانی پێشکەوتنێکی نوێی فەلسەفی, دەردەخرێتە مەیدان. رەنگە بەتەواوی, پێشکەوتنی پێویستی بەدەست نەخستبێ, بەلام بۆ مرۆڤایەتی بۆ گەلەکەمان بۆ هەموو دۆستەکانمان پێشکەوتنێکی باشمان بەدی هێناوە.

بێگومـان زەحمەتکێشـان و سـتەم لێکـراوان و چەوسـاوەکان لەسـەرەتای مێـژووەوە تـاکو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان خاوەنی تێڕوانینێکی تایبەت بەجیهان و بەرژەوەندی خۆیان بوون، لەسەر ئەم بنەمایەش هاوکاری و ڕێکخستن و تێکۆشانیان پێش خستووە و تاکو ئێستاکە بەردەوامە.

هەتا مرۆڤایەتی هەبێت مێژووی تێکۆشانی سۆسیالیزمیش بەردەوام دەبێت.

لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ژیانی کۆمەڵگای مرۆڤایـەتی بەبنەمایـەکی زانستیانە گەیشتوونە، لـەنێو ناکۆکییـە مەزنـەکانـدا دووچـاری شـڵەژان هـاتوون. چـونکە لەلایەکـدا ئـەو هەڵوێسـتە دڕندانەیەی لەنێو مرۆڤایەتیدا دەرکـەوتووە لەئاستێکدایە ئاژەڵـە دڕنـدەکانی تێپـەڕ کـردووە، لەلایەکی دیکەشەوە داخوازییەکانی گەیشتن بەیۆتۆپیای بەهەشت جێگەی باسـە، بەئەنـدازەی بانگەشـەکانی کۆمــەڵگا، دژایــەتی و هــاربوون و زێــدەڕۆیی دژوارانــە بەسـەریدا دەشـکێتەوە، تێکچڕژاون و ململانێی ئەمانە ناکۆکییەکان چڕتر و ڤاڵتر دەکاتەوە.

بەکۆمەڵگابوون شێوەیەکی هەبوونە و تایبەت بەمرۆڤ وبەبێ ئەو نابێت. کێشـمە کێشیش لێرەوە دەست پێدەکات.

تاچ رادەیەك بەکۆمەڵگابوون بۆ تاك پێویست و گونجاوە؟ تـاچ رادەیـەك ئـازادی تـاك لـەناو کۆمــەڵگادا بــۆ کۆمــەڵگا پێویســتە؟ ئەمــە گەوهــەری ناکۆکیەکەیــە. هەربۆیــە ئایدیۆلۆژیــە جیاوازەکان بەبەردەوامی گەلێك چارەسەری جیاجیایـان پێشخستووە و تاڕۆژگاری ئـەمڕۆمان توانیویانـە بەسۆسیالیزمێکی نزیـك لەزانسـت بگـەن. شـیکردنەوەی کۆمـەڵگا تـەنیا لەمیانـەی سۆسیالیزمەوە ئەنجام نەدراوە، بـەڵکو پێشـتریش تـەواوی ئایینـەکان، سیحر و تەنانـەت هـزرە جیاوازەکانیش، ئەگەر بەئەرێیی بێت یاخود نەرێی، کاریگەریان لەسەر بەکۆمەڵگابوونی مرۆڤ کـردووە. کێشـمەکێش و ململانێـی نێـوان پاشـڤەڕۆیی ــ پێشـکەوتووخوازی، هـزری تـاریکی ــ ڕوونـاکی، هەڵوێسـتەکانی دوژمنایـەتی ــ دۆسـتایەتی، هـەموویان بەرهـەمی ئـەم ناکۆکیـەن. هەروەکو دیارە ئەم ناکۆکیانەش بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی هەبووە و بەردەوام دەبێت.

ئەم زاراوە و دەستەواژە گشتیانە بـۆ ئـەوە دیاری دەکـەین کـە ئـەو کـەس و توێـژ و چینە کۆمەڵایەتیانەی ستاتۆیەکی چەوسێنەری و ستەمکاریان هەیـە، بـۆ ئـەوەی بەرژەوەندیـەکانی خۆیان لەمیانی ئەو پڕوپاگەندەیەی کە لەسەر بنەمای فشار و گوشار هێنـان جـەختی لەسـەر دەکەنـەوە، ئەوەیـە کـە ئـیتر کۆتـایی بەسۆسـیالیزم هـاتووە، ئەمانـەش ئـەو هەڵوێسـتانەن کـە گوزارشـت لەبەرژەوەندیـەکانیان دەکـات و دەیانـەوێ ئـەوە دووبـارە بکەنـەوە کـە ئـەم ڕەوشـە قەدەرێکـە و ناچارییە. لەکاتێکـدا دەرفـەتیان بـۆ ڕەخسـاوە دەوڵـەت و هێـزە سەرکێشـەکانی ئیمپریـالیزم و ئایدیۆلۆگـەکانیان لەئاسـتی جیـاوازدا بەتـەواوی هێـز و توانایانـەوە هـەوڵی بەدەست هێنان و مسۆگەرکردنی سـەرکەوتن دەدەن. ئـەوان دەیانـەوێ ڕەوشی هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیـادنراو بـۆ بـەهێزکردنی بانگەشـەکانی خۆیـان بقۆزنـەوە و بـەکاریبهێنن،

لەڕاستیدا سۆسیالیزم پێشکەوتنێکی مەزنی هێناوەتە ئاراوە ئەو سۆسیالیزمەی کە هەڵوەشاوەتەوە و یاخود تێپەڕکراوە، تەنیا جۆرێکی ئەم سۆسیالیزمە بوو.

لەهەر سەردەمێکی مێژوودا قۆناخی بەم جۆرە دێنە ئاراوە. ئەو هێزانەی لایەنگری بەرژەوەندی خوازی و ستاتۆیەك لەسەربنەمای سەرکوتکردن و چەوسانەوە دەکەن، لەڕێگای گوتنی " سوود وەرگرتن لەدەرفەت " تەواوی هونەرەکانیان بۆ پێویستی زاڵبوونی یەکجارەکی بەرژەوەندیەکانیان بەکاردێنن.

ئەگەر بەهەند وەرنەگیرێن ئەوا زۆر بەسانایی دەتوانن سەرکەوتن بەدەست بهێنن. لەم چوارچێوەیەدا، تێگەیەشتنێکی قووڵی هەموو لایەنەکانی راستینەی قۆناخی هەنووکەیی سەبارەت بەتێکۆشانە کۆمەڵایەتیەکان گرنگ و بایەخدارە.

بێگومان لەپێناو چەمکێکی راستی ژیان و تێگەیشتنی جیهان پێویست بەتێکۆشانێکی توێژە سەرکوتکراو ـ چەوسانەوەکانی مرۆڤایەتی لەجیهاندا دەبێت ـ سۆسیالیزمی بونیادنراویش قۆناخێکی ئەمە بوو- بەرلەوەش لە شۆڕشی فەرەنسادا هەبوو. هەروەکو چۆن ئەوانەی لەم شۆڕشانەدا چینی ژێر و ستەملێکراو چەوساوەکان بوون، ئەوا ئەوانیش خاوەن بۆچوونی رادیکاڵانەی سەبارەت بەجیهان و ململانێ و شەڕ بوو. بەدرێژایی مێژوو ئەمە لەنێو هەر گەلێك و قۆناخێکی مێژوو بەبەربڵاوی هاتۆتە ئاراوە. هەڵبەتە نابێت ئەمانە ببینە کۆسپ لەپێش بینینی ئەو راستیانەی کە رۆڵی دیاریکراویان هەیە. لەڕۆژگاری ئەمڕماندا دەبێ خۆ لەوە دووربگرین کە لەمیانەی هەڵوێستەکانی نکۆڵیکردن و زێدەڕۆیی، هەموو لایەنەکانی راستی هەڵسەنگێنین.

دەتوانرێ بگوترێ کە: هەموو کاتێك ستەم لێکراو چەوساوەکان بەچڕی و، هەتا دوایی بیرناکەنەوە، بەتایبەتیش لەبواری بیرکردنەوەی سیاسی ـ فەلسەفی، تاوەك دوایی بەشێوەی درێژە پێدەری هزری باڵادەست و چەوسێنەرەکان ماوەتەوە. بۆ ئەوەی راستینەی ئایدیۆلۆژی ـ سیاسی سەربەخۆی خۆیان نەبینن و لەمیانەی شۆڕشەوە نەیگۆڕن، ئەوا لەڕێگای زەبرەوە یاخود هەڵخەڵەتاندن ڕێگایان لێ دەگیرێت. ئەندێشەکانی ژیانی رۆژانە و هەلومەرجەکانی ژیانی کە پێ بەپێ ئاستەنگ دەبێت، بەبەردەوامی لەدژی زەحمەتکێشان دەشکێتەوە و، دادەخرێت.

ئەمە بەتایبەتی لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بەفراوانی ئارادایە. رەوشی نەبوونی ئاسۆ و نەسەپاندنی ئەو هەنگاوەی کە پێویستە بەسەر رۆژگاردا بسەپێنرێ، تادواڕادە باو و بەربڵاوە. ئەمەش لەڕاستینەی جیهان و تورکیا ـ کوردستان ئاشکراتر و بەرجەستەترە. بەمجۆرەش راستینەی نەفرەت لێکراوی مێژووی ستەم لێکراو چەوساوەکان هااتۆتە ئاراوە. لەم چوارچێوەیەشدا راستینەی زاراوەی "گەلی نەفرەتلێکراو، چینی نەفرەت لێکراو " کە

بەردەوام بەکاری دەهێنین. بۆ ئەم راستینەیە دەگەڕێتەوە. رزگار نەبوون لەوابەستەیی و پاشکۆیەتی سەردەست و چەوسێنەرەکانیان و پەیوەندیە بەرژەوەندیخوازیەکانیان، تەنانەت خۆتێهەڵ قورتاندنیان، بەواتای کەسێتی و چین و گەلی نەفرەت لێکراو دێت. ئەمەش هۆکاری سەرەکی هەموو جۆرە سوکایەتی کردن و بچووك بینینێکە.

بەشێوەیەکی ئازاد نەبینی راستینەی خۆی؛ ئەوا بەبەڕێوەچوون لەسەر رێبازی شوێنپێی فەرمانڕەوا و چەوسێنەر و دوژمنانی و تەنانەت بوون بەداردەست و مەرایی کردن بۆیان، کە کەوتوترین و قێزەونترین رەوشە کە تێی دەکەوێت. ئەمەش بناخەی بێ رەوشتی یە. بێ گومان ئەمە هۆکاری هەموو جۆرە هزرێکی ناتەواوە و تەنانەت هۆکاری بەدیهێنانی نزمترین ئاستی بەدیهێنانی بەرژەوەندیەکانی خۆیەتی. بەجەختکردنەوە، ئێمە ووشەکانی "قێزەونی، ساختەکار "ی مان بەشێوەیەکی بەربڵاو سەبارەت بەم خاڵە بەکارهێنا و لەجێگای خۆشیدایە و تاوەکو دوایی لەسەر ئەوە سووربین.

لەم بوارەشدا پاراستنی ئاسۆی سۆسیالیزمی بەپێداگری و بڕیاربوونێکی مەزن و ئەنجامدانی بەشێوەیەکی ئازادانە و لەمیانەی تێکۆشاندا، گرنگ و بایەخدارە. کاتێك ئەمە ئەنجام دەدرێت، زۆر گرنگە کە دۆگماتیانە نەبێت و نەکەوێتە نێو لادان و سەرلێشێواویەوە. چونکە مەگەر هەر زەحمەتکێشان زیاتر لەبواری زانستیدا لەکۆمەڵگا تێبگەن هەر چینێکی دوور لەڕەنج دەشێ پەنا بباتە بەر تەلەکەبازی و هەموو جۆرە دۆگماتیزمێك. لەوانەیە گەلێك بانگەشەی دروستکراو وەکو ئایدیۆلۆژیایەکی هەمیشەیی تەنانەت رەهاش دەسەپێنێ. بەڵام هەروەکو لەهەموو قۆناخەکانی مێژوو روویداوە، ئەوانەی خاوەنی رەنجن، ئەوانەن تاوەکو دوایی لەنزیکەوە لەگەڵ ئەنجامەکانیەوە پەیوەندیدارن، زەحمەتی لەپێشخستنی ئایدیۆلۆژیای نوێ و شۆڕشگێڕی نابینن؛ لەم پێناوەدا بەبڕیارین و دەیخوڵقێنن.

**"ئەوەی سەد ساڵی ئێمەی بەتەواوی کاریگەر کردووە لینینیزمە"**

ئەمڕۆ کاتێك کە گفتوگۆ لەسەر سۆسیالیزم دەکرێ, هەرە زێدە گفتوگۆ لەسەر ئەو سۆسیالیزمە دەکرێ کە نزیکەی 70 ساڵە کاریگەری لەبەشێکی مەزنی دونیا کردووە، واتە ئەو سۆسیالیزمەی کە ئاوا کرا و ئەمڕۆ هەڵوەشایەوە یاخود دەرباز کراوە.

رەنگە باسکردنی ئەمە بۆ جارێکی دیکە، سوودی هەبێت. ئێمە دەتوانین ئەم سۆسیالیزمە بەشێوەیەکی گشتی، هەڵبسەنگێنین. هەڵسەنگاندنی سۆسیالیزمی بونیادنراو، وەکو ئەوەی هەموو لایەنێکی سۆسیالیزمە، سنووردارە و لەجێگەی خۆیدا نییە. خۆی لەخۆیدا بەلەبەرچاوگرتنی بنەماکانی لینینیزم، کە لەمیانەی ئەو نزیکبوونانەی قورسایی دەخاتە سەری لایەنی سیاسی ـ تاکتیکی، ئەمە لەمێژووی سۆسیالیزمدا هەڵسەنگاندنی هەرە گونجاوە لەلایەنی تاکتیکی قۆناخدا.

لەوێدا تایبەتمەندی هەرە بنەڕەتی ئەم قۆناخە چی یە؟ بێگومان ناکۆکییە زەقەکانی سەرمایەداری ـ ئیمپریالیزم و داسەپاندنی هەردوو شەڕی جیهانی لەئارادایە. بەرلەمەش گەلێك شەڕی بێ واتا هەن. لەو قۆناخەی کە جیهان دژ بەبەرژەوەندی گەلان دابەش و پارچە کرا و، بەشێوەیەکی قەبە چەوساوەنەوە بەسەر زەحمەتکێشان پەیڕەو کرا و، لەسەر بنەمای پێشکەوتنی خێرای زانست و تەکنەلۆژیەکان لەئارادایە پێشکەوتنی خێرای زانست و تەکنۆلۆژیا کە لەو ماوەیەدا پێشکەوت، زەحمەتکێشان و نەتەوە و گەلان بەرەو وشیاربوونەوەیەکی خێرا و بەنەتەوەبوون هەنگاویان هەڵهێنا، لەڕەوشێکی وەهادا لینینزم بووە ناوی " جوڵانەوەیەکی مەزنی ئازادی" . بەڕاستیش ڕێگا لەبەردەم کاریگەریەکی زۆر مەزن ئاواڵا دەکات.

سەدەی بیستەم سەدەی لینیزمە.

هەرچەندە لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا بڵێین:" لەبەرچاو کەوتن "وەلێ لەڕاستیدا ئەوەی کاریگەری لەتەواوی سەدەی بیستەم کردووە لینینزمە.

ئێمە باش دەزانین لەسەرەتادا سۆسیالیزمی زانستی لەڕێگای "مارکس ـ ئەنگلس" ەوە قۆناخێکی مەزنی تۆمار کردووە. بەتایبەت تێڕوانینی بۆ دونیا زیاتر زانستی کردووە و بەرەو ڕێگای ڕێکخستن ئاراستەی پێگرتووە، وەلێ لەواتای سیاسەت و تاکیتیکدا زێدە پێشکەوتوو نەبوو. بەتایبەت لەئەزموونی کۆمۆنەی پاریس و، هاوشێوەی ئەوەش لەهەندێ سەرهەڵداندا کاریگەری زۆر سنووردار بوو. لینینزم.ئەم تاکتیك و سیاسەتەی لەو بوارەدا بەشێوەیەکی وەستایانە جێگیر و سەقامگیر کردووە و، گۆڕانی دونیا لەڕێگای شۆڕش و پێشخستنی شۆڕشی سۆسیالیستی، پێشکەوتنێکی مەزنی بەدەست هێنا. هەروەکو چۆن ڕۆڵی سەرەکی خۆی لە لایەنەکانی ئایدیۆلۆژی ـ مۆراڵدا نەناسیوە. ئەوا لەڕەوشی ئەوەشدا نەبووە کە کۆلۆنیالی کلاسیکی دونیا و، لەسەرووی هەمووانەوەی کاریگەری سەرمایەداری ـ ئیمپریالیزمی لەگەلێك لایەنەوە لەبەرچاو بگرێ و هەڵبسەنگێنێ. ئەوەی دەیخواست رزگاری بکات: بەلاوەنانی کۆلۆنیالی زۆر قەبە و سیستەمی چەوسێنەر بوو. هەروەها بۆ گەلان و زەحمەتکێشان، خولقاندنی ژیان و دونیایەك کە تاڕادەیەك بۆ ژیان گونجاو بێ. لەڕاستیدا لەمەشدا سەرکەوتوو بووە.

لەم واتایەدا، ئێمە ناڵێین سۆسیالیزمی بونیادنراو بەتەواوەتی هەڵوەشاوەتەوە و شکستی خواردووە. چونکە گوتنی ئەمە دەبێتە درۆیەکی مەزن.

بێگومان وێڕای گەلێك کەموکورتی و چەوتییەکانی کە لەگەڵ سۆسیالیزم یەك ناگرێتەوە، بەڵام لەلایەنی ئازادکردنی زەحمەتکێشان و بەرەوپێش بردنی لایەنی ماددی و مەعنەویدا گوزارشت لەقۆناخێکی مەزن دەکات. لەڕاستیدا لینینیزم لەبەنەتەوەبوونی گەلان و

لەپێشخستنی ئازادی و سەربەخۆییدا گوزارشت لەقۆناخێکی مێژوویی گرنگ دەکات. لەم واتایەدا ئەم قۆناخەی سۆسیالیزم پڕە لەسەرکەوتنی مەزن. کاتێ دەگوترێ: باشە ئەوەی کە وەکو هەڵوەشاوە دەرباز بوو دەبینرێت، چییە؟" دەکرێ ئەو ڕەوشە بەهۆی خۆ نوێکردنەوە، بەڕۆژەڤ نەکردن و نەبینینی کێشە نوێکان و نەبوونی شێوازەکانی چارەسەرییەوە فۆرمیلە بکرێت. لەڕاستیدا ئەو پرۆگرامەی لەسەرەتای سەدەی بیستەم هەبوو کەم تا زۆر لەئەزموونی سۆڤیەتدا پێکهێنراو بەسەرخرا.

بۆ نموونە، لەچارەکی دوایی سەدەی بیستەمدا باس لەگەیشتن بەکۆمۆنیزم دەکرا. هەر ئەو کات دەتوانین ئەوە بەخەیاڵێك و زێدەڕۆییەك ببینین. لەقۆناخێکدا کە دونیای سەرمایەداری ـ ئیمپریالیست لەکۆمەڵگای کۆیلایەتی رابردوو بەهێزترە، بەتایبەت کەلە تاکدا بەشێوەیەکی بەربڵاو بەرجەستە بووە، باسکردن و بانگەشەی کۆمۆنیزم خۆ مەزن کردن و فریودانە. وەلێ ئەوەی کە پێویستە لێی تێبگەین ئەوەیە کە تاکتیکی لینینستی بەرەو کۆتایی دەچێ یاخود ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ دەکات و دەروازە لەبەردەم قۆناخێکی نوێ دەکاتەوە.

ماوەیەك پێش ئێستا گورباچۆف بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر لەتورکیادا دەگەڕا. لەکاری ئەم هەڵوەشانەوەیەدا (واتە هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو )، گۆرباچۆف، ئەو کەسەیە کە هەرە زێدە باس لەناوی دەکرێت. لەڕاستیدا ئەگەر بەدەرککردن یاخود دەرك نەکردنیش بێت ئەو ناکۆکییە بەرجەستە دەکات. لەوانەیە هەوڵ بدات دەری ببڕێت، وەلێ زێدە پێویست بەسەلماندن ناکات. خۆی لەخۆیدا ئاستی ئازادی گەلان و زەحمەتکێشان بەشێوەیەك پێش کەوتووە کە ناتوانرێ وەك سەدەی نۆزدەهەم پێوانە بکرێت.

ئەمانە بە تەواوەتی ئەنجامێکی سۆسیالیزمی زانستی و سەرکەوتنی تاکتیك و پراکتیکی لینینیزمە. بێگومان لەو قۆناخەدا گەلێك پارتی دامەزرێنراون. بە تایبەت ئەوەی جێگەی باسە تاکتیکەکانی تێکۆشانی ئەو پارتانەیە. تەواوی ئەو پارتانە لە لینینیزمدا بە بەرفراوانی تاوتوێ کراون و باسی لێکراوە. بەلام کاتێ بەرەو ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دێین، ئیدی ئەو مەودایەی کە پێویستە وەربگرێت، وەرگیراوە و ئەو ئامانجانەی کە پێویستە بە دەست بخرێت، کەم تا زۆر بەدەست خراوە. هەربۆیە پێویستی دەکرد ئامانجەکانی دیاری بکات. ئەمەش هەڵسەنگاندنی ڕەوشی ڕۆژانەی مرۆڤایەتییە، واتە لەمەشدا دەرخستنی ئامانج و پرۆگرامەکانێتی، یان نوێ کردنەوەی پارتییە کۆمۆنیستیەکان، یان ئاواکردنی پارتی نوێیە. پێویستە سۆسیالیزم بگەیەنرێتە قۆناخێکی نوێی بەمجۆرە. ئەوەی کە پێویست بوو ئەنجام بدرێ ئەمە بوو، وەلێ ئەوەی کە بە پێی پێویستیش ئەنجام نەدرا، هەر ئەمە بوو.

جێبەجێ کردنی ئەمەش زەحمەت بوو. چونکە ئاستی بەدەوڵەت بوون لەسۆڤیەتدا، بۆ ئەمە ئاستەنگ بوو. ناکۆکی بنەڕەتی و سەرەکیش لێرەوەیە. بێگومان بەدەوڵەت بوون بۆ

قۆناخی ئەو سیۆسیالیزمە پێویست بوو و ناکرێ نکوڵی لەمە بکرێت. وەلێ زەبەلاح کردن و زێدەڕۆیی بەدەوڵەت بوون تا ئەو رادەیە، لەگەڵ گەوهەری سۆسیالیزم ناکۆك بوو. کەواتە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سۆسیالیستی، تەنانەت دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا، بە واتای دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی سۆسیالیستی نایەت. بگرە خوڵقاندنی مرۆڤێکی سۆسیالیستیش نییە.

هەڵە و هەڵەکاریش بەگرانی لێرەوە سەرچاوە دەگرێ. وا مەزندە دەکرا کە ئاواکردنی دەوڵەتێکی باش، تێری هەر شتێك دەکات، لەکوێ دەبێت با ببێت، لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا چەمکی دەوڵەتگەرایی بۆ ئاستێکی هەرە بڵند بەرز بۆتەوە. وەکو بڵێی شتێکی پیرۆزە، هەرکەسێك باس لە "دەوڵەت، بەرژەوەندی دەوڵەت " دەکات. وەلێ سەیرە کە ئەمڕۆ هەموو کەسێك هەرە زێدە سکاڵا لە دەوڵەتگەرایی دەکەن. ئەوانەی کە هەرە زێدە دەوڵەتگەراییان دەکرد و، بەرژەوەندییان لە دەوڵەتگەراییدا هەبوو، کەچی ئەمڕۆ بە پێویستی دەبینن دژایەتیکردنی دەوڵەتگەرایی بکەن. بە ئاشکرا و خۆی لەخۆیدا دەردەکەوێتە روو کە ئەم رەوشە چەندە پێویستی بە سۆسیالیزم هەیە.

لەڕاستیدا ئەوەی کە هەرە زێدە لەبەرامبەر بە دەوڵەت بوون رادەوەستا، سۆسیالیزم بوو. تەنانەت لەلایەنی تیۆریدا گوزارشتی لە نەمان و نەهێشتنی دەوڵەت دەکرد.

لەتەواوی ئایدیۆلۆژیا کۆلۆنیالییەکانی دیکە جێگەیەکی زۆر پیرۆزیان بە دەوڵەتگەرایی بەخشیوە. سۆسیالیزم جێگە بە دەوڵەتگەرایی نادات. وەلێ سەیرە کە ئەمڕۆش ئەوانەی کە هەرە زێدە لایەنگری لیبرالیزم ـ سەرمایەدارین، لەدژی دەوڵەت کەوتوونەتە نێو گفتوگۆوە. لەتورکیادا ئەوانەی کە هەرە زێدە سەرمایەدارن، باس لە بەتایبەت بوون و بچووك کردنی دەوڵەت دەکەن. لەڕاستیدا ئەو کارەی کە سۆسیالیزم ئەنجامی بدات، دەیانەوێ زیاتر بە شێوەیەکی دووڕوویانە و درۆکردنەوە، بۆ بەڕێوەبردنی خۆیان ئەمە ئەنجام بدەن.

کەواتە پێش هەر شتێك سۆسیالیزمی نوێی ـ رۆژانە، لەبەرامبەر ئەم دەوڵەتگەراییە، لەهەر کام لە ئایدیۆلۆژیاکان زیاتر لەڕەوشی دژایەتی کردندا دەبێت. بۆ ئەوەی بتوانرایە دەوڵەت بچووك بکرێتەوە و لەناو ببردرێت، پێویست بوو رەوشی پڕ مەترسی، بێ واتا و تەنانەت کەوتنە نێو رەوشی ناکۆکی سەرەکی لەلایەن دەوڵەت ببینرابایە و چۆنێتی لە تێپەڕاندنی ئەو پیشان بدرابایە.

تەنانەت لەم واتایەدا دەزگای دەوڵەتی سۆڤیەتی وەکو هێزێکی هەرە بنەڕەتی کە ئاستەنگ دەنێتەوە، لەبەرامبەرمان دەردەکەوێتە روو. بێگومان لەمەدا ( شوێنەواری ) خۆی لەکۆمەڵگا کۆنە کلاسیکیە کۆلۆنیالەکاندا هەیە. سەپاندنەکانی سەرمایەداری ـ ئیمپریالیزم بەکاریگەر بوو. وەلێ هۆکاری دیاریکەری بنەڕەتی بۆ دەربازکردنی ئەمەش ئیرادەی سۆسیالیستیانەیە.

ئەمە ئەو لایەنەیە کە پێویستە تێیدا بەرپرسیار ببینرێت. لەڕاستیدا ئەمڕۆ مشتومڕ کردن لەسەر بە تایبەتی کردن, پێشخستنی تاك گەرایی و لیبرالیزم لە ولاتانی سۆڤیەتی پێشوودا, هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە.

دەوڵەتێکی وا خوڵقێنراوە کە کۆمەڵگا لەڕەوشێکدایە ناتوانێ هەناسە بکێشێ. لەم واتایەدا ئەوەی ئەنجامدراوە بە تەواوەتی گەڕانەوە نییە بۆ سەرمایەداری, وەلێ خۆی لەخۆیدا شێوەیەکی سەرمایەدارییە. بە پێی ئەمەش, زەبەلاحکردنی شێوەی دەوڵەت ڕێگا لەپێش ئەمە دەکاتەوە. هۆکاری هاتنە ئارای ئەم ڕەوشە بۆ ئەو چەمکە دەگەڕێتەوە کە سەرمایەداری دەوڵەتی, بە سۆسیالیست بوون دادەنا. بۆ ڕزگاربوون لەو ڕەوشە, پێویستە زیاتر گرنگی بدرێت بە تاك و لیبرالیزم و دیموکراسییەت زیاتر پێویست دەکات. هەڵبەتە ئەمەش بە واتای دەربازکردنی سەرمایەداری دەوڵەت دێت. ئەگەریش نا ئەوا ڕزگاربوون لە سەرمایەداری دەوڵەت بەدی نایەت. بێگومان دەکرێت سەرمایەداری تاکەکەس و تایبەت بەرەوی پێبدرێت, وەلێ گوتنی وەك: دەبێ هەموو شتێك بەو پێودانگە بێت, بە واتای شێواندنی ڕاستیەکان دێت. وێڕای ئەمەش ئەمجۆرە مشتومڕانە هێشتاش درێژەی هەیە. لەم لایەنەوە سەبارەت بە ئەزموونی سۆڤیەت گفتوگۆ کردن بە چڕوپڕی بەردەوامە. ئەو مۆدیلانەی لاسایی ئەویان کردۆتەوە, بۆ ئەوەی ڕێگا و هەنگاوی نوێ بدۆزنەوە, گفتوگۆ و چاوپێداخشاندنەوە ئەنجامدەدەن. بێگومان, کێشەکە تەنیا چاوپێداخشاندن, خۆ نوێ کردنەوەی ئەو سۆسیالیزمە پێکهاتووە نییە.

ئەو کێشانەی کە لەئەنجامی ناکۆکی سەرمایەداری ـــ ئیمپریالیستی بەسەر سەری مرۆڤایەتییەوە کەڵەکە بوون, بە هیچ جۆرێك لەکێشەکانی سەدەی 19 و سەرەتاکانی سەدەی بیستەم, کەمتر نین.

لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا مرۆڤایەتی لەهەرکاتێك زیاتر ڕووبەڕووی ئافاتەکان بۆتەوە. قۆناخی کۆمەڵایەتی وەها کەوتۆتە ڕۆژەڤەوە کە ناتوانرێت بخرێتە ژێر کۆنترۆڵەوە. بە تایبەت دەوروبەری ئابووری سەرمایەداری و کاولکاری بێ ئەندازەی سروشت, خەریکە کۆتایی بە دونیا بهێنێت. هەروەها بێ کۆنترۆڵی لە زێدەبوونی ژمارەی دانیشتوان, کۆمەڵگای بەڕەوشێك گەیاندووە کە جێگەی لەنێو دونیادا نەبێتەوە. هەروەها لەڕووی ئایدیۆلۆژی و مۆراڵدا مرۆڤایەتی لەنێو بێ ئومێدییەکی مەزن هێشتۆتەوە و ڕووبەڕووی شێوەپێدانێکی زۆر بێ واتای کردۆتەوە. لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ئایدۆلۆگەکانی سەرمایەداری سەبارەت بەم بابەتە هەڵسەنگاندن و شیکردنەوە پێشدەخەن. ئەمە بەم واتایە دێت کە:"سەرمایەداری ئایدیالیزمی لەمرۆڤایەتیدا نەهێشتووە. " بانگێشە و هیوای لەناوبردووە. کۆتایی هاتنی مێژوو؛ بە واتای لەناوچوونی بانگێشە و ئومێد دێت لە مرۆڤدا. ئەمەش یەکسانە بە سەرمایەداری.

ئیدی سەرمایەداری ئاسۆ و ئومێد نابەخشێ.

کەواتە لەم خاڵەدا چی پێویست دەکات؟ بێگومان ئایدیۆلۆژیایەك پێویست دەکات کە ئومێد بە مرۆڤایەتی ببەخشێت. ئەمەش بێ چەند و چوون ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزمە. بانگەشەی وەك کۆتایی هاتنی مێژووی من, کۆتایی هاتنی مرۆڤایەتییە. هەروەها نیشاندانی ئەوەی کە کۆتایی هاتنی مێژوو, کۆتایی هاتنی مێژووی مرۆڤایەتییە, تایبەتمەندی هەر ئایدیۆلۆژیایەکی بالادەست و دەسەلاتدارە. بۆ درێژکردنەوەی تەمەنی خۆی گوتنی " لەدوای منەوە هیچ شتێك نابێت " وەك پێویستییەك دەبینێ. ڕەوشی بەمجۆرەش لەهەر چاخێکی گرنگدا بینراوە. لەسەردەمێکدا ڕۆما خۆی وا نیشان دەدا کە وەکو سیستەم رووخانی بۆ نییە. هەروەها ئیمپراتۆرە فیودالییەکانیش بەهەمان شێوە بوون. گەلێك لە ئیمپراتۆرە سەرمایەداریەکاینش ـ لەوانە ئەمریکا ـ هەوڵدەدەن خۆیان بۆ مرۆڤایەتی وا نیشان بدەن, کە هەرشت بەوان کۆتایی دێت, وەلێ پێشکەوتن و پەرەسەندن, یاسایەکی سروشتییە. ناتوانرێ لەم ڕەوشەدا کۆتایی بە مرۆڤایەتی بهێنرێت. چونکە گەردوون سەرەوژێر نابێت و مرۆڤایەتیش رووبەڕووی نەخۆشی و رووخانێکی زۆر جددی نەبۆتەوە. ئەو کێشانەی کە هەن ئایدیۆلۆژی, سیاسی, کۆمەڵایەتی و ئابوورین. بێگومان ڕێگە چارەسەریەکانیش لەچوارچێوەی ئایدیۆلۆژی, سیاسی, کۆمەڵایەتی, ئابووری, کولتووری و مۆراڵ, مەیسەر دەبێت. لێرەدا ئەم هەڵوێست و ڕەفتارانە بەکاریگەر دەبن کە خۆیان لەهەمووان زیاتر گرێدراوی چارەنووسی مرۆڤایەتی ببینن و پێوەی خەریك ببن و بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی مرۆڤایەتی خۆیان بە خاوەن ئەرك و بەرپرسیار بزانن؛ لێرەدا بە کۆمەڵایەتی بوون و سۆسیالیزم, نزیکبوونی ئایدیۆلۆژیانەی تا دوارادە زانستییانەیە کە پێویستە ببێتە بەبانگێشەترین هەڵوێست.

لەسەر ئەم بنەمایەش سۆسیالیزم دەتوانێت سەر لەنوێ خۆی فۆرمیلە بکات.

بەڕاستی, لەرۆژگاری ئەمڕۆشماندا سەرمایەداری شتێکی زێدەی نییە کە بیبەخشێت. بۆ نموونە, ئەگەر سەیری میکانیزمەکانی بازاڕی سەربەست بکەین, بەگشتی توێژێکی مشەخۆری دروست کردووە کە پشت بە "فائز" دەبەستێ. سەرمایەدارەکان پێش چەند سەدەیەك لەبواری بازرگانی و بەرهەم هێنانیدا خۆیان خەریك دەکرد. هەرچی ئێستاکەیە بەرهەم, بازرگانی و تەکنیك خراوەتە لایەکەوە و لەسەر بنەمای بازاڕی ڕۆژانە و سوو دەژین.

ئەمەش بەهیچ جۆرێك پەیوەندی بە بەرهەمەوە نییە. سەرمایەداری بەم ئەندازەیە بێ واتا بووە. لەتەواوی دەوڵەتە سەرەکییە, مەزنەکانی سەرمایەداری ئەم شێوە بازاڕ و گەمەی بۆرسانە زاڵن. ئەمەش بە واتای سەرکەوتنی تەواوی سەرمایەداری نایەت, بەڵکو ئەوە ڕەوشی بێ واتابوون و مایەپووچی ئەو نیشان دەدات. ئاخۆ دەکرێ لەرێگای گەمە بۆرسەییەکانەوە بە

کوێ بگات؟ ئەمە شێوەیەکی " قومارە " کە لە یەکێك وەری دەگرێت و دەیدات بەوی تر. بەردەوام ئەم دەست و ئەو دەست دەکات. ئەمەش کت و مت قومارکردنە.

کەواتە لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا سەرمایەداری بە تەواوەتی بۆتە گەمەی قومار.

پێویست ناکات هیچ پێناسەیەکی نوێ بۆ سەرمایەداری بکرێت. لەرۆژگاری ئەمڕۆشماندا سیستەمی قوماربازی، زۆر بە باشی گوزارشت لەسەرمایەداری دەکات. کە واتە لەم حاڵەدا، ئەم قومارە مەزنە، لەسەر مرۆڤایەتی پەیرەو دەکرێت. ئەم ترلیۆنانە لەسەر مرۆڤایەتییەوە خولدەخوات. ئەم ترلیۆنانە بۆ دونیا و مرۆڤایەتی ئافاتێکە و؛ هۆکاری سەرەکی تەواوی خراپەکارییەکانە. نەدیتنی ئەم راستییە، یاخود بیسنین و گوێ نەدان پێی یاخود بەرەنگارنەبوونەوەی، یەکسانە بە سووتاندنی مرۆڤایەتی، سووتانێك زۆر ترسناکتر لە شێوەی سووتانی " نیرۆن " ئەگەر بڕیار بێت مرۆڤایەتی بێ هیوا نەکرێت و هەروەها بڕوا و باوەڕی بە بانگێشە و هیوای مرۆڤایەتی هەبێت، ئەوا بێگومان دەبێ توانای پێویست بۆ خولقاندنی ئەم هیوا و بانگێشەیە لەپێناو رووخاندنی سیستەمی قومار لە ئارادا بێت. هەروەها پێویستە نەك تەنیا هەڵاتن لەم کارە نەیەتە ئاراوە، بەڵکو دەبێ ئەمە لەڕێگای تێکۆشانێکی خاوەن بانگێشەی مەزن و بەجۆش و خرۆشێکی گەورەوە، بڵند بکرێ.

**"ئەمریکا هەم دزە و هەم بەهێزە"**

لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا، تەنیا ناوێك کە بەبزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان لەسەرووی هەموانەوە بە بزووتنەوەکەمانەوە دەلکێنرێت، تیرۆریزمێکە کە بەشێوەیەکی گەلێك سەیر و سەمەرە رەنگ دەداتەوە هەروەك بڵێی مەزنترین هەڕەشە بێت.

بە تایبەت ئایدیۆلۆگ و سیاسەتمەدارانی ئەمریکا دادەنیشن، دەڵێن تیرۆریزم، هەڵدەسن دەڵێن تیرۆریزم. هەوڵدەدەن هەموو شتێك بەم دەستەواژەیەوە روون بکەنەوە. لەڕاستیدا پێویست دەکات هەرە زێدە خۆیان بەو دەستەواژەیەوە ـ تیرۆریزم ـ هەڵبسەنگێنن.

دەشێ بگوترێ تیرۆریستی هەرە مەزن، هێزە سیاسی و ئابوورییەکانی ئەمریکایە و ئەمەش لەجێگای خۆیدایە.

چونکە ئەو دەستەیەی کە هەرە زێدە بەلایە لەسەر مرۆڤایەتی و مەترسیدارترین گەمە پەیڕەو دەکات، تەنانەت ئەو فشار و ئەشکەنجانەی کە بە بێ بەزەیی ترین شێوە پەیرەوی کردووە، تیرۆریستی بۆرسا و سیاسییە. چونکە لە دەستیاندا چەکی وێرانکاری و کاولکاری ترسناك هەیە و هەموو رۆژێکیش وەکو هەڕەشە و فشار بەکاری دەهێنن. ناوە ناوەش لەبەرامبەر گەلان بەکاری دەهێنن و بەشێوەیەکی ترسناك تیرۆریزم پەیرەو دەکەن. تاڕادەیەك لەنموونەی دزی سامناك دەچێت، واتە هەم دەچەوسێنێتەوە، هەم خۆشی بە مافدار

نیشان دەدات. هەم ماڵ و سامانی مرۆڤایەتی دەڕوتێنێتەوە و, هەم ئەوانەی کە خاوەنداریێتی لە مرۆڤایەتی دەکەن بە تاوانبار نیشان دەدەن.

بە تایبەت ئێستا بە پێداگرتنەوە, سەپاندن و تاوانباریکردنی PKK بەوەی کە " لەدونیادا مەترسیدارترین رێکخستنی تیرۆریستییە " زیاتر دەرکی پێدەکەین. ئەم گوتنە لەلایەن ئەمریکاوە خۆی لەخۆیدا گوزارشت لە راستییەك دەکات, ئەویش ئەوەیە کە لەنێو خێزانی مرۆڤایەتیدا پارتیمان بە پابەندبوونی بە مرۆڤایەتییەوە مەزنترین بایەخ و گرنگی نیشان دەدات. ئەمریکا وەکو نموونەی دزی بێبەزەیی دەیەوێت تاوانەکەی بخاتە پاڵ ئێمە و بەمجۆرەش رووی راستەقینەی خۆی پەردەپۆش بکات. ئەم تاکتیکە لەهەر قۆناخێکی مێژووییدا پەیرەو کراوە و بەکار هێنراوە.

ئەگەر " رۆما " بە بیری خۆمان بهێنینەوە, ئەوا بەراستی یەکەمین مەسیحییەکانی ئەو قۆناخە نوێنەرایەتی چەوساوەکان و ستەم لێکراوەکان دەکرد. " نیرۆن " خۆی لەخۆیدا سەرشێتێکە و رۆمای سووتاند؛ مەسیحییە هەژارەکانی سووتاند و هەموویانی دەرخواردی شێر دا. لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دەتوانین ئەم نموونەیە لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بەراورد بکەین؛ ئەوانە نەك تەنیا "رۆما" بەڵکو تەواوی دونیا و لەم نێوەندەشدا وڵاتەکەمان, تەنانەت نەك هەر تورکیا, بەڵکو گەلێك وڵاتی دیکەش دەسووتێنن. کێ دونیای سووتاند؟ ئایا " تیرۆری PKK " ئەمەی کردووە؟ هەروەها ئەمریکا لەم پێناوەشدا بە پشت بەستن بە هێزی مەزنی راگەیاندن ـ بڵاوکردنەوە هەوڵدەدات بڵێت کە " تیرۆریستەکان ئێرە و ئەوێیان سووتاند " بە شێوەیەکی زۆر زێدەڕۆییانە لەتوانایاندا هەیە چالاکییەکان بە شێواندنەوە بۆ مەرامی خۆیان بەکار بهێنن.

بەڵێ؛ " نیرۆن " لەپێناو رۆما مەسیحییەکانی تاوانبار کرد. کەچی ئەمانە هەموو رۆژێ لەهەموو جێگەیەك بە تاوانبارکردنی تەواوی مرۆڤەکان و مرۆڤایەتی هەوڵ دەدەن مەزنترین جوڵانەوەی سووتاندن کە ئەنجامی دەدەن پەردەپۆش بکەن و لەسەر ئەم بنەمایەش تەمەنی خۆیان درێژە پێ بدەن. ئەم خاڵە زۆر گرنگە. هەربۆیە پێویست دەکات لەسەر ئەم بنەمایە دەست بە هێرشێکی ئایدیۆلۆژی مەزن بکرێت. پارتیمان کەم تا زۆر بۆ ئەنجامدانی ئەمە دەرکەوتۆتە مەیدان. لەم واتایەشدا ئایدیۆلۆگەکانی ئەمریکا و تۆڕەکانی سیخوڕی و هێزە سیاسییەکانی, لەدەستنیشان کردنی ئەم راستییانە هۆشمەندن.

لەکاتێکدا سۆسیالیزمی بونیانراو لەنێو هەڵە و چەوتییەکانیدا نەیتوانی هەنگاوێك بهاوێت, PKK لەسەرووی هەموو ئەو رێکخراوەنەوە دەهات کە لەسەر هەنگاونان خاوەن بڕیار و رشت بوو. ئەمە و بەردەوام بوونی چالاکییەکانی بە شێوەیەکی خوڵقکارانە و

ئاستەنگ نانەوەی PKK لەبەرامبەر ئەو سیستەمەی ئەمریکا دەیخواست بە لایەنی کەمەوە لەرۆژهەلاتی ناوین پێشی بخات؛ بەس بوو بۆ ئەوەی کە ئەمریکا هار بێت.

زۆر سەیرە؟ دەرکەوتنی حەزرەتی عیساش لە سەر ئەم خاکانە بوو

ئەوسا رۆما بەسەر سەرتاپای دونیادا زاڵ و دەسەلاتدار بوو. حەزرەتی عیسا لەگەڵ گروپێکی بچووکی حەواری کە ژمارەی پەنجەکانی هەر دوو دەستی تێنەدەپەڕاند، بە چالاکییەکانی لەقودس و دەوروبەری، ئەو زوڵم و ستەمە مەزنەی دەرخستۆتە روو. بێگومان هەموومان دەزانین کە رۆما لەبەرامبەر ئەو جوڵانەوەیەدا سزادانێکی مەزنی ئەنجامداوە، حەزرەتی عیسای لەچوارمێخ داوە و ئەوانەی لەدوای ئەویشەوە مانەوە لە گۆڕەپانی "ئارەنا" دا دەرخواردی شێری داوە. ئاخۆ رۆما کە تا ئەو رادەیە بەهێز بوو، پێویستی بە پەیڕەوکردنی رەفتارێکی بەمجۆرە هەبوو؟ بەڵێ. هەر جموجوڵێك کە کەلێنی بخستایە نێو سیستەمی رۆما، ئەوا رووبەڕووی سزای مەزن دەبۆوە. لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا گەلێك نموونەی هاوشێوەی ئەمە هەیە. بۆچی؟ بۆچی ئێمە بەو ئەندازەیە بۆ ئەمریکا مایەی مەترسین؟ ئیمپراتۆریەتی ئەمریکا زۆر بەباشی "مەسەلەی کون و کەلەبەرەکان " دەزانێت.

هەربۆیە دەیزانی کە لینینیزمیش لە ئەلْقەی لاوازی قۆناخی ئیمپریالیزم، جوڵانەوەی کردنەوەی کون و کەلەبەرێك بوو.

لەڕۆژگاری ئەمرۆشماندا دەوترێ کە PKK لە ئەلْقەی هەرە لاوازی ئیمپریالیزم کەلەبەرێکی ئاقڵمەندییانە بۆ مرۆڤ دەکاتەوە و لەم کەلەبەرەشدا توانستی ئەوەی هەیە جیهانبینی و شێوازی ژیانێکی مەترسیدار دەربخاتە روو. هەربۆیە بەو ئەزموونەی کە لەمێژوودا بەدەستی خستووە، چەندەی بتوانێ هێرش دەکات.

بۆ نموونە ئەمریکا، رژێمی هەرە بەربەرییە کە مێژوو ناسیبێتی، لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا سەفەربەرییەکانی نکوڵی و قڕکردنی رژێمی زۆر فاشیستی وەکو تورکیا بەس نابینێ، تەنانەت تووڕە دەبێت و دەڵێ:" بۆچی لە زووەوە نەتانتوانی لە ناوی ببەن؟" وڵاتە ئیمپریالیستیە ورد و گەورەکانی دیکەش تا دەتوانن یارمەتی تورکیا دەدەن و پێی دەڵێن:" بۆچی ناتوانیت رێ لەم تیرۆریزمە بگریت؟" ئەم دژایەتی کردنەیەشیان سەرچاوەی خۆی، لە سەرنەکەوتنەوە دەگرێت. بۆ ماوەی دە ساڵ زیاتر بە تەواوی هێز و توانایانەوە بە نهێنی یارمەتی تورکیایان دا. ئەمەش دەزانین کە لە هەموو بوارێکەوە یارمەتی هەموو هێرشەکانی تورکیایان بۆ سەر ئێمە داوە، وەلێ چیدی ناشاردرێتەوە و هەموو گەلانی جیهان بینییان کە ئەمە داگیرکاری و زۆردارییەکە و هەروەها لە کوێوە هێرش دەکەن و کێ یارمەتییان دەدات؟ بۆ ئەوەی لە بەرامبەر گەلەکانیانەوە نەکەونە ژێر بارێکی زۆر و زەحمەتیەوە، بە ڕواڵەتیش بێت دەڵێن:" ئێمە لە دژی ئەو ئۆپەراسیۆنانەین".

وەلێ ئەمریکا کە خۆی بە تواناترین هێز دەزانێت, بێ ئەوەی کە شەرم بکات دەیتوانی بڵێ:" ئێمە پاڵپشتی تورکیا دەکەین ". ئەگەر لە شەرمانیشەوە بێت, ئێستا دەڵێن:"ئیدی بەسە, ئوپەراسیۆنەکان بەرەودواوە بکشێننەوە". هۆکاری ئەم وتەیەش دەگەڕێتەوە بۆ سەرنەکەوتنیان. جگە لەمەش تا دەچێت راستینەی ئەوان ئاشکرا دەبێت و مەترسی مەزن دەبێت. هەروەکو فۆناخی رۆما, مەسیحییەت تا دەچێت رەگ و ریشەی سەقامگیر دەبێت. سەرەڕای ئەو هەموو توانست و ( گەورەییەیان),(مەبەست ئەمریکایە ـ چارەسەری) تا دواڕادە تەنگەتاو دەبن و تا دواڕادەش سەر شێت و هار دەبن. لێرەدا فەرمانڕەوایی "نیرۆن" بە سەر تەواوی ڕۆمادا و ئیمپراتۆربوونی ئەو, بە هیچ جۆرێك بە هێز بوونی "نیرۆن" پیشان نادات و, چۆنییەتی دەرئەنجامەکەشی دەزانرێت.

ئەمڕۆکە رەوشی هێزی سەرکردەی ئیمپریالیستی بەمجۆرەیە.

گرنگترین هاوکاری ئەمریکا, وەکو والی قودس لە رۆژهەڵاتی ناویندا, هەروەها والیەکەی لە ئەنادۆڵیشدا, لە رەوشێکی دژواردان. هەرچەندە شێتیش دەبێ با ببێ, بەڵام ناتوانێ زۆر بەرەوپێشەوە بچێت. بۆیە لە ئەنجامدا دەتوانێ بە PKK بڵێت: "رێکخستنێکی تیرۆریستی هەرە مەزن". وتەی:" نابێ هیچ دەوڵەت یاخود مرۆڤێکی جیهانیش یارمەتی PKK بدات" بەرهەمی ئەم تایبەتمەندییە مێژووییەیە.

به لەبەرچاوگرتنی مێژوویەکی وەها بێ بەها, ئەم بانگەشەیەی ئەمریکا, دەرکی پێدەکرێت. بێگومان ئەو والییە لە ئەنادۆڵدایە, بە شێوەیەکی تەنگ و بچووك بیر دەکاتەوە, رەنگە بتەوێت خراپکارییەکی زۆر بکات و, ئەو دەرئەنجامە نیگەتیڤانەی کە خولقاندوویەتی نەبینێت. رەخنەکانی ئەورووپاش لە سەر ئەم بنەمایەیە. وەکو دەزانرێت سەقامگیربوونی PKK لە گۆشەییەکی وەها سەرەکی جیهاندا, لە راستیدا تەنیا بەرهەمی تایبەتمەندی بزووتنەوەیەکی رزگاریخوازی نەتەوەیی رەها نییە, هەروەها دەرئەنجامی ئەوەش نییە کە رێکخستنێکی توندوتیژی ناوچەیی, یاخود رێکخستنێکی سوسیالیستیشە. بەڵکو لەبەرئەوەیە کە سیستەمی ئیمپریالیستی هەنووکە دەرکی بەوە کردووە کە لە شوێنی هەرە خراپییەوە درزی تێکەوتووە و بە گوێرەی ئەوانیش ئەمە رەوشی نموونەیەکی هەرە خراپە.

**"لەتورکیادا باڵی چەپ, کەمالیزمە"**

PKK بزووتنەوەیەکی مرۆڤایەتییە, بێگومان پێشکەوتنی بزووتنەوەکەشمان تا رادەیەك لە گەڵ ئەمەدا گونجاوە. بە هیچ شێوەیەك ناکرێ گفتوگۆی لە سەر بکرێت. هەر لە سەرەتاوە بە ئایدیا سۆسیالیستییەکان پابەندبووە و لەم لایەنەوە خاوەن بانگێشەیە, واتای زانستی ئەوەش, بە هەموو رەهەندەکانیەوە بەهەند وەردەگرێت. لەم واتایەدا بزوتنەوەکەمان لە هەوڵی ئەوەدایە کە بە تەواوی ببێتە بزووتنەوەیەك کە خاوەن تایبەتمەندێتی رەنج بێت.

زیاتر لە 25 ساڵە بە تایبەت لە بەرامبەر راستی سۆسیالیزمی بونیادنراودا کە لە دواچارەکی سەدەدا نەیتوانی زێدەتر هەنگاو بنێت و رووی لە هەڵوەشانەوە کرد. جوڵانەوەی PKKیە کە لە ریزی پێشەوەدا جێگای خۆی دەگرێت و هەنگاو دەنێت. ئەمە خاڵێکی گرنگە. جیاوازبوونی PKKش لەم خاڵەدایە.

بەراستیش سۆسیالیزمی بونیادنراو کە ئیدی لە توانایدا نەبوو هەنگاو بنێت, ئەو سۆسیالیزمە بوو کە PKK هەر لە سەرەتاوە رەخنەی لێگرتووە. PKK بە دەوڵەت بوونی زێدەڕۆییانەی سۆسیالیزمی بونیادنراو و هەروەها لکاندنی هەموو پارتییە سۆسیالیست ــ کۆمۆنیستەکانی جیهان بە سیاسەتی دەرەوەی خۆیەوە, وەکو نزیکبوونێکی پەسند نەکراو دەبینێ. لەم رووەوە, لایەنە خراپەکانی بینی.

بە تایبەت لە راستی TKP (پارتی کۆمۆنیستی تورکیا) و راستی چەپی تورکیادا ــ کە ئەوانە هەموویان کەوتبوونە ژێر کاریگەری سۆسیالیزمی بونیادنراو ـ هێرشێکی بەرفراوانیان کردە سەر پارتیمان. PKKش لەبەرامبەر ئەو هێرشانە تێکۆشانێکی چڕوپڕی بەرێوەبرد. لەم واتایەدا سالانی 70 ـ80, سالانی تێکۆشان لە دژی کاریگەرییە خراپەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو و چەپی دەوڵەتگەرا بوو. لە تورکیادا ئەمە بە شێوەی چەپی کەمالیزم خۆی نواندووە.

تا ئێستا ئەم تایبەتمەندییەی تێنەپەڕاندووە. ئەمەش بە شێوەیەکی زۆر روون و ئاشکرا دەبینرێ. ئەمەش لە تورکیادا بۆتە هۆی دروستبوونی سۆسیال ـ شۆڤێنیزم و میللیگەرایی و دەوڵەتگەرایی زێدەڕۆییانە. هەروەها ئەمە سیاسەتی نکۆڵی و قڕکردنە کە لەسەر راستینەی کورد پەیڕەو دەکرێ و, پیشاندانی رەزامەندییە بۆ لەناوبردنی ئەو. لەلایەکی دیکەشەوە بە هەمان ئەندازە هەر لە سەرەتای قۆناخی رزگاریەوە پەیوەندی بە کەمالیزمەوە هەبوو. بووە یارمەتیدەری هەرە مەزنی کەمالیزم, هەتا لە قۆناخی هەڵوەشانەوەشدا, ئەم راستینەیە کاریگەرییەکی گەردوونی هەبوو.

ئێمە هێرشمان کردە سەر ئەم راستینەیە. ئەم چەوتییە سەرەکییەی سۆسیالیزمی بونیادنراو شان بە شانی قۆناخ پێشکەوت, هەڵبەتە لە سالانی 1925دا ئەمە بینرا. لە ئەنتەرناسیۆنالی کۆمۆنیستدا, نزیکبوون لە کەمالیزم بە شێوەی TKP وەك سۆسیال ــ شۆڤێنیزم و هەروەها ناسازی ئەو لە گەڵ گەوهەری سۆسیالیزم دا بینرا. لنینیستەکان هەردەم بە شێوەیەکی تاکتیکیانە سەیری کەمالیزمیان دەکرد. وەلێ پاشان ئەم نزیکبوونە تەنیا تاکتیکییانە نەما, بەڵکو کاتێ ئاشکرا بوو, بینرا کە بە تەواوی ئەمە نزیکبوونێکی سیاسییانەیە و لە هەر رەوشێکدا پەیڕەوی لێدەکرێت؛ رۆژانەیی و بەردەوامکراوە و, لە ئەنجامدا ئەم نزیکبوونە بووە یەکێك لە سەرەکیترین خاڵی هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزم.

خودی کەمالیزمیش لەم واتایانەدا سیستەمێکە کە بە ڕێژەیەکی هەرە مەزن لە سۆسیالیزمی بونیادنراو کەڵکی وەرگرتووە.

چەپی تورکیاش شۆڤێنیست ترین چەپە، هەر بۆیە باڵی چەپ هیچ شتێکی بە زەحمەتکێشانی تورکیا نەبەخشیوە. ئاشکرایە بە هەمان ئەندازەی کەمالیزم دوژمنی گەلە و چەپەکەشی بە گوێرەی ناوەڕۆکی سۆسیال ـ شۆڤێنی خۆی بە هەمان ئەندازە دوژمنی گەل دەبێت. لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا ئەم راستییە بە شێوەییەك دەرکەوتۆتە ڕوو کە تەنانەت ئایدیۆلۆژیە ئایینیەکانیش دەتوانن لە سەر زەحمەتکێشان کاریگەری دروستبکەن و ببنە هیوای ئەوان. ئەوانەی دەڵێن:"چەپی هەرە رادیکاڵم" لە تواناییاندا نییە هێندەی تۆزقاڵێکیش لە جیهانی زەحمەتکێشاندا بە کاریگەر بن. بێ توانایی چەپ لە هەڵسەنگاندن و دەرخستنە رووی هۆکارەکانی ئەمەدا، گەلێك جێی سەرەنج و تێڕامانە.

بێگومان ئێمە لە دەرك کردنی ئەم راستییەدا زۆری و زەحمەتیمان نەدەکێشا. بە هەمان رادەی تێگەیشتن، تێکۆشانێکی بە کاریگەریشمان بەڕێوە برد و، بەم شێوەیە PKKمان کردە PKK. دەتوانرێ بگوترێ لایەنی هەرە بە هێز و پۆزەتیفی PKK لە بواری ئایدیۆلۆژیاوە، بریتییە لە: رەخنەکردنی گونجاو و تێپەڕاندنی ئەو هەڵانەی لە ئەنجامی نزیکبوونەوە لە سۆسیالیزی بونیادنراو و کەمالیزمەوە دەرکەوتبوون، ئەمانە هەم لە پرنسیپ و هەم لە پراکتیکدا ئەنجامدرا. لەبەرئەوەی توانیمان لە نێوان ساڵەکانی 70-80 دا ئەم کارە بە شێوەیەکی زۆر بە هێز ئەنجامبدەین، توانیمان گەوهەری بەدیهێنانی قۆناخەکانی دوای ئەویش بخوڵقێنین. ئەگەر وەکو گروپە چەپەکانی دیکەمان بکردایە، بێگومان نەماندەتوانی لە دوای 1980وە قەڵەمبازێك ئەنجام بدەین. گروپەکانی دیکە نەك لەبەر لاوازبوونیان، بەڵکو لەبەرئەوەی نەیانتوانی لە بواری ئایدیۆلۆژیاوە پێگەی چەپ ـ کەمالیست تێپەڕێنن، نەیانتوانی پێشکەوتنێك تۆمار بکەن و لەگەڵ زەحمەتکێشان ببنەیەك.

رەنگە زەحمەتکێشان لەڕەوشێکدا بن کە نالەبارتر بێ لەڕەوشی ئاژەڵ. هیچ گەلێکی زەحمەتکێش لە جیهاندا بەڕادەی گەلی زەحمەتکێشی تورکیا دووچاری کەوتن و داڕووخان نەبووە و هیچ کام لە گەلان و زەحمەتکێشانی ئەفریقا و ئاسیا و ئەمریکای لاتین بە ئەندازەی گەلی تورکیا بێ کەرامەت ناژین یاخود ژیانێکی بەمجۆرەیان بەسەردا ناسەپێنرێ. بەتایبەت ئەوانەی لە رەوشێکی وەهادان کە بە ناوی گەلی تورکیا بیر بکەنەوە، پێویستە ئەم بێکەرامەتییە بە هەموو رەهەندەکانیەوە، دەرك پێبکەن و ئەگەر بکرێت چارەسەریەکی بۆ بدۆزنەوە. لە هیچ شوێنێك نەبینراوە کە گەلێکی زەحمەتکێش بکەوێتە رەوشێکی وەها نالەبارەوە. بۆچی دووچاری ئەم کەوتنە بوو؟

پێویستە ئەم رەوشە بە تەواوی لە راستی کۆماری تورکیا و تەنانەت راستی داگیرکەری و باڵادەستی تورك ببینرێت. تا ئەو کاتەی ئەمە ئەنجام نەدرێت، ئەوا ناتوانرێ ئەو گوشار و داگیرکارییەی کە لە رەهەندە لەرزۆکەکانی ئەمرۆدا سەرچاوە دەگرێت، لەنێو ببرێت.

هەروەکو خۆیان دەڵێن، لەجیهاندا ئەو زەحمەتکێشانەی بە ئاسانترین شێوە بەڕێوەدەبرێن، لە تورکیادان. ئەوانەی بە ئاسانترین شێوە دەچەوسێنرێنەوە لە تورکیادان. رەنگە گەلێکی زەحمەتکێش، دوور لە کەرامەت بهێڵرێتەوە و، نەفرەتی لێبکرێت، بەڵام تا ئەم رادەیەش نابێت.

ئێمە بۆ گەلی کوردستانیش هەڵسەنگاندنێکی هاوشێوەمان کرد. رەوشی ئێمە (لە گەلی تورکیا) دێرینتر و قووڵترە. پێناسەی "گەلی نەفرەت لێکراو" لە جێگای خۆیدا بوو. چونکە رازیبوون بە چەوسانەوە و سەرکوتکردن تا ئەو رادەیە بە ئاسانی، گوزارشت لە نەفرەتلێکراوترین رەوش دەکات. ئێمە لە بەر ئەوەی بەرخۆدانێکمان نواند، ئەم نەفرەتلێکراوییەمان تێکشکاندو بەم شێوەیە رەوشی سەربڵندبوون دەستەبەر دەکرێت. لەتورکیادا ئەمە نییە. لەم بارەوە رەوشی تورکیا زۆر نالەبارترە.

تا دوارادە ئاسۆی زەحمەتکێشان تاریك و تەسك کراوە، هەربۆیە چالاکییەکانی زەحمەتکێشان زۆر بێ کاریگەرن. زەحمەتکێشانی تورکیا لە هەر رووییەکەوە بێ چالاکین، بێ کەسایەتین، بێ ئامانجن و بێ بانگەشە و بگرە بێ چارەشن. هەربۆیە پاشماوەی هەرشتێ پەسند دەکەن، کەچی ئەویشی پێ رەوا نابینرێت. هەموو رۆژێ ئەوانە ( واتە دەوڵەتی تورکیا ــ چارەسەری ) لە ئاماری خۆیاندا ئەوە نیشان دەدەن کە، چۆنیەتی ژیان بەسەربردنی زەحمەتکێشان، خۆی لەخۆیدا تا رادەیەك لە موعجیزە دەچێت. لەم واتایەدا ئەمرۆ بیرکردنەوە لەسەر راستینەی گەلی تورك، گوزارشت لە رەوشێکی زۆر گەردوونی دەکات. لێرەدا بۆچی گەل و چینێکی رەنجدەر و زەحمەتکێش کەوتە نێو ئەم رەوشەوە و دووچاری ئەم رەوشە کران؟ چۆن تا ئەم رادەیە لەنێو ئەم رەوشەدا دەتوانێ گێنگڵ بخوات؛ ئەگەر ئەمە پەسند ناکات، ئەی بۆچی بەرەنگاری نابێتەوە؟ تا بڵێی لەنێو تەنیاییەکدا قەتیس ماوە. ئەمە راستییەکە و دەبێ رۆشنبیر و، گەر هەشبێ سۆسیالیست و کۆمەڵ ناسانی تورکیا، بیری لێ بکەنەوە.

دەتوانین بڵێین ئێمە کەم تا زۆر لەم رەوشە تێدەگەین. بە تایبەت لەگەڵ هەڵسەنگاندن و شرۆڤەکردنی راستینەی گەلەکەی خۆمان، تا رادەیەکی زۆر راستینەی گەلی تورکیشمان شیکردۆتەوە. هەر بۆیە خۆی لەخۆیدا راستینەی ئەوەی کە شۆڕشەکەمان لایەنی ئەنتەرناسیۆنالیزمی هەیە، بە هەموو لایەنەکانییەوە دەردەکەوێتە مەیدان.

بەڵێ؛ هەر لەبەر ئەمەیە کە دەڵێن:" لە دونیادا PKK مەترسیدارترین رێکخراوی تیرۆریستی نێودەوڵەتییە..."

لەبەر ئەوەی تێکڕای هێزە بچووک ـ مەزن، ئیمپریالیست ـ سەرمایەدارەکان، بەو راستییە گەیشتوون کە PKK هەڕەشە لەو تورکیایە دەکات کە زۆر پێویستییان پێیەتی، هەر لەبەر ئەمەشە بە هەموو جۆرێك پشتیوانی و هاوکاری تورکیا دەکەن. چونکە لە مەیداندا راستینەیەکی هەرە بێ واتای گەلێك هەیە. هەروەها نموونەی وەك PKKش هەیە، کە راستینەی گەلی کوردیش دەرباز دەکات، ئەمەش بە واتای ئەوە دێت کە مەترسی و هەڕەشە گەلێك مەزن بووە.

کەواتە، لە شوێنێکدا کە هێندە فشار و چەوساندنەوە، بێ واتا و چرووپڕ بووە، ئەوا هەوڵدان بۆ ئازادکردنی گەلێك لەمیانەی ئەو رەوشەدا، دەکرێ لەگەڵ خۆیدا هەڕەشە و مەترسی بەو رادەیە بهێنێت.

لێرەشدا زۆر بە روون و ئاشکرایی تێڕوانینی ئێمە بۆ شۆڕشی تورکیا دەردەکەوێتە روو. واتە شۆڕشی کوردستان تا ئەم رادەیە شۆڕشی تورکیاشی خوڵقاندووە، لەهەمانکاتدا، لە گۆڕەپانی نێودەوڵەتیشدا رۆڵێکی بەرچاو دەگێڕێ. لەم واتایەدا نەك تەنیا سەبارەت بە سۆسیالیزم بەڵکو بە پەلە بڵاوکردنەوە و گواستنەوەی ئومێد، ئاسۆی نوێ و خوڵقاندنی رێ و شێوازی نوێ، بۆ تورکیا و رەنگدانەوەی لە خۆرهەڵاتی ناوین، ئەمانە بۆ هێزە شەڕانگێز، کۆلۆنیال و سەرکوتکەرەکان بە واتای مەترسی و هەڕەشەیەکی مەزن دێت. ئەمە هەم زۆر رۆژانەییە و هەم سەرئێشەیەکی وەهایە، مسۆگەر دەبێ چارەسەر بکرێت!

ئەو راستییەش لەم کێماڵەی دوایی باشووری کوردستاندا بەڕوون و ئاشکرایی دەرکەوتەڕوو، ئەگەرچی لە کێومالی ساڵی 1992 شدا بە روون و ئاشکرایی دەرکەوتبووە روو، وەلێ ئەم کێوماڵەی دوایی، PKK ی بە تەواوی دونیا ناساند. هەربۆیە ناوە ناوە ئەمریکا راپۆرت بڵاو دەکاتەوە. لێرەدا گوتنی وەك " PKK تیرۆریست ترین رێکخراوە " شتێکی بێ بنەما نییە. ناوزەدکردنی PKK بە رێکخراوێکی تیرۆریست و نیشاندانی بە شێوەیەکی زۆر چەواشەکارانە و جیاواز، بۆ ئەوەیە کە لەسەر ئاستی دونیادا کاریگەری PKK نەهێڵرێ. ئەمەش راستییەکی حاشاهەڵنەگرە.

پێویستە لەبیر نەکەین کە بڵاوبوونەوە و تەشەنەکردنی PKK لە باشووری کوردستان و، پەلوپۆ هاوێشتنی لە نێو گەلێك وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوین، جا ئەمە چ بە شێوەی پێکدادان بێت، یاخود لەڕێی پەیوەندییەکی واتادار، ئەمە پێشکەوتنێکی گرنگ و بە بایەخە. PKK لە بەدەستخستنی ئەنجام لەڕووی پراکتیکی و سیاسیدا، تا دواڕادە کارامەیە. PKK لە لایەنی ئاسۆ، ئایدیۆلۆژی، رێکخستنی و سیاسەتی پێکهێنانی لەڕووی پراکتیکیدا، هەمووکاتێ لە

توانایدا هەیە گۆڕەپانێك تێكبدات و لەهەر گۆڕەپانێكیشدا دەتوانێ سیستەمی پراكتیكی خۆی دابمەزرێنێ. ئەمەش بۆ ئیمپریالیزم هەرەگەم، هێندەی شۆڕشی ئۆكتۆبەر و وەكو سەرەتای گەلێك شۆڕش لە مێژوودا، پێشكەوتنێكی جددییە. هەر لەبەر ئەمەشە لای ئەوان دەبێت بەرۆژی حەشر. هۆكاری هاوكاری و پشتیوانی كردنی توركیا تا ئەم رادەیە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە. بێگومان ئەگەر شۆڕشگێڕە خاوەن بانگێشەكان، بە ئەندازەی بانگێشەكانیان تێبكۆشن، ئەوا بە ئاسانی بۆیان دەكرێ سەركەوتن بەدەست بهێنن. ئێمەش لەنێو رەوشێكی بەمجۆرەداین.

بێگومان ئەم رەوشە بۆ PKK گوزارشت لە سەرەتایەك دەكات. چونكە هێشتا PKK دوورە لەوەی لەلایەنی سیاسیدا بە سەركەوتن گەیشتبێت. هەروەها دوورە لەوەی ئەو شیكردنەوە گەوهەرییانەی ئەنجامی دەدات، بە تەواوی بە مرۆڤی بسەلمێنێ و پێی هەرس بكات. با مرۆڤایەتی بخەینە لاوە، هێشتا لەنێو گەلەكەشیدا (واتە گەلی كورد ــ چارەسەری ) بە تەواوەتی بلاو نەكراوەتەوە و سنووردار ماوە. تەنانەت بلاوكردنەوەی لەنێو گەلی كوردیش بخەینە لاوە، هێشتا لەنێو ریزەكانیشماندا ئەوانەی كە بانگێشەی ئەوە دەكەن كە میلیتانی PKKن، هەموو رۆژێ گفتوگۆ لەسەر ئەوە دەكەن كە ئەم هەڵسەنگاندنانە تا چ رادەیەك بلاو كراوەتەوە.

ئێمە هێزێكی مەزنی هەڵسەنگاندنمان دەرخستەڕوو.

بە تایبەت پێویستە دەرك بەوە بكرێت كە پێداویستی چۆنێتی بەدەست گرتنی مرۆڤی نوێ، بە واتای شێوەگرتنی مرۆڤێكی زۆر جیاواز، دێت. وەلێ ئەمە هێشتا زۆر سنووردارە لەوەی كە لەرێكخستندا زاڵ بكرێت، لەنێو گەلدا زاڵ بكرێت و وەكو سیستەمێك دەربازی نێو مرۆڤایەتی بكرێت. كەواتە شتی هەرە گرنگ گەیشتنە ئاسۆ و توانست و هێزی هەڵسەنگاندنە. ئەمەش نیشاندرا. هێشتا لەم بابەتەدا پارتیمان ئەگەرچی نوێش بێت، وەلێ تا دواڕادە خاوەن بڕیارە و تا دەچێت درێژە بە بانگێشەی پێشخستنی خۆی دەدات. لە هەمانكاتدا ئەمە لایەنە لاواز و كەم و كورتی و هەل و دەرفەتەكان دەردەخاتە مەیدان. چونكە هەر جولانەوەیەك لە قۆناخی سەرەتایی خۆیدا رووبەڕووی مەترسی و هەڕەشەكان دەبێتەوە. بێگومان كاتێ بەرپرسیارانی كۆماری توركیا قیامەت دەنێنەوە، بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە. دەڵێن:" ئەگەر ئەمرۆ رێگا لە پێش ئەمە نەگرین، ئەوا دەبێتە هەڕەشە لە سەر سەری هەمووتان، تەنانەت تیرۆریزمی PKK كێشەیەكی گەردوونییە، بۆ چارەسەركردنی كێشەی گەردوونیش، هەموو هێزە شەڕەنگێزەكانی دونیا ناچارن هاوكاری من بكەن و لەم میانەشدا من رۆڵێكی نێودەوڵەتی مێژوویی دەگێرم ". بەرپرسیارانی سەرەكی ئەم شەڕە بە تایبەت دەڵێن: بۆ جاری یەكەمە دەتەوێن ئێمە ببینە خاوەن سەركەوتنێكی بەمجۆرە. سەیرە! دەیانەوێ لە

کەسایەتی PKK دا نەك تەنیا مەسەلەی میللی, بەڵکو مەسەلەی تیرۆریزمی دونیاش چارەسەر بکەن. ئەوان دەبنە نموونەی دونیا, دەبنە پێشەنگ! لێدوان لەسەر لێدوان رادەگەیەنن و هەرخۆشیان ئەمانە دەڵێن:" ئێمە شەڕێکی وەها بەڕێوە دەبەین کە گونجاو و کۆکە لەگەڵ بەرژەوەندی تەواوی سیستەمەکان, بۆیە دەبێ هەموو لایەك بێ قەید و شەرت هاوکاری و پشتیوانی ئێمە بکەن !" بەمجۆرە بێ ئەوەی پەی بە راستی ببەن ئاماژە بەمانە دەکەن. بەڵێ هەروەکو چۆن ئەم " تیرۆرە " رووی راستەقینەی تیرۆریزمی ئەوانی ئاشکرا کردووە, ئەوا بۆ گەلانیش پێداویستی توانستی ئاسۆ, ئامانج و بەرخۆدانی دەرخستۆتە مەیدان. لەم واتایەشدا ئەگەر پێداگری بکرێت و تا رادەیەك تێکۆشانی شۆڕشگێڕانە دەربازی نێو گەلان, بە تایبەت گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین بکرێت, کە لەڕاستیدا تا رادەیەك ئەنجامیش دراوە, ئەوا دەرئەنجام بەراستی قۆناخێکی گرنگی شۆڕش دێتە کایەوە.

**یۆتۆپیای سۆسیالیستی دەبێتە بنەما بۆ سەرکەوتن, هیوا و بانگێشە.**

دەکرێ PKK ببێتە نموونەی پارتییەکی باش بە تایبەت ببێتە پارتێکی سۆسیالیست, ببێتە وەڵام بۆ روونکردنەوەی گفتوگۆکانی قۆناخ و گفتوگۆ سۆسیالیستیەکان. تا دەچێت PKK ئەم تایبەتمەندییەی خۆی پێشدەخات. جگە لەوەی توانستی ئەوە هەیە لە پراکتیکی سیاسییانەدا بەسەرکەوتن بگات. لەم واتایەدا ئەگەر ناکۆکییەکانی رۆژهەڵاتی ناوین, هەرچەندە چریش بوونەتەوە, بهێنێتە بەرچاوی خۆی, ئەوا دەتوانێ لەبواری چارەسەرکردندا ببێتە خاوەن بانگەشە و تا دوارادە پێشکەوتنێکی مەزن تۆمار بکات.

کەواتە PKK دەتوانێ هەم بۆ سۆسیالیزم, هەم لەبواری سیاسی و دیموکراتیزەکردنی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین و بۆ پێشکەوتنێکی بەمجۆرە پێشەنگایەتی بکات و بەهای مێژوویی زیاتر دەربخاتە مەیدان. ئایا ئەمە پێویست دەکات؟

بەڵێ؛ تادوارادە پێویست بەوە دەکات. بە تایبەت بۆ گفتوگۆی سۆسیالیستییانەی رۆژگاری ئەمڕۆمان ئەمە پێویست دەکات. بانگێشەیەکی سۆسیالیستیانەی بەمجۆرە وەك ئاسۆیەك, وەك هیوایەك لەبەرامبەر وێرانکارییە مەزنەکانی چەوسێنەر, کۆلۆنیالەکان و سەرمایەداری, زۆر پێویست دەکات. هەروەها لەڕووی پێشکەوتنێکی سیاسییانە بۆ گەلانی خۆرهەڵاتی ناوینیش زۆر پێویستە. ئەم گەلانە تا دوارادە پێویستییان بە دیموکراسی و رزگاربوون هەیە. بە تایبەت لەبەرامبەر " بەکرێگیراوەکانی " ئیمپریالیزم. PKK بە شێوەیەکی گرنگ هاوکاری و یارمەتی ئەمەش دەکات.

کەواتە PKK لەڕووی پراکتیکی ـ سیاسیشدا زۆر پێویستە. هەم وەکو ئاسۆ و هیوایەك دەیەوێت روویەکی راست و واتادار بە مرۆڤایەتی ببەخشێت, هەم لەبەر ئەوەی گەلانی ناوچەکە زیاتر هەست بە رزگاربوونیان لە بەکرێگیراوان و, پێداویستی رزگاری دیموکراسییانە

دەکەن، بۆ ئەوەی ئەو گەلانە، کە خاوەن شارستانیەتێکی مێژوویی سەدان ساڵە و تەنانەت هەزاران ساڵەن، جارێکی دیکە بە شێوەیەکی بەسوود دەربکەونە سەر شانۆی مێژوو، PKK تا دوارادە بۆ ئەمانە پێویستە. لەبەر ئەم دوو هۆکارەیە کە هەڵوێستەکردن لەسەر PKK هەم دەبێتە ئەرکێکی پیرۆزی وڵاتپارێزی هەم دەبێتە ئەرکێکی ئەنتەرناسیۆنالی. PKK وێڕای تەواوی کەم و کورتی و هێرشەکانی دەرەوە و ناوەوە، لەم بابەتەدا لە پێهەڵگرتنی پراکتیکی و بانگەشەکانیدا دەستەمۆ نەبووە و پاشەکشەی پێنەکراوە.

ئێمە تێدەکۆشین کە ئەمە بە تەواوەتی بە سەرکەوتن بگەیەنین. ئەمرۆ لەپێناوی سەرکەوتنێکی یەکجارەکیانە بە شێوەیەکی چڕوپڕ هەڵوەستە لەسەر تاکتیکە سیاسی و سەربازییەکان دەکەین و پێویست بەمانەش هەیە.

وەلێ پێویستە لە بیر نەکرێت کە لە بنەمادا PKK جوڵانەوەی بەدی هێنەری ئاسۆی مرۆڤایەتی و بە هێزکردنی هیوا و ئامانجەکانیەتی. بە تایبەت PKK هێزێکە کە هەوڵدەدات ئەو رەوشە پێچەوانە بکاتەوە کە ئەو پارتانە تێی کەوتوون و، سۆسیالیزمی بونیادنراو ئاسۆیانی رەش کردووە، بێ ئاسۆ ماون، هەروەها لە بانگێشەی سۆسیالیستیدا دوور کەوتوونەتەوە. بێگومان هۆکاری هەرە سەرەکی ئەم هەڵوەشانەوە و، سەر نەکەوتنە، یاخود خۆ نوێ نەکردنەوەیە، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە. لەم واتایەدا ئەگەر ئاسۆ نەبێت و بانگێشە کۆتایی پێ بێت و مۆراڵیش لەنێو بچێت، ئەگەر ئەم سیستەمە، سیستەمی دونیاش بێت، ئەوا مەحکومی هەڵوەشاندنەوەیە. ئەوەی کە رووشیدا ئەمە بوو.

هەربۆیە ئەگەر ئەمرۆ PKK لەلایەن گەلێك کەسەوە بێ واتاش بێت، ئەوا بە بەردەوامی زیندوو راگرتنی ئاسۆ و هیوای خۆی و بەرفراوانکردنی ئەوە زۆر گرنگە و ئەمەش بەردەوامی پێدەدرێت.

پێویستە تایبەتمەندی هەرە سەرەکی PKK تا دوایی بەمجۆرە درێژەی پێبدات. ئەگەر هەندێ نموونە سەبارەت بەمە بهێنینەوە، ئەوا رەنگە ئەم مەسەلەیە روونتر بێتەوە، ئەمرۆ ئێرانیش ئەگەر وێڕای هەموو رەخنەیەك، تا رادەیەك بە شێوەیەکی راست و دروست بەڕێوە بچێ، ئەوا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، چونکە لە ئێراندا هێزێکی مەعنەوی لە ئارادایە. لەم بارەیەوە هەندێ دەڵێن:" مەلاکان " هەندێکیش دەڵێن:" ئایەتوڵڵا " هەیە. ئەمە چییە؟ ئەمە هێزێکی بانگێشە، ئاسۆ و مۆراڵە. ئەمە زۆر پێویست دەکات. ئەگەر رژێمێك بتەوێت درێژە بە تەمەنی خۆی بدات، ئەوا ناچارە هەمیشە گرنگی بەو هێزە مەعنەوی و مۆراڵییە بدات.

رۆڵی رێبەرایەتی و پێشەنگی بە ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیستی درا.

لەبەر ئەوەی ئەمە بەلاوە نرا، بۆیە سیستەمی سۆسیالیزمی بونیادنراو هەڵوەشایەوە.

هەر بۆیە ئەمڕۆ یۆتۆپیای سۆسیالیستی و بەهێزکردنی بانگێشە و مۆراڵ، بنەمایەکە بۆ سەرکەوتن. لەم بابەتەدا گرووپێك مرۆڤ کە لە لایەنی چەندایەتی و چۆنایەتیدا پێشەنگایەتی بۆ ئەم کارانە دەکەن، هەروەها لە پێناو مۆراڵ، بانگێشە و هیوا دەژین و بیر لە پێداویستی ئەمە دەکەنەوە و هەردەم لەرۆحدا بەرەو پێشەوە دەچێت. واتە هەم دەژین و هەم ژیان دەدەن. دەکرێ تاڕادەیەك بەمە بگوترێت سەرۆکایەتی ئایدیۆلۆژی. لەبەر ئەمەشە کە بێگومان پەیوەندی بە زانست، خەیاڵ و مەعنەویات هەیە و پەیوەندی بە مادیەتیش هەیە و تەواوی ئەمانە هاوسەنگ دەکات. واتە کۆمەڵگا بە شێوەیەکی راست و دروست و زیندوو، چی پێویست بکات نوێنەرایەتی ئەوانە دەکات و، بە درێژایی مێژووش بەمجۆرە بووە.

ئەگەر سۆسیالیزم بتەوێت خۆی نوێ بکاتەوە ئەوا مسۆگەر ناچارە. دەزگایەکی بەمجۆرە پێشبخات و سەقامگیر بکات.

وەکو چۆن لە قۆناخێکدا پێویستی بە شێخ و دەروێشەکان هەبوو، ئەوا بۆ سۆسیالیزمیش بە گوێرەی خۆی پێویستی بە شێخ و دەروێش و پیرەکان هەیە.

ئەمە بۆ ئەوە ئاماژە پێدەکەم تاوەکو ببێتە نموونە. وەلێ بێگومان ئەمە بەس نییە. هەروەها پێویست بە سیاسەتی پراکتیکی ئەوەش هەیە و ناچارە کە سیاسەت و تاکتیکیش بەرەوپێشەوە ببات.

لەڕاستیدا لەم رووەوە PKK لەنێو پێشکەوتن دایە. تەنیا بە بەرجەستەکردنی ئاستی بڵندی ئایدیۆلۆژی مۆراڵی ئەندامانی خۆی و بە بنەماگرتنی ئەمە، سنووردار نامێنێ، بە جۆرێك ئێمە ئەمەمان بە تێکۆشانێکی مەزن بەڕێوە برد، بەڵکو لە هەمانکاتدا بە شێوەیەك هەڵوەستە لەسەر تاکتیکە رۆژانەییەکان دەکەین، کە رەنگە لە هیچ پارتییەکی دیکەدا نموونەی نەبینرابێ و نەبووبێتە نەسیبیان.

ئەمڕۆ تەواوی تاکتیکەکانی رێکخستن و خۆپیشاندان تەنانەت تاکتیکەکانی شەڕیش بەشێکن لەو تێکۆشانەی کە هەرە زێدە چڕمان کردوونەتەوە و دەتوانین بەم تێکۆشانەش بڵێین خەباتی سیاسی هەنووکەیی. وەکو لەهەڵسەنگاندنەکانی پێشووتردا ئاماژەمان پێکردووە، تاکتیکە سەربازییەکانیش بریتین لەتاکتیکە سیاسیەکان؛ شێوازێکی بەڕێوەبردنی سیاسەتە بەشێوەی توند وتیژی، شەڕی تایبەت رێگا بەسیاسەتێکی دیکە نادات کەبەڕێوە ببرێت. لەم پێناوەشدا توندوتیژییەکی بێ بەزەییانە پەیڕەو دەکات. هەربۆیە ناچارین لایەنی توندوتیژی لەتاکتیکی سیاسیدا، لایەنی شەڕی گەریلایی لەتاکتیکی سەربازیدا پەرەپێبدەین. ئێمە لەهەڵپەی ئەنجامدانی ئەوەین. لەم بابەتەشدا پێویستە بێ ئەوەی پێوانەکان پشت گوێ بخرێت، ئەوا لەبەرامبەر ئەو رەوشەی کە شەڕی تایبەت سەپاندوویەتی هەروەها لەپێناو سەرکەوتن ناکرێ دەستبەرداری لەپێشخستنی تاکتیکە سیاسییەکان بکرێت.

لەم بابەتەدا کەموکورتی گرنگ لەئارادان. بێگومان لەبەرئەوەی گەلێك پارتی و ڕێکخراو ئەمەیان ئەنجام نەدا، لەتورکیادا بێ ڕۆڵ و بێکاریگەر بوون. لەبەرئەوەی ئێمەش تاکتیکەکانمان لەئان و ساتی خۆیدا پەرە پێدا و هەروەها لەبەر ئەوەی لەم بابەتەدا ئێمەش لەبەرامبەر شەڕی تایبەت بێ تاکتیك نەماین، بۆیە پێشکەوتین و گەشەمان کرد. واتە نەك تەنیا لەڕووی سەروەری ئایدیۆلۆژیا ـ مۆراڵ کە بۆسەرکەوتنی ئەمە بەتەنیا تێر ناکات ـ بۆیە خەباتی ڕێکخستنی پراکتیکی هەنووکەیی، چالاکی ڕاست و دروست و چالاکییە سەربازییەکانمان پێشخست، بۆیە ئەمڕۆ PKK بۆتە خاوەن بانگەشە و شکست ناناسێ، ئەگەر بەپێی ئەم تاکتیکە ڕاستانە پێداگری بکات ئەوا مسۆگەر ڕێگە لەبەردەم گەیشتن بەسەرکەوتن دەکرێتەوە.

هۆکاری سەرەکی دەنگدانەوەی PKK بەم ئەندازەیە وەك جولانەوەیەکی ڕەنجدەران هەم لەئاستی نەتەوەیی و هەم لەئاستی نێونەتەوەییدا، دەگەڕێتەوە بۆ وەڵامدانەوەیەکی باشی کێشەکانی قۆناخی هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو. لەئاستی گەردونیدا و، دووچاری ئەو جۆرە نەخۆشییانە بووە. بەردەوامکردنی پێشخستنی خوڵقکاری خۆی، هەروەها بێ تاکتیك نەمانی لەسیاسەت و نیشاندانی بەرخۆدان لەهەر گۆڕەپانێك لەزیندان و چیا و دەرەوە و ناوەوەی وڵات، PKK ی گەیاندووە بەجولانەوەیەکی سەرەکی وەها، کە ئیمپریالیزم هەرە زێدە لێی دەترسێت و ناتوانێ چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە.

بێگومان لەم واتایەدا ناچارە کە وەك جولانەوە و پارتییەکی ڕەنجدەران گرنگی خۆی بپارێزێ. ئەمە تەنیا بەسەرکەوتنەوە ئەنجامگیر دەبێت.

چونکە تەنیا تاکە هێزێکی شەڕی تایبەت، واتە تەنیا هێرشە دڕندانەکەی فاشیستەکانی تورك لەبەرامبەر PKK بەڕێوە ناچێ. پێویستە هێرشی تەواوی هێزە کۆنەپەرستە نێودەوڵەتیەکان لەپشت ئەمەوە ببینرێ. هەربۆیە دەبێ PKK لەبواری ئاسۆ بینی، ئامانج و، ورەدا خۆی بەهێز بکات، لەبواری پراکیتکیشدا قاڵ بێتەوە. دەبێ ئەو گۆڕانکاری و پێشکەوتنانەی کە لەئارادان و گەیاندوویەتە سەرکەوتن، نەك وەك دوا ئەنجام بیانبینێ بەڵکو؛ پێویستە وەکو سەرەتایەك بیانبینێ و تۆکمەیان بکات. لەم چوارچێوەیەشدا شیکردنەوەی سەبارەت بە میللیتان بایەخێکی مەزنی هەیە. لەڕاستیدا ئەو شیکردنەوانەی کە لەم دواییەدا لەنێو ڕێکخراوەکەماندا پێشمان خست بۆ سەرکەوتنی PKK پێویستیەکی ژیانییە.

زۆر ڕاشکاوانە ئەوەمان خستەڕوو، ئەو کەسایەتییەی دەتەوێن شیبکەینەوە، ئەو تاکەیە کە تادواڕادە کاریگەری سیستەمی لەسەرە و بە شێوەیەکی بەڤێز هەلگری پاشماوەی چاخەکانی پێشووە، خۆی لەخۆیدا ئەندامێکی شەڕی تایبەتە، هەروەها ئاماژەشمان بەوە کرد کە

شیکردنەوەی ئەمە و بەلاوەنانی ئەو مەترسییە راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، سەرچاوەی خۆیان لەمانەوە وەردەگرن، ئەمەش تایبەتمەندییەکی سەرەکییە، کە PKK ی کردووە بە PKK ، لەڕاستیدا پیادەکردنی تێکۆشانێکی بەمجۆرە لەناو رێکخستندا؛ دەستنیشانکردنی تاکی نەخۆش و بەلاوەنانی، گوزارشت لەناوەڕۆکی سەرکەوتنەکەی دەکات.

زۆر بەڕوونی ئەوە ئاشکرا بوو تاج رادەیەك بڵێی " من بۆ تێکۆشان هەم"چەندە فێر بووبێ، هەر تاکێك، تەنانەت هەر میلیتان و جۆرە رێبەرێك، بەتێر وتەسەلی خۆی شینەکردبێتەوە، ئەوا لەوە رزگاری نابێت و، وەکو ئەندامێکی موحافەزەکار خۆی دەسەپێنێ. بێگومان هەڵوەشانەوەی ئەو پارتییانەی پێشەنگایەتی سۆسیالیزمی بونیادنراویان دەکرد، لێرەوە دەست پێدەکات. کاتێك موحافەزەکاری و بیروکراسییەت لەناو مەکتەبی سیاسی و ناوەندیدا پێشکەوت، ئەوا دوای ئەوە شەپۆل شەپۆل لەنێو تەواوی کۆمەڵگا و دەوڵەتدا بلاو بووەوە. بەمجۆرەش رەوشی ئەنجام نەدانی قەڵەمباز و هەڵوەشانەوە پێشکەوت، لەنێو PKK شدا بەهەزاران قات مەترسی ئەمە هەیە.

ئەو کەسایەتییەی نێو PKK زۆر لەو کەسایەتییەی وڵاتانی سۆسیالیزمی بونیادنراو نەخۆشترە.

کەسایەتییەکە رزیوە، پێنج فلس ناهێنێت سێیەمین دەستی (فۆتۆکۆپی) سەرمایەدارییە. واتە کەسایەتییەکە کەمالیزم کاری تێکردووە، لەهەمانکاتدا کەسایەتیەکە کە پاشڤەڕۆیەتی شێوازەکانی کۆیلایەتی چاخەکانی پێشوو، بنەماڵەگەرایی و تاکگەرایی خۆی پێدا کێشاوە. لەپراکتیکی خۆماندا روون بۆتەوە کە ئەم کەسایەتییە تێری خراپکردنی (10) شۆڕش دەکات.

شیکردنەوەکان لەئاستێکی بەرزدا ئەمەی نیشاندا. هەموو کەسێك لەنێو پارتیماندا ئەوە زۆر بەباشی دەزانێ کە ئەگەر ئەم کەسایەتیە تێپەڕ نەکرابایە، نەك تەنیا PKK بەم ساڵانە ( 1995) نەدەگەیشت، بەڵکو تەنانەت نەماندەتوانی بگەینە ساڵی 1985. تەنانەت ساڵی 1975 یش نەدەهاتە ئاراوە. تێکۆشان بەرامبەر ئەمجۆرە کەسایەتییە لەهەمانکاتدا گوزارشت لەپێشکەوتنێکی گەوهەری پارتی سۆسیالیستی دەکات. نابێ تێکۆشانی چینایەتی تەنیا لەنێو زەمینەی بابەتی ـ جەستەیی چین یاخود گەل بەڕێوە ببردرێت، بەڵکو مەرجێکە لەنێو رێکخراوەکەشدا. واتە لەنێو مێشکیشدا پەیڕەو بکرێ. پێویستە ئەم تێکۆشانە لەناو دەمارە هەرە هەستیارەکان و دڵ و جگەریشدا پەیڕەو بکرێت. ئەگەر بخوازرێت لەتێکۆشانی چینایەتیشدا سەرکەوتنی تەواو بەدەست بهێنرێ، ئەوا پێویست دەکات بەرامبەر بەدیموکراتییەت و موحافەزەکاری تێکۆشانی ناوخۆیی بکرێت و تێکۆشانی نەفسی بەچڕی پیادە بکرێت.

هەرچەندە هەندێ لەبیریاران ئاماژەیان بەوە کردبێت کە لەقۆناخی سۆسیالیستیشدا تێکۆشانی چینایەتی ناوەستێت، ئەمە بەشێوەیەکی گشتی بوو و لەمیانەی هەندێ وتەی سادە و کورتەوە هەڵسینگێراوە.

لینین باسی ئەمە دەکات؛ دەڵێ کە لەسۆسیالیزمدا وردە بۆرژوا و وردە کاڵا بەوروژم لە ئەنجامی بەرهەمهێناندا دێنە ئاراوە، ئەمەش بەردوام هەڕەشە لەسیستەمی سۆسیالیستی دەکات. بەڵام وتەکە هەر ئەوەندەیە. نەبۆ خۆی توانیویەتی ئەمە ببینێ کە چۆن لەناو پارتیدا پیادە دەکرێت ـ تەمەنی تێری نەکردووە ـ دوای ئەویش پێش نەخراوە. ستالین هەڵگری چەمکێکی تێکۆشانی قەبەی چینایەتی بوو.؟ هەندێ لەمرۆڤە لەپێشینەکان بەشێو ەیەکی زێدەڕۆییش بێت، ئاماژەیان پێکردووە ئەوانیش خۆیان شاردۆتەوە، ئەوانەی خۆشیان نەشاردۆتەوە بەشێوەیەکی قەبە لەنێو براون. ئەنجام، ئەم هەڵوێستە ژێرکەوتنێکی گەورەی لێکەوتەوە.

"ماو"یش هەڵسەنگاندنی هاوشێوەی ئەمەی کردووە، هەرچەندە تاکو ئێستا "چی"ن لەسەر پێیان مابێتەوە، بەڵام دوورە لەوەی لەهەمووو لایەنێکەوە تێکۆشانی چینایەتی پێشخستبێ، گۆڕانکاری هاوشێوەی ئەزموونی سۆڤیەت لە "چین"یشدا چڕە. بەڵام ئەگەر تێکۆشانی چینایەتی چڕ بکەنەوە دەشێ ئەوان نەکەونە نێو هەمان نەخۆشی پارتەکانی سۆڤیەت، هەروەها بەتایبەتیش ئەمە جێی گفتوگۆکردنە تا چ رادەیەکی ئەرکەکانی خۆی سەبارەت بە بابەتەکانی دیموکراسی سۆسیالیستی و ئەنتەرناسیۆنالیزم جێبەجێ کردووە. ئەگەر تاوەکو ئێستا لەسەر پێیان مابنەوە، ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە تاڕادەیەك گرێدراوی پرەنسیپی تێکۆشانە. هەڵبەتە ئێمە نەك لەقۆناخی ئاواکردنی دەوڵەت، بەڵکو لەقۆناخێکی زوودا هەستمان بەوە کرد. ئەم هەست پێکردنەش تەنیا بەشێوەی هەڵوێست و رووبەڕوو بوونەوەی ئەم لادانانەی راست و چەپ نییە لەناوپارتیدا. هەرچەندە ئەوەمان پشتگوێ نەخستبێت و بەرامبەر بەنزیکبوونە قەبە راست و چەپەکان و نوێنەرەکانیان تێکۆشانی پێویستمان ئەنجام دابێت، دواتر بەتایبەت لە رۆژگاری ئەمڕماندا زۆر بەئاشکرایی دەرکەوت کە ئەمە تێری نەکردووە.

تەنیا تێکۆشان بەرامبەر لەڕێ لادانی چەپ و راست تێر ناکات. زۆر فاکتەری قووڵتر هەن لەڕێ لادان بە ڕاست و چەپ بەخێو دەکات. تەماشامان کرد و بینیمان تەنانەت ئەو کەسایەتییەی رۆڵی رێبەریش دەبینێ رۆژانە تێکۆشانێك لەنێو خۆیدا نەکات، ئەگەر میلیتانێك بەئەندازەی پەروەردەکردن و ورەبەخشین بەبنگە، پراکتیکێکی پێویست نیشان نەدات، ئەوا لەڕێ لادان دێتە ئاراوە، هەربۆیە کاتێك تەماشای تەواوی قۆناخی هەنگاوە تاکتیکییەکانی PKK دەکەین دەبینین، کە چەقبەستن و بنەبەستبوونی چەند کەسێك،

ژێرکەوتن و زیانی مەزن لەگەڵ خۆیدا دێنێ. سەرباری ئەو تێکۆشانە مەزنەی کە پیادە دەکەین، کاتێك رەوش بەمجۆرە بێت ئەو واتایە دەبەخشێ کە مەترسی مەزنە. ئەوکاتە چارەسەری چییە. چارە ئەوەیە؛ لەئاستی ورەو ئەخلاقی و لەئاستی سیاسی ـ پراکتیکی لەنێو پارتیدا هێزی شیکردنەوە و چارەسەری پێویست بەدەست بهێنرێت و بەبێ پچڕان بەشێوەیەکی چڕوپڕ لەم پێناوەدا تێکۆشان بکرێت.

لەبەر ئەوەی لەم ساڵانەی دوایی تا ڕادەیەك PKK ئەمەی پەیڕەو کرد، بۆیە نەتوانرا رێگا لە پێشکەوتنی بگیردرێت. هەر لەبەر ئەمەشە دەڵێن:" PKK رێکخراوی هەرە تیرۆریستییە" سەرباری ئەوە تەواوی مۆدێلی رێکخراوەکانی دیکە تێپەڕ کران، بەڵام تێپەڕنەکردنی PKK لەمیانەی ئەم شێوازە لایەنی تایبەت و رەسەنایەتییەکەی نیشان دەدات. هەروەها سەرباری تەواوی هێزی شیکردنەوەی دەوڵەتی تورکیا، تەنانەت گروپێکی کوردی چەپ نەما کە شینەکردبێتەوە، هەرچی PKK بوو بەپێچەوانەوە، سەرباری ئەو شەڕە تایبەتە مەزن و قورسە، کاریگەری خۆی زیاتر کرد. ئەمەش بۆ تۆکمەیی هێزی شیکردنەوەی PKK دەگەڕێتەوە، لەم چوارچێوەیەشدا لەبەرئەوەی PKK لەئەزموونی سۆسیالیزم و پارتی سۆسیالیستیشدا واتە لەمێشکی ئەماندا بەچڕی و لەئاستێکی بەرزدا تێکۆشانی چینایەتی بەڕێوە بردووە، دەتوانرێت بگوترێ کە لەمێژووی پارتە سۆسیالیستەکاندا پێشکەوتن و گەشەکردن و دەسکەوتێکە.

لەڕۆژگاری ئەمڕۆمان پارتییەك بخوازێ گەوهەری سۆسیالیستی خۆی بپارێزێ، هەروەها ئەگەر بخوازێ تەنیا لەبواری سیاسی پراکتیکی سەرکەوتوو نەبێت، بەڵکو لەبواری باڵابوونی ئەخلاق و ورە خۆی بەڕێوە ببات، ناچارە تاڕادەیەك وەك PKK بێت.

**"مۆدێلی کۆنی جیهان بۆ مرۆڤایەتی کراسێکی تەسکە"**

بەڵێ مەگەر گەردوونی بوونی PKK بەمجۆرە پێناسە بکرێت. لەوانەیە بەگوێرەی داخوازیمان هێشتا بەتەواوەتی فۆرمیلەمان نەکردبێت، بەڵام تەواوی پێشهاتەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە لەمە بەدواوە ئەم گەوهەرەی PKK دەبێتە ناچارییەك بۆ ئەو رێکخراوانەی داخوازی سەرکەوتنیان هەیە، بەتایبەتیش رێکخراوە سۆسیالستیەکان. بەجۆرێکی دیکە ناتوانرێ وەڵامی کێشە قورسەکانی مرۆڤایەتی بدرێتەوە بەتایبەتیش وەڵامی ئەرکە سیاسی و ئەخلاقیەکان بدرێتەوە کە پێویستیان بەچۆنایەتی هەوڵێکی زۆر هەیە، بەڵێ هەربۆیە تەواوی پارتە سیاسیەکانی تورکیا بنبەست بوون و تێپەرکراون و ژێرکەوتن. هەربۆیە لەتەواوی جیهان، لەئەڵمانیا و فەرەنسا و تەنانەت ئینگلتەراش تەواوی پارتییەکان بەڕاستڕەو چەپڕەوەکانیەوە، هەموویان کۆن بوون و تێپەڕکران، تەنانەت باس لەوە دەکرێت کە کەس پێیانەوە خەریك و پەیوەندیدار نابێ.

راستە تەواوی پارتە کلاسیکییە راست رەو چەرپڕەوەکان تێپەڕ دەکرێن. تەنانەت بەخۆیان دەڵێن :" گوێ پێنەدانی گەل گەشە دەستێنێ" پارتێکی نوێ، تەنانەت وەڵامدانەوەیەکی سنووردارێش، رەنو ئاسا پشتگیری گەل مەزن دەکات. تەنانەت لەتورکیا جوڵانەوەیەکی نوێی دیموکراسی بۆرژوازی تورك و لیبرال لەتورکیا لەئارادایە. هەوڵ دەدات بدرەوشێتەوە، تاڕادەیەکش بەدی دێت. بۆچی؟ لەبەر ئەوەی تەواوی پارتە راستڕەو و چەپڕەوەکان لەخاڵێکدا بەرەو موحافەزەکاری چوون، ئەمە بەو جۆرەیە و لەجیهانیشدا رەوش هەروایە. تەنانەت ئەمە ئەو گەردەلولانەی گۆڕانکاری نوێیە کە دەیانەوێ پێشکەشی بکەن. تەنانەت باس لەوە دەکرێت پێویستە چەمکی دەوڵەتی مۆدێلی کۆن تێپەڕ بکرێت، ئەمرۆ تاڕادەیەکی مەزن دەوڵەتگەرایی پێشدەخرێت. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پارتە کۆنەکانی راستڕەو چەپ رەو، تەواوی رژێمەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو سەرمایەداری لیبرال کە لەدەوڵەتدا گوزارشتیان لێ دەکرێت، ئیتر بۆ مرۆڤایەتی کراسێکی تەسکە. ئیتر تەواوی دەوڵەتەکان بۆ کۆمەڵگاکان کراسێکی تەسکن و ناچارن بدڕێنرێن. بێگومان چارەسەری نادۆزرێتەوە؛ تادەچێ تەنگەتاوی مەزن دەبێت، کەواتە ناکۆکی سەرەکی رۆژگاری ئەمڕۆمان تێپەڕکردنی ئەو دەوڵەتانەیە کە کراسێکی زرۆپۆشاکی بەسەر مرۆڤایەتی پۆشیوە، تێپەڕکردنی پارتە راستڕەو و چەپڕەوەکانە کە کۆڵەکەی پێکدێنن. مرۆڤایەتی پێویستی بەمە هەیە. گەلێك نیشانە ئاماژە بەوە دەکەن کە مسۆگەر بەم قۆناخە گەیشتووین. لەم چوارچێوەیەشدا سەدەی بیست و یەکەم لەلایەکەوە واتای تێپەڕکردنی ئەم جۆرە کەسایەتییانەیە. تەنیا باس لەتێپەڕکردنی دیکتاتۆریەتی چینایەتی ناکەین. سۆسیالیزمی بونیادنراو دەبێت، یاخود سەرمایەداری لیبراڵ، سەرمایەداری دەوڵەت دەبێت یا هەر ناوێکی هەبێت، ئیتر ئەم مۆدێلانەی کە لەئاردایە کۆسپی مەزنن لەپێش مرۆڤایەتی. تەواو لەو خاڵەدا، پێویستە سەرلەنوێ تیۆری کۆتایی هاتن و کوژانەوەی دەوڵەت و سۆسیالیزم روون بکەینەوە. لەم لایەنەدا پێویست دەکات ئەمجۆرە دەوڵەتانە کزبن و تێپەڕ بکرێن. سەبارەت بەم بابەتە سۆسیالیزم دەتوانێ ببێت بەخاوەن گوتە و بانگەشە.

لەم حاڵەتەدا، تیۆری دەوڵەت لە سۆسیالیزم دا دەتوانرێت بەشێوەیەکی دەرەوشاوە، هەم درێژەی پێبدرێت و هەم راست بوونەکەی بسەلمێنرێت. ئیتر دەرك بەوە دەکرێت دامەزراندنی سۆسیالیزم دامەزراندنی دەوڵەتێك نییە، بەڵکو ئەرکی ئەوەیە بەشێوەیەکی زۆر بنچینەیی دەوڵەت بەلاوە بنێت. سۆسیالیزم لەیەکەم هەنگاویدا ئەمەی نەبینی، یاخود ئەگەر دەرکیشی پێبکرێت، ئەوا پێداویستیەکانی جێبەجێ نەکردووە. لەم قۆناخە نوێ یەدا، مسۆگەر ناچارە کە هەم رەوشی بەلاوەنانی دەوڵەتەکان ببینێ و پێداویستی ئەمە نیشان بدات و هەم بێ سێ و دوو کردن گۆڕانکاری بەسەردا بهێنێت. ئەگەر ئەمە ئەنجام بدرێت، ئەوا ئاشکرایە کە

سۆسیالیزم دەبێتە هێزی هەرە بەبانگەشەی ئایدیۆلۆژی، مۆراڵ و سیاسەت. بێگومان دەبێ ڕەنگدانەوەی بەرجەستەی ئەمە لەنێو بەشێکی زۆری کۆمەڵگادا و بوارەکانی پەروەردە کردن و تەندروستی و پێگەیاندن، مەیسەر بکرێت. بەتایبەت دەبێ ڕەنگدانەوەی ئەمە لەژینگەشدا ببێت.

قاڵبوونەوەی سۆسیالیزم لەسەر ئەم کێشانە، دەست لێبەرنەدراوە. وەلێ وەکو شۆڕشێکی سیاسی دەبینرێ کە کەم تا زۆر پێویست بەبەلاوەنانی ئەم دەوڵەتانە هەیە و هەروەها ئەوەش دەبینرێ کە ئەو ریفۆرمانەی لەشوێنی ئەوانەدا هێناوییەتی، هیچ کامیان بەتەنیا تێر ناکەن.

دیارە کە گەلێك پارتی نوێ ئاوا دەبن؛ وەکو پارتە ریفورمیست و کەسکەکان. ئەم پارتیانە تاوەکو ئەو سیستەمە دەوڵەتیانەی کە هەن دەرباز نەکەن، ئەوا هیچ کاتێك ناتوانن بگەن بەقەوارەیەکی راست و دروست بۆ ئامانجە دەستنیشانکراوەکانیان و هەروەها ناشتوانن ڕێگە لەپێش وێرانکارییەکان بگرن. هەروەها ناشتوانن ڕێگا لەپێش لاوازبوونی ورەی نێو کۆمەڵگا و کوژانەوەی هیواکانی ژیان بگرن. لەم واتایەدا ئەزموونەکان و تاقیکردنەوەکانی ریفۆرمیزم لەڕۆژی ئەمڕۆماندا ناتوانن زۆر سەرکەوتوو بن.

بەفراوان بوونی تیۆری سۆسیالیزم بەم ئەندازەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشە مەزنەکان پێویستییەکی دەست لێبەرنەدراوە. ئەگەر وەکو پارتی ریفۆرمیستەکانی دواییەکانی سەدەی 19، کە ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزم و ریفۆرمیان بەبنەما دەگرت، بگوترێت کە " ریفۆرمەکان پێویستن و بەلاوەنانی ئەم سیستەمە بەشێوەیەکی دیکە مەیسەر نابێت"، تەنیا سەرمایەداری کە بەشێوەیەکی مەترسیدارتر مەزن دەکرێت و درێژە بەتەمەنی دەدرێت. هەروەکو چۆن لەئەزموونی سۆسیالیزمی بونیادنراودا بینرا، لەمیانەی نزیکبوون و سازش لەگەڵ سەرمایەداری تا دەچێت ڕێگا لەپێش گەورەبوونی مەترسیداری کێشەکانی سەرمایەداری، دەکاتەوە. لەم لایەنەوە لەبەرچاوگرتنی ریفۆرمیزم و گرێدانی ئەمە بەپێشکەوتنی شۆڕشەوە، و هەروەها ناکۆکی و سازش لەگەڵ ئەوەدا نە بەشێوازی چەپڕەو و نەراستڕەوەکان، بەڵکو بەنزیکبوونەوەیەکی راست و دروست و خستنە خزمەتی شۆڕش خاوەن گرنگییەکی حاشاهەڵنەگرە.

هەروەکو دەبینرێ؛ لەهەرکاتێك زیاتر بابەتی پێشخستنی هیوا و ئاسۆیەکی سۆسیالیستی و پرۆگرام و تاکتیکە سیاسی و پراکتیکیەکانی رۆژی خەبات و هاوکاری بەڕادەیەکی زۆر ئێمە دەخاتە نێو بیرکردنەوە.

پارتیمان PKK لەم بابەتەدا لەڕەوشێکی بەختەوەریدایە، بەڕادەیەکی بڵندی وشیاری و بەهەوڵ و تەقەلایەکی ڕێکخراوانە، پێشوازییەکی بەنرخ لەم رۆژە دەکات، تەنانەت دەتوانرێ بگوترێ کە پارتیمان بە سەرکەوتووترین شێوە پێشوازی لەو رۆژە دەکات. بەپشت بەستن بەم

راستییە، دەتوانێ بەهیوا و بانگەشەیەکی مەزن نزیکی قۆناخی ئایینده ببێت. هەروەها دەتوانێ پیرۆزترین و رەسەنترین شەڕی شۆڕشگێڕانە لەپراکتیکدا لەدژی ئەم شەڕە تایبەتەی کە دژ بەمرۆڤایەتی بەڕێوە دەچێ، پێشبخات. لەم قۆناخەدا PKK شۆڕشێکە هەم پێشکەوتنی مەزنی لەلایەن هیوا، بانگەشە و رۆح دا هێناوەتە ئاراوە و، هەم لەپراکتیك و سیاسەت دا سەرکەوتنی پێویست بەدەست دێنێت. شۆڕشێکە کە پێویستە سەربکەوێت، بەتەنیا جۆش و خرۆشی ئەمە، بۆ زیندوکردنەوە و رۆلگێڕان گرنگی خەباتگێڕی، تێری دەکات. ئەگەر هەندێك زیاتر سەرنج بدرێتە بنەماو پرەنیسیپەکانی تاکتیك، ئەوا ئەگەر هەر خەباتگێڕێك نەتوانێت پێشکەوتنی گرنگ دروست بکات، مەحاڵە سەرکەوتن بەدەست بهێنێ. ئەو پێشکەوتنانەی لەبونیادی PKK دا بەهۆی پێهەلگرتنی PKK لەنێو گەلێکی پاشکەوتووی وەکو گەلی کورددا ئەنجام دەرێت، ئەوا زیاتر لەوەش پێشکەوتن و هەنگاوی گەورەتر لەنێو گەلانی ناوچەکە و لەسەرووی هەمووانیش لەنێو گەلی تورکیادا پێکدێت.

بێگومان PKK کەوتۆتە نێو قۆناخێکی پێشکەوتووی بەوجۆرە. ئەو هەلومەرجە دژوارەی کە زەحمەتکێشانی تورکیا ژیانی تێدا بەسەر دەبەن، بەتایبەت بەلاوەنانی رەوشی داسەپاوی تادواڕادە نەفرەتلێکراو، کێشەیەکی بەپەلەیە.

زۆری نەماوە کە گشت ئەو هەلومەرجانە پێداویستی سەرهەڵدانی زەحمەتکێشان بسەپێنێ. بێگومان PKK ش دەبێتە هێزی یارمەتیدەر و بزوێنەری ئەو سەرهەڵدانانە، ئەمەش بەواتای دەرفەتێکی مێژوویی دێت.

هەروەکو بەردەوام ئاماژەی پێدەکەین سەرخستنی ئەرکەکان لەسەر ئەم بنەمایە دەبێتە سەرەتای پێشکەوتنی مەزنی نوێی شۆڕشگێڕانەی رۆژهەڵاتی ناوین. لەلاپەڕەکانی مێژووی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین دا و لەقۆناخە زۆر شەرەفمەندەکانی شارستانییەتدا، بەیەکەوە ژیان و بەیەکەوە بوونی گەلان هەیە.

یەکەم پێهەلگرتن بۆ شارستانیەت لەم خاکانەوە ئەنجامدراوە و دروست بوونی ئیمپراتۆرە شکۆدارەکانی کۆیلەداری، و دامەزرانەدنی شارستانییەتەکانی و هەروەها لایەنە خوڵقکارییەکانییان، لەسەر ئەم خاکانە پێشکەوتووە. هەروەها شارستانییەتی فیوداڵیش بەشێوەیەکی هەرە شکۆمەند، لێرەدا دەرکەوتۆتە مەیدان. رەوشتی گشتی سەرمایەداری ئەگەر بێت و سۆسیالیزمی بونیادنراویش وەك شێوەیەکی جیاوازتری ئەو بگرینە دەست ئەمرۆ بەشێوەی شارستانیەتێك کە پێی دەگوترێ رۆژئاوا، لەبەرمبەرمانـدا دەردەکەوێت. ئەمەش رێگا لەپێش دەرکەوتنی نموونەیەکی خراپی کۆمەلگا و مرۆڤێکی زۆر گرگن دەکاتەوە کە ئەمەش بەتەواوەتی ناهاوسەنگە لەگەڵ راستینەی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوین و، هەتا دوایی لەگەڵ داب و نەریتە مێژووییەکانی دا لەنێو دژایەتی دایە.

گەلانی رۆژهەلاتی ناوین ملکەچی ئەمە نابن، چونکە رۆژ لەدوای رۆژ مێژوو و راستینەی شارستانییەتی مەزنی خۆی دەناسێت. ئەگەر بەشێوەیەکی راست خاوەنداریێتی لێبکرێت، ئەوکاتە دەتوانن بژین، تا دەچێت ئەم راستیانە زیاتر دەبنرێت. ئەمە چەند سەدەیەکە کە سەرمایەداری تەنگەژە و قەیرانی مەزنی لەگەڵ خۆی هێناوە. دەتوانرێ بگوترێ لەو کۆمەلگایانەی کە هەرە زێدە مرۆڤایەتی تێیدا دووچاری زۆری و زەحمەتی هاتووە، ئەوا لێرەدا رێگای بۆ کراوەتەوە. لەم لانکەی کەمرۆڤایەتی هاتۆتە دونیاوە، رۆڵی بوون بەگۆڕستانی مرۆڤایەتی پێی بەخشراوە. بێگومان لەکاتێکدا کە گەلانی رۆژهەلاتی ناوین ئەم راستیینە ببینن، ئەوا ئەگەری ئەوە هەیە کە بەکاردانەوەیەکی زۆر مەزنەوە سەرهەڵبدەن.

بەڵێ، ئەمە ئاخافتنی PKK یە؛ ئەوەی ئەنجامیشی داوە، هەر ئەمەیە.

PKK لەبەرامبەری سەرمایەداری کە دەیەوێت لانکەی مرۆڤایەتی بکات بەگۆڕستانی مرۆڤایەتی، رادەوەستێت.

PKK وەڵامی سەرمایەداری ئیمپریالیزم دەداتەوە کە بۆ مرۆڤایەتی بەڵایەکی مەزنە و لە تالانچیێتی کە بەتەواوەتی بۆتە رژێمێکی قوماربـاز بەولاوە،هەروەکو لەسەرتای شارستانییەت دا روویداوە، ئەوا بۆ بەلاوەنانی کۆمەلگای چینایەتی و بەلاوەنانی ئەم سەرمایەدارە تالانکارە، جارێکی دیکەش ئەرکی لانکە دەبینێ.

هەر لە یەکەم سەروبەندی دەرکەوتنی پارتیمان ئەم هەڵسەنگاندن و شیکردنەوانەمان ئەنجامدا.

هەروەکو چۆن ئەم گەل و خاکانە لەکازیوەی بەربەیاندا رۆڵیان گێڕاوە، ئەوا هیچ هۆکارێك نییە کە ببێتە رێگر لەبەردەم دووبارە رۆڵگێڕانی ئەرکی لانکەی شارستانییەت و داهێنانی کۆمەلگای بێ چین. هەرچۆنێك بێت پێویستە ئەم ئەرکە مێژووییە مەزنە ببینن و پەسندی بکەین.

ئێمە بەئاسۆیەکی وەها فراوانەوە، بیر دەکەینەوە. خاڵی هەرە گرنگیش ئەوەیە کە گەلێك کۆسپ و تەگەرە لەژیانی رۆژانەدا هەن کە تەحەمولٚ ناکرێن، تەنانەت راوەستان لەبەرامبەر ئەو کۆسپ و تەگەرانە لەنان و ئاو و هەواش بۆ مرۆڤێك پێویست ترە.

خۆی لەخۆیدا ئەوەی کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە PKK رۆژانە ژیانی خۆی درێژە پێبدات، وەڵامدانەوەی تێر و تەسەلە بەپێداویستیە مرۆڤایەتیەکان. کەواتە، مرۆڤێك کە تا ئەم رادەیە ئاسۆیەکی فراوانی هەبێت و داهاتوو ببینێت و رۆژانەش بەهیچ شێوەیەك کۆسپەکانی ژیان پەسند نەکات، ئەوا هەڵوێستێکی وەها، ئەو کەسە لە بۆمبای ئەتۆم بەهێز تر و بەنرختر دەکات. PKK تارادەیەك ئەمەی پێك هێنا.

ئەو شێوە سەرۆکایەتییەی نێو PKK کەم تا زۆر دەبێتە ناوی پێکهێنانی ئەم هەڵوێستە.

ئەگەر پێداگری بکرێت، هەر خەباتگێڕێك ئەم شێوازە وەك بە کەسایەتیبوونێك لەخۆیدا بەرجەستە بکات و ئەمەش هەمیشەیی بکات. ئەوا بەڕاستی بۆ پێك نەهێنانی ئەم هیوا مەزنە، تەنانەت یۆتۆپیا دەمدرێژەکانیش، هیچ هۆکارێك لەئارادا نامێنێت. بێگومان سەرکەوتنی PKK لەواری کرداریدا، کە لە روانگەی گەلێك کەسەوە وەك موعجیزە دەبینرێت، ئەم راستییە نیشان دەدات.

ئێمە لەسەر ئەم بنەمایە لەمیانەی بانگەشەی سۆسیالیستیانەمان و هەروەها بەرژەوەندییە مێژوویی و هەنووکەییەکانی گەلان، پەیوەستبوونی خۆمان بۆ رۆژی هاوکاری رەنجدەر و زەحمەتکێشان دیاریدەکەین. ئێمە بەبانگەشە و تێکۆشانی سەرکەوتووانەی بێ سنووری PKK سڵاو لەم رۆژە دەکەین و هەروەها پیرۆزبایی لە تەواوی مرۆڤایەتی و گەلەکەمان دەکەین.

# لەبەرامبەر مردن، ژیان و لەبەرامبەر کۆیلایەتیش، ئازادی

سۆسیالیزم تا چ رادەیەك دەتوانێ رەوشی ئێوە رۆشن بکاتەوە؟

سۆسیالیزم رێبەری ئایدیۆلۆژیمانە. واتە ئەو رۆح و زانست و وزەیەیە کە ئێوە بەڕێوە دەبات. ئەگەر ئەو نەبێت ئاخۆ قاچەکان چیان پێ دەکرێ. رەنج و کۆششی قەبە خزمەت بەدوژمن دەکات.

هەڵبژاردنی سۆسیالیزم وەکو ئایدیۆلۆژیایەك بۆ خۆمان، نرخ و بەهایەکی گرنگ و بەرز لەخۆوە دەگرێت. ئەمە راست و گرنگە و ئاخۆ لەتوانایدا هەیە کە ئێوە رۆشن بکاتەوە؟ ئاخۆ دەتوانن لەرێگای سۆسیالیزم زیندوو ببنەوە و رۆشن ببنەوە؟

گەلێك ئایدیۆلۆژیای دیکەش هەن.

کەسانێك هەیە نەتەوەپەرستی پەیڕەو دەکەن و بەڕێوە دەبەن، کەسانێکیش ئایینگەرایی پەیڕەو دەکەن و بەڕێوەی دەبەن. ئەوانیش تاڕادەیەك راستی دەهێننە سەرزمان و، دەتوانن مرۆڤ هەڵسێنە سەر پێیان، بەڵام ئەوان بەهۆی گەلێك فاکتەری جیاجیاوە، لەنێو ژیاندا سەرکەوتنیان بەدەست نەخستووە. چەند سەدەیەکە ئیسلامیەت و نەتەوەپەرستی نەیانتوانیوە ئەنجام بەدەست بخەن.

وتمان، رەنگە سۆسیالیزم بتوانێت؟

لەڕاستیدا پێویست ناکات کە زێدە ئاماژە بەمێژوو، پرەنسیپەکانی سۆسیالیزم و بە PKK یی بوون بکەین، یاخود ئەوەی کە مەبەستمە لەرێگای سۆسیالیزمەوە بیهێنمە سەرزمان. خاڵی گرنگ ئەوەیە کە تا چ رادەیەك سۆسیالیزم دەتوانێ ئێوە شیبکاتەوە؟ هەڵبەتە ئەگەر سۆسیالیزم بەگشتیش ئەمە نەبێت ئەوا لایەنێکی بەم شێوەیەی هەیە، بۆ شیکردنەوەی ئێوە.

ئێمە ویستمان لەسەرەتادا بە PKK یی بوون وەکو پێشکەوتنی چەمکێك هەڵبسەنگێنین. هەروەها ویستمان ئێوە وەکو مرۆڤێکی خاوەن چەمك و هزر و پەیوەندیدار بگرینە دەست و بتانخولقێنین و، بەمجۆرەش پێناسەتان بکەین. پرەنسیپی هەرە سەرەکی سۆسیالیزمیش ئەمە بوو. بەڵام ئێستاکە سەیر دەکەم دەبینم ئاستی پێشکەوتن لەئێوەدا زۆر سنووردارە و بگرە رەتیشی دەکەنەوە. بۆچی؟ لەبەرئەوەی زۆر لەخودی خۆتان دەترسن و ناتانەوێ پێناسە بکرێن و شیبکرێنەوە. هۆکاری سەرەکی بۆ ئەوە دەگەڕێنینەوە ئێوە کەسایەتیەکن لەڕاستینەی خۆی رادەکات. لەنێو ئێمەدا بەهێز بوونی تایبەتمەندیەکی بەمجۆرە لەڕووی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیەوە لەکەسایەتیدا، گوزارشت لەچی دەکات؟ بەهێز بوونی تا ئەم رادەیە تایبەتمەندی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیەکان لەکەسایەتییەکی بەمجۆرەدا لەنێو ئێمەدا گوزارشت لەچی دەکات؟

بێگومان گوزارشت لەبارێکی ترسناك دەکات کە تێیدایە، ئەگەر تەماشا بکات و ببینێ و بیناسێ ئەوا شەرم لەخۆی دەکات. هەربۆیە دەڵێ:" من نەمبینی، من رادەکەم و لەنەدیتکەییەوە وەها هاتووم" لێرەدا کەسایەتییەکی وەها بەترسان لەڕاستینەی خۆی و

راکردن لەڕاستی بەکوێ دەگات؟ نەخێر ناگات بەهیچ شتێك و دەکەوێتە نێو خراپترین ڕەوشەوە. پێموایە هۆکاری سەرەکی پێشنەکەوتنتان ئەمەیە و دەکرێ بەم شێوەیە گوزارشتی لێبکرێت.

**"ئێوە لەخودی خۆتان دەترسن و رادەکەن"**

بەگشتی ئێوە لەتایبەتمەندیە بنچینەییەکانی مرۆڤ و، بەتایبەتیش لەتایبەتمەندیە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیەکانی نێو ئێمە زۆر دەترسن. ئەوەی کە هەندێك ئەمە بەقووڵی تێنەگات و هەستی پێنەکات و نەیبینێ و شان بەشانی ئەمەش خۆی پێناسە نەکات و پابەندی ئەم چەمکە نەبێت، ئەوا لەئاژەڵێك خراپترە. من وەکو سەرۆکێك زۆر بەڕاشکاوانە، ئەمە بەئێوە و هەموو کەسێکیش دەڵێم کە " ناتوانم بەو کەسە بڵێم مرۆڤ کە لەهەموو لایەنەکانیەوە لەڕاستی خۆی تێنەگات و پێناسەی خۆی نەکات".

ئەوەی کە دەژی کێ یە؟

چۆن دەژین؟ ئایا دەژین یان ناژین؟

پێویستە لەو نرخ و بەها و پرەنسیپانە تێبگەین کە مرۆڤیان کردووە بەمرۆڤ. ئەگەر لەمە تێنەگەین، ناتوانین بگرە یەك ملیمیش هەنگاو بەرەو پێشەوە بهاوێژین. بۆچی یەکتری هەڵبخەڵەتێنین؟ بۆچی بەجەنگاوەرێتیەکی هەرزان خۆم و ئێوەش پەرێشان بکەم! بۆچی هەموو رۆژێ دڵ پارچە بکەم و ئاخ و ئۆفم بۆ هەڵبکێشن، بۆچی خۆشم و ئێوەش تەنگەتاو بکەم؟! خواستمان باوەڕ بەوە بکەین کە بانگەشەیەکتان هەیە. وەها مەزندەم دەکرد کە "ئەوانە لەنێو لێگەرینێکدان" بەلام لەپێکهێنانی ئەمەدا، خراپی هەرە گەورەشمان لەگەڵ خۆمان کرد. لەچ واتایەکدا؟ بەو واتایەی کە تاچ رادەیەك ساف بوون. ئەوەی دەرکەوتۆتە مەیدان ئەوە بوو کە بیرکردنەوەی بەم شێوەیە دەربارەی مرۆڤەکان بووە مایەی دەستخەرۆبونێکی زۆر. وێڕای ئەوەی ئەوەندە بێ باوەڕی و پەشیمانی کە لەپرەنسیپ و بڕیار و گوزارشتی پێکهێنان و پراکتیزەکردنتاندا هەیە، کەچی هەر بەخەیاڵیشتاندا نایەت.

" وابووە، واچووە" بەچ واتایەك دێت؟ بۆیە ئەگەر بەشێوەیەکی سەیر رووبەڕووی نەبینەوە, نابێت.

لەدەستدان بەشێوەیەکی هەرزان. گوزارشتی لەڕاستینەی مرۆڤێکی لەنێو چوو دەکات. لەژێر هەموو بنکەوتنێك و لەدەستدانێکی هەرزان، راستینەی مرۆڤێکی لەخۆ راکرد و ترساو بوونی هەیە. با خۆمان هەڵنەخەڵەتێنین، چاوەڕوانکردنی ڕێز و بەزەیی پەیوەندیدار بوون لەکەسانی تر، مایە پووچییە و لەگەڵ خۆیدا ئەنجام بدات، ئەوا مافی هیچ ڕێز و پەیوەندیداربوون و بەزەییەکی نییە.

بایەخدانمان بەسۆسیالیزم، لەڕاستیدا بۆ کۆتایی پێهێنانی ئەمەیە.

ئەگەر پێویست بکات هەندێك لەئێوە دەتوانن ڕێبازێکی ئایینیش پەسند بکەن، دەکرێ هەر جۆرە ڕێبازێکی ئایدیۆلۆژیش بەبنەما وەربگرن.

لەنێو ئێمەدا ڕاکردنێك نەك تەنیا لەسۆسیالیزم، بەڵکو لەتەواوی ئەو ڕێبازانە لەئارادایە. کەسێك نییە کە بەگوێرەی ڕاستی ئایین، بەگوێرەی نەتەوەپەرستی یان بەگوێرەی ئەم یان ئەو فەلسەفە. جا ئەمە ئەگەرچی شێوەی بیر ( هزر)ێکی کۆنەپەرستیش دەبێت، بژیت و هەڵسوکەوت بکات. هەر لەبەرئەمەیە کە کێشمەکێش و ئاڵۆزی زۆر مەزنە.

لەم دواییانەدا ئەمریکاییەکان دەڵێن " ناتوانین سەبارەت بەکوردان سیاسەت دابڕێژین" تاڕادەیەك لەسەر ئەمە بیرم کردەوە. ئەوەم بۆ دەرکەوت: بەڵێ ناتوانێ سیاسەت دابڕێژێ. پێم وایە تادەچێ ئەمریکا باشتر لەوە تێدەگات کە تەنانەت هێزێکی جیهانی خاوەن سیاسەتی هەرە پێشکەوتووی وەکو ئەمریکاییەکانیش ناتوانن لەڕاستینەی کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی کوردان تێبگەن کە تا ئەم ڕادەیە پەرتەوازە بووە و بگرە بەرێژەیەکی مەزن شیرازەی خۆی لەدەستداوە. ئەگەر نا، دەزانین کە مرۆڤە ئەمریکاییەکان تا چ ڕادەیەك لەداگیرکردنی نوێدا خاوەن شارازاییەکی بەرێوە بەرین.

بۆچی ناتوانن سەبارەت بەکوردان سیاسەتێك دابڕێژن؟ چونکە بێ بڕیار و بێ چارەن. ڕەنگە بەپشت بەستن بە PKK سەبارەت بە PKK بەلایەنی کەم سەبارەت بەمن دەڵێن "زۆر ستەمکار و بێ بەزەیی" بێگومان ئەمەش سیاسەتی ئەمریکا پێك دەهێنێ. لەڕاستیدا ستەمکار و بێ بەزەیی هەرە مەزن، ئەو خۆیەتی، کاتێ هەندێك بتانەوێ دژایەتی هەندێکی دیکە بکەن، ئەگەر نەتوانن بەباشی پێناسەی بکەن ئەوا ئەم وشانە زۆر بەکار دەهێنن.

ئێستا کۆماری تورکیا " بۆ ئەم شەڕەی بەڕێوەمان بردووە دەڵێن:" شەڕی مرۆڤایەتی". کەچی لەڕاستیدا ئەمانە قسەی ئێمەن ئەو دەڵێ " مرۆڤایەتی لەبەلایەکی مەزن ڕزگار دەکەین". هەڵبەتە ئەمە لەکاتێکدایە کە ئەمانە ئەو گوزارشتانەن کە بنەمای ئایدیۆلۆژی و سیاسەتی PKK پێکدەهێنن. بەڵام دوژمن ڕاستینەی خۆی بەتۆوە دەلکێنێت و لەبەرامبەر تۆدا شەڕ بەپێویست دەبینێت.

ئەمە بەو واتایە دێت کە، دوژمن تا ئەو ڕادەیە ئێمە بەهیچ لەقەڵەم دەدات و تەنانەت دەیەوێت ڕەسەنترین بانگەشە و پرەنسیپەکانیشمان لەدەست دەربهێنێ. هەڵبەتە لەسەربنەمای لاوازییەکی بێ سنوور نزیك دەبێتەوە. هیچ تێناگات یاخود ئەوەی لێی تێدەگات ئەمەیە:" من دەتوانم هەموو شتێك بسەپێنم و بەپەسندکردنی بدەم " یاخود " هەرچی تایبەتمەندی خراپی خۆم هەبێت، دەتوانم هەموویان بەوانەوە بلکێنم".

ئێوە بەئەندازەی بیرکردنەوە و پێشخستنی ژیانی بێ هزر، خراپەکاری هەرە مەزن سەبارەت بەخۆتان دەکەن: من دڵنیام لەوەی کە PKK سەرچاوەی ئیلهام و بوێرییە.

هەڵبەتە PKK هەموو کاتێ هەوڵدەدات ببێتە سەرچاوەی ئەمە. وەلێ خاڵی سەرەکی یاخود ئەوەی کە پێویست دەکات تێبگەن ئەمەیە، بوون بەخاوەن چەمك بەبنەما وەرگرتنی هزر، ئەنجامدانی چالاکی خوڵقکارانەیە، ئەنجامەکانی دیکە لاوەکیە و سەرەکی نین.

**"قورسترین کار لەجیهاندا بەڕێوەبردنی ئێوەیە"**

ئێستاکە دەتوانم بڵێم کە بەڕێوەبەرایەتی سیاسی کورد، پارتی کورد، ئایدیۆلۆژی، تەنانەت سەربازی هێندەی ئەوەی کە سەختترین کارە لەجیهاندا، هاوکات کارێکە کە پسپۆڕێتی هەرە مەزن دەیەوێت. راستینەیەکی دیکەی کوردان ئەوەیە، ئەو شتەی کە هەرە زێدە پێکی دەهێنێ مردنە، کەواتە ئەوی دیکە ئێوە بیری لێدەکەنەوە.

ئایا تا چ رادەیەك دەتوانین ژیان پێکبهێنین؟

کاری هەرە باشی ئەوان ئەوەیە کە بیر لەمردن دەکەنەوە. کەواتە ئەبێ کارە خراپەکان چی پێ بوترێت؟ کە لەمردنێکی باش بەولاوە ناتوانن بیر لەشتێکی تر بکەنەوە. خراپەکان، تەنیا گیانی ئەوانە دەکوژن، چ ناوێك لەوانە بنێین؟

پێی دەڵێین دەرگەوانی دۆزەخ؟ ناوی ئەمەیە، بەڵێ، دوژمنە، بەلام چەمکە هەرە باشەکانی، خۆی لە خۆیدا دەتوانێ مردنێکی باش بۆ خۆی پەسند بکات و بۆ مردنێك ئامادە دەبێت.

ئەمەش دەبێتە راستی مرۆڤەکانمان. پێش مردن یان دوای مردن، بیر لەژیان دەکرێتەوە.

جا ئەوەی کە بەدوای ژیاندا دەگەڕێ یاخود ئەوەی کە تازە چاو بۆ ژیان دەکاتەوە پێویستە ئەو شتەی کە پێش هەموو شتێك رەتی بکاتەوە، مردن بێ.

کێیە ئەوەی لەنێو ئێوەدا مردن رەت دەکاتەوە؟

کام شێوە مردن رەت دەکاتەوە؟

شتی هەرە گرنگ ئەوەیە کە دوای رەتکردنەوەی مردن، کێ بیر لەژیان دەکاتەوە؟ ژیانێکی چۆن؟

من بۆ هەموو کەسێك گوێ رادەدێرم، وەلێ بەگوێرەی پێودانگی من، بەگوێرەی سۆسیالیزم، کەسێك نییە زێدە بیر لەژیان بکاتەوە. پێم وایە لەبەرئەوەیە کە ئێمە لەنێو خۆماندا ناتوانین نرخ و بەهای گرنگ دەرخەینە مەیدان. ئەگەر هەستی ژیان نەبێت کام نرخ و بەها پێشدەکەوێت؟ چ کەسایەتیەك دەتوانێ رێپێوانی سەرکەوتن جێ بەجێ بکات؟ ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو توێژەی کۆمەڵگا کە دەڵێن " ئێمە دەژین"، سەیری دێیەك بکەین، سەیری کرێکارێك و تەنانەت کارمەندێك بکەین لەڕەوشی کەرێکی ناو تەویلەیەك خراپترە. دوژمن ئەو دەخاتە نێو تەویلەیەك و تەنانەت خۆراکیشی پێنادات. هێزی ئەو کەسە هێندەی کەرێکیش نییە کە بزەڕێ. کەچی هاوار دەکا و دەڵێ " من دەژیم". رەوشی ئەو کەسایەتیە تا

ئـەو ئەندازەیـە غافـل و چەواشـەکراوە، تەنانـەت رەوشـی قـەومی لەعنـەتکراوی موساشـی تێپەڕاندووە.

ئـەم مرۆڤانـە لـەکوێی ژیانـدان؟ وا تێنەگـەن پەسـنی خـۆم دەدەم. مـن نـەك ئێسـتا بـەڵکو لەتەمەنێکی زۆر بچووکیشدا نەفرەتم لەو شێوە کەسایەتیانە دەکرد. من وتم مرۆڤ ناتوانێ نە لەگەڵ پیاو، نە لەگەڵ ژنی ئەوانە ژیان بەسەر بەرێت. هەروەها ئەو نەلەناو خێزانی ئەوانە و نەلەناوی کەسوکاری ئەواندا، مرۆڤ ناتوانێ ژیان بەسەر بـەرێت. هێشـتاش بـەبیرم دێتـەوە کـە لـەو رۆژەوە تـاوەکو ئـەمرۆ ئێمـە بـەدوای ژیانـدا دەگـەڕێین، لـەکوێ بـژین؟ چـۆن بـژین؟ بـۆ وەڵامدانەوەی ئەمانە، ئێمە پارتیەکەمان ئاوا کرد و شەڕمان کرد.

هێشتا تاوەکو ئێستاش ئێمە بەدوای ژیان و یۆتۆپیای سۆسیالیزم وێڵین. لەلایەکی دیکەشدا کە سەیری شێوازی ژیانی هەنووکە دەکەم، دەبینم تەنیا ژیانێکی بەگوێرەی ئێوەیە. کە تیایدا هەموو جۆرە ناشیرینی و مردنێك هەیە. هەتا باس لە چەوتییەکانیش ناکـەم. خـۆی لەخۆیـدا هـیچ پەیوەندییـەکی بەراسـتییەوە نییـە. کەچـی ئێـوە شـێوازی ژیـانێکی بەمرەنگـەتان پەسندکردووە و درێژەی پێ دەدەن.

ئایـا بـەم شـێوازە مرۆڤـی مـەزن و سۆسیالیسـتی دەخـوڵقێنرێ. ئایـا رێپێـوانێکی گـەورە دەخوڵقێنرێ؟

نەخێر!

بۆیە پێویستە پەیوەست بوون بەئایدیۆلۆژیای ژیان نیشـان بـدەن. بەدەسـت هێنـانی نـان و ئاویش پەیوەندی بەپەیوەست بوون بەژیانەوە هەیە. من ناڵێم " شـەڕی ژیـان" دەکـەن، وریـا بن. " شەڕی سۆسیالیزمە" دەڵێین و رادەوەستین. مـن هێشـتا نەهاتوومەتـە ئێـرە بـۆ ئـەوەی بتوانین بگەینە ئێرە پێویست دەکات باوەڕی بە پێداویستییەکانی ژیان بهێنین.

ژیان پێویستی بەپێناسەکردن هەیە.

" ژیـانێکی چـۆن" کـەم یـان زێـدە ئـەبێ ئـەم پرسـیارە لـەخۆت بکـەی، بـۆ ئـەوەی بتـوانی لەپێناویدا شەڕ بکەیت. ئەگەر پرسیار نەبێت وەڵام دەبێ؟ ئایا ئەگەر راستی نەبێت، شەڕی بۆ دەکرێـت؟ ئەگـەر بشـبێت شـەڕی خـەیاڵان و شـتێ بـێ بایەخـە. بۆچـی وام لـێ دەکـەن کـە بەمشێوەیە بدوێم چونکە ئێوە نەهاتنـە رێگای ژیـان. چـونکە خۆتـان مـەزن نـەکرد. هەڵـەی زۆرتـان کـرد سـەرنج بدەنـە هەڵسـەنگاندنەکانم بەڕاسـتینەی ئێـوەوە گرێـدراوە. ناچـارین کـە واقیعی بین.

خیانەتکردن لەگەڵ راستی بەلای منەوە بەفیڕۆدانی هەموو شتێکە. لەڕاستیدا ئەندێشـەی پەیوەست بە راستییەکانی ژیانتان نییە. ئەگەر نا ئایا رێپێوانی ئاوا هەڵە دەبوون؟ بەم رادەیە ناتەواوی و کەمو کورتی پەسند دەکرێ؟

بەم گوتنانە مەبەستم هەڕەشەکردن نییە لەئێوە هەڵبەتە ئەوەی هەڕەشە لەئێوە دەکات، هەموو رۆژێ ئەوەندەی دەتوانێ دەیکات. دیسانیش ئەوەی هەرە راستە، ئەوەیە کە هەڕەشە نەك بەیاسای قەبەی رێکخستنی یاخود بەسەپاندنی ئەرك، بەڵکو باوەڕی هێنان بەهێزی ئایدیۆلۆژی و هزر لەسەرووی هەموو شتێکەوە دێت، جگە لەمە بەهیچ رێگەیەکی دیکە ناتوانین ئێوە وشیار بکەینەوە.

" دیاردەی شەڕی ژیان و شەڕی سۆسیالیزم" لەریزی هەرە پێشەوەدان. جێ و پایەی ئەمانە بۆ رەوش و ئاستی لەپێشتر بەکار دەهێنرێت. ئەو ژیانەی کە بەسەر ئێمەدا دەسەپێنرێت، رەتی دەکەینەوە و لەناوی دەبەین.

ئەو ژیانەی کە لەسەر ئێمە دەسەپێنرێ، رەتی دەکەینەوە لەبەینی دەبەین، دەگوترێت جارێکی دیکە ونکردنی خۆتان لەئامێز بگرن. بێگومان ئێوە بێ چارەن. ئێوە لەژێر کاریگەری ژیانی قوورسی دوژمن دەژین خۆتان بەو دەگەیەنن؟ یاخود خۆتان نزیکی ئەو چالاکی خولقکار و پەپرەنسیپەی ئێمە دەکەنەوە ئێوە بەتەواوەتی لەناوەڕاستی ئەمانەدا ماون، ئاشکرایە ئیدی لەنێو هەلومەرجی دوژمنیشدا، ناتوانن ژیان بەسەر بەرن دوژمن کارنادات و، توانستێکی ماددی قەبەش بۆ ئێوە فەراهەم ناکات. لەم واتایەدا بەڕاستی لەلایەنی دوژمنیشدا ژیان بەسەربردنی بۆ ئێوە زۆر زەحمەت بوو. کاتێ ئەلتەرناتیف و هەڵبژاردنی ژیانی من جێگەی باسە. بەرەو رووی ئەوەوە هەنگاو نانێن. ئەمە بەواتای ئەوە دێت کە مرۆڤێك لەنێو دوو چەمکدا بمێنێت. ئەو مرۆڤانەی کە دوژمن پێداویستی ماددی هەرە قەبەی پێیان نەداوە، ئێمە چیان لێبکەین.

بەڵێ لەم خاڵەدا، ئەو شتەی کە بەتەواوەتی پێویستە مرۆڤ ئەنجامی بدات، ئەوەیە کە ئێوە بڵێن " شۆڕشە". من شۆڕشیش دەسەپێنم. وەلێ هێزی ئێوە بەشی شۆڕشیش ناکات.

ئاخۆ ئێوە دەزانن کە دوژمن تا چ رادەیەك ئێوەی لەنێوبردووە؟ یاخود دوژمن کۆکوژییەکی لەسەر ئەنجامداون کە لەڕاستیدا کۆکوژیەکی ئاسایی نییە.

واتە ئەمە لەوە دەچێ، هەندێ (مار) هەن کە شێوازی ئەوانە (بە نیوە مردوو بەجێشتنەوە) و نیوەی دەخۆن و نیوەکەی دیکەش دەهێڵن. ئەگەر دوژمن هەرمووومان بخوات، ئێمە بەوە رازین. هاوشێوەی ئەو کارەساتەی کە بەسەر ئەرمەنیەکانیان هێنا لەسەر ئێمەش پەیڕەو بکات، ئەمەش شێوە چارەسەریەکە. ئینگلیزەکان چیان لەموستەعمەرەکانی خۆیان کرد، ئەگەر داگیرکەرییەکی وەهاش لەسەر ئێمە پەیڕەو بکەین، دیسان ئێمە رازین.

هەروەکو ئەمریکا لەچەمکی داگیرکاری نوێدا نزیك دەبێ، ئێمە بەو نزیك بوونەش رازی دەبین. بەڵام ئەو کۆکوژیەی لەسەر ئێمە ئەنجامدراوە جیاوازە. ناچارین بەشێوەیەکی راست لەهۆڤێتی تورك، بەربەڕێتی تورك تێبگەین. ئێمەی لەمرۆڤایەتی دەرخستووە.

کۆماری تورکیا ئێوەی خولْقاندووە..

من چل ساڵە لەڕێی هەوڵدانی ئازادی، خۆم دەخولْقێنم. کۆماری تورکیا تاچ رادەیەك دەتوانێ مرۆڤ بخولْقێنێ و تاچ رادەیەکیش دەتوانێ بیکات بەمرۆڤ. لەڕاستیدا هەستیشی پێناکات، کۆماری تورکیا و کەمالیزم لەخەمی ئەوەدا نین کە مرۆڤ چاك بکەن یاخود بیخولْقێنن. هیتلەر تاکتیکێکی کۆکوژی پێشخست. وا پێدەچێ کەمالیزم لەویش ترسناکترە. لەڕاستیدا هیتلەر ئەنجامی بەدەستخست، کەچی کەمالیزم ناتوانێ ئەنجامیش بەدەست بخات. هەڵبەتە شتی هەرە ترسناکیش ئەمەیە. چونکە ئەو مرۆڤانەی کە بەنیوەچڵی هێشتوویانەتەوە، لەو مرۆڤانە خراپترن کە لەکامپەکاندا ئێسك و پروسکیان دیارە. بیر لەڕەوشی کۆمەڵگای کورد بکەنەوە، من کەمالیزم لەکامپی هیتلەر مەترسیدارتر دەبینم، ئەمەیە کەمالیزم. هیتلەر مسۆگەر جیاوازی دادەنێ و خۆی پێکدەهێنێ. وەلێ لەکەمالیزمدا تاڕادەیەك بێ بەهرەیەکی فاشیستی وەها هەیە کە ناتوانێ ئەنجام بەدەست بخات. ناتوانێ بیخوات، بۆ خواردنیش نیو مردو نیو زیندوو لەزەویدا دەیهێڵێ، وەکو کەلەشێك و بۆگەنی دەکات.

کەمالیزم ئەوەیە کە مرۆڤێك هەمیشە لەژێر سایکۆلۆژی چاوەڕوانی لەسێدارەداندا بێ، یاخود مرۆڤێك کە هەر کاتێ لەژێر سایکۆلۆژی دۆڕاندا بێت.

مرۆڤ لەنێو ئەم سایکۆلۆژیایەدا چی بەسەر دێت. ئەمە بۆ ئەوە نی یە کە سایکۆلۆژی مرۆڤ تێکبدات، بەڵکو مرۆڤێکی نیوشێت دەخولْقێنێ. هەموو بێچارە و هەژارن پێم وایە هەموویان دەرزی ژەهریان لێدراوە.

واتە ئەم دەرزیانە بەتەواوەتی مرۆڤ ناکوژن. ئایا ئەوانە وەکو قۆرخ کاربوون؟ بەگوێرەی دابونەریتی کۆن خواردەمەنیان نێو بۆگەن دەکرد و دەیانشاردەوە کۆماری تورکیاش کوردانی خستۆتە جێگایەکی وەها. لەڕاستیدا تورکانیش بەکاردەهێنێ. بەڵام کوردانیش بەشێوەیەکی خواردەمەنی کۆن، بەو جۆرە بۆگەنی دەکات و کاتێ پێویستیش دەکات دەڵێن:" بەشێك لەتۆ دەخۆم". وەکو پشیلە و مار و هتد، تەنانەت ورچیش وەها دەکات. واتە ئەوەی کە کۆماری تورکیان ئەنجامی دەدات داگیرکاری ورچە؟ ئەمە راستییەکە پێویستە ئێمە چی بکەین؟ ئەگەر هەندێ ناوەڕۆك هەبێ، ئەو لاشەیەی کە بۆگەن بووە، هەروەها چۆن خۆتان لەبوون بەخواردنی ورچ رزگار دەکەن. ئەمە کێشەیەکی زۆر گەورە و گرنگە، ئێمە چی بکەین بۆ کوێ رابکەیەن.؟"

ئێمە چۆن بژین و چۆن بمرین؟

" ئێمە چۆن بمرین؟".

نیو مردوو!

مرۆڤی ئێمەی گەیاندووەتە خالێك کە لەمردنەکان مردنێك پەسند بکات. ئێمە ژیانێك دەتەوێن کە بتوانین لەسەر پێی خۆمان بوەستین.

رەنگە ئێوە بەو شتانەی ئێمە بەئێوەی دەڵێین ،بڵێن " چ پەیوەندییەکی بەسۆسیالیزمەوە هەیە؟ بێگومان ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزم، بەخوڵقاندنی مرۆڤێکی ئازاد گرێدراوە بەکۆمەڵگایەکی ئازاد و هەروەها ڤازانجکردنی کۆمەڵگایەکی ئازادیش لەرێگای تێکۆشانی ئازادییەوە مەیسەردەبێت، واتە سۆسیالیزم دەبێتە ئایدیۆلۆژیای ئەمە. لەبەرئەوەی کە ژیانێکی ئازاد بۆ ئێمە لەهەموو شتێکی دیکە زیاتر پێویستە، ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزمیش لەهەموو ئایدیۆلۆژیایەکی تر پێویست ترە.

ئەگەر سەرنج بدرێت ئێمە لێرەدا هێشتا نەکەوتوینەتە نێو تێکۆشانی چینایەتی، ئێمە هێشتا نەکەوتووینەتە نێو ئەو سۆسیالیزمەی کە لە PKK دا پێکهاتووە.

ئەو شتەی کە دەمودەست پێویستە بگوترێت ئەمەیە کە: هەروەکو چۆن ژیان، بەسۆسیالیزم دەناسرێت، ئەوا شەڕی ژیانیش تەنیا لەرێگای سۆسیالیزمەوە ڤازانج دەکەین. لەبەرئەوەی ئایدیۆلۆژی سۆسیالیزم، کۆمەڵگا دەهێنێتە بیری مرۆڤ، ئەوا چارەسەری کێشەی گەلێکی وەك گەلی کورد کە تا ئەو رادەیە لەکۆمەڵگای مرۆڤایەتی دوورخراوەتەوە، لەسۆسیالیزم بەدیدێت.

لەبەرئەوەی کۆیلەبوونی تاك هێندە قووڵ بۆتەوە، ئەوا چارەسەری ئازادی لەسۆسیالیزمی زانستی بدۆزنەوە. هەربۆیە مسۆگەر پێویست بەسۆسیالیزم دەکات. واتە ئێمە سۆسیالیزممان هەروا رووکەشانە هەڵنەبژاردووە. پێویستە بەمجۆرە لەسۆسیالیزم تێبگەن، کە ئایدیۆلۆژیای هەرە رزگارکەری مرۆڤایەتیە کە بەگوێرەی راستی کۆمەڵگا و کۆیلایەتی ئێمەیە. ئێمە تا ئەم رادەیە سۆسیالیزم بەرفراوان و خاوەن رەهەند دەبینین.

ئەگەر سەرنج بدەن چەمکی سۆسیالیزمی ئێمە زۆر بەرفراوانە. پێناسەی سۆسیالیزم ئەوەندە بەرفراوانە کە ئایدیۆلۆژی زیندووکردنەوەیە، دژی هەر جۆرە بێ هۆشکردنێکە. ئایدیۆلۆژیای پەسندکردنی ژیانە نەك رەت کردنەوەی ژیان، ئایدیۆلۆژیای ئازادیە لەبەرامبەر مردن و کۆیلایەتی هەرە مەترسیدار و ئایدیۆلۆژیای ژیانە کە لەبەرامبەر مردنە.

کاتێ ئێمە بەمجۆرە پێناسەی سۆسیالیزم دەکەین، دمانەوێت، لەنێو راستی خۆشماندا پێکیبهێنین. بۆیە دەبێ تێکۆشانی ئەمە بەتایبەتی لەنێو PKK دا زۆر بێ بەزەییانە بێت. چونکە ئەو سۆسیالیزمەی کە لەنێو PKK دا پێکدێت، لەبنەمادا دوژمن، سەرمایەداری تورك یاخود کەمالیزم وەکو شێوەیەکی پاشڤەڕۆترین و ترسناکترین فاشیزم هەڵیدەسەنگێنێ. ئەو داگیرکاریەی کە هەرە زێدە پشتی خۆی بەتوندو تیژی پتەو دەکات و هەر شۆڤێنی و پاشڤەڕۆ و ترسناکە، خۆی لەڕاستی کۆمەڵگای ئێمەدا دەسەپێنێ. وەکو داگیرکەری پشیلە، کە بەسەر

مشك دا دەیسەپێنێ. کۆماری تورکیا سەرمایەداریەکی وەهایە. پێویستە پێناسەی سۆسیالیزمی خۆمان بەم شێوەیە قووڵ بکەینەوە.

لەلایەکی تردا کاتێ هەموو ئایدیۆلۆژیا و ئایین و رێبازە بۆرژوازیە هەمە جۆرەکان لەسەر راستی مرۆڤی ئێمە پێکهاتووە، ئەوەندە ئیفلیجی کردووە و، رێگەی بۆ رەوشێکی بێ ئەنجام کردۆتەوە و بەرەوشێك گەیشتووە کە نەناسرێت. بۆیە پێناسەی مرۆڤی نوێ و مرۆڤی ئازاد مەگەر بەسۆسیالیزمێ کە لە PKK دا پێکهاتووە، مەیسەر ببێت.

لەدەرەوەی سۆسیالیزم، هیچ ئایدیۆلۆژیایەکی دیکە ناتوانێ راستی ئێمە پێناسە بکات و ئێمە لەم رەوشە رزگار بکات.

هەربۆیە سۆسیالیزم لەپێناوی بەکۆمەڵگابوون دەبێتە تاکە بژارێك.

وتەیەك هەیە کە کاسترۆ بەکاریدەهێنێ: " یان سۆسیالیزم یان مردن" یاخود " یان سۆسیالیزم یان کوبایەکی ژێر ئۆقیانووس" بۆ ئێمەش زیاتر ئەمە وەهایە. یان سۆسیالیزم یان هیچ شتێك.

ئۆقیانوسێکی کوبا هەیە کە بکەوێتە بنی، کەچی ئێمە ئۆقیانوسێکمان نییە کە بکەوینە بنی. رەنگە بڵێین چەمی " وەل وەل" یان " چەمی دۆزەخ". کەواتە دەبێ پەسندکردنی ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزم گرێدراو بەژیانی ئێمە وەها هەڵبسەنگێنین.

بێگومان کاتێ کە لەنێو پارتیدا باس لەتێکۆشانی سۆسیالیزم دەکەین، ئەوا ئەو سۆسیالیزمەی کە لە PKK دا پێکهاتووە گوزارشت لەکار و ئەرکێکی مەزن دەکات.

ناڵێم تێکۆشانی چینایەتی بەتەنیا بەسە. تێکۆشانی چینایەتی لەنێو PKK دا یاخود بەگشتی لەنێو پارتیدا پێویستی بەپێشخستنی هەیە، خۆی لەخۆیدا پێویستە وەکو کێشەیەك لەئاستی گەردوونی دا هەڵبسەنگێنین. هۆکاری بنگەیی بۆ ئەوەی کە ئەزموونی سۆسیالیزمی بونیادنراو دەگەڕێتەوە کە ئەو پارتیانەی رێگایان بۆ ئەو سۆسیالیزمە کردۆتەوە لەنێو خۆیاندا تێکۆشانێکی چینایەتی بەردەوام و خوڵقکارانەیان ئەنجام نەداوە، هۆکاری هەرە سەرەکی ئەمەیە. ئەو پارتیە دۆڕاوانە لەنێو خۆیاندا نەیانتوانی سۆسیالیزم بەرێوە ببەن و تێکۆشانی چینایەتیان راوەستاند، تادواڕادە دەرگایان بۆ تایبەتمەندی چینایەتی کۆن کردەوە و دەرئەنجام ئەگەر دەوڵەتیشیان ئاواکردبێ و بڵێین:" خۆگەیاندن بەئاستی کۆمۆنیزمیش" بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لەدوایدا خۆیان لەتەسلیمکردنی کۆمەڵگا بۆ سەرمایەداری رزگار نەکرد.

ئەزموونی سۆڤیەت زۆر بەئاشکرا ئەمە دەردەخاتە مەیدان. لەم واتایەدا گرنگی هاوکاری PKK ئەوەیە کە لەنێو خۆیدا تێکۆشانی چینایەتی بگرە لەوەش زیاتر تێکۆشانی مرۆڤایەتی زۆربە بەرفراوانی بەرەو پێشەوە برد. هەم سۆسیالیزمی زانستی، لە هەلومەرجی

کۆمەڵگایـەکی زۆر ترسـناك و گرنگـدا، پێکهێنـا و تێکۆشـانی نێـو خـۆی بەسـەرکەوتوویی بەڕێوەبرد و تا ئەمڕۆکەش تەمەنی خۆی درێژە پێدا.

ئەمـە گـرنگترین هاوکـاری ئێمەیـە بـۆ سۆسـیالیزم. واتـە یەکـەمین جـارە PKK شـەڕی کەسـایەتی، تێکۆشـانی نەتـەوەیی، کۆمەڵایـەتی، چینـایەتی، زۆر بـەفراوانی بـەڕێوەبردووە و، هەروەها شیکردنەوەی راستی نەتەوایەتی و چارەسەرکردنی راستی کۆمەڵایەتی لەنێو پارتیـدا تاقیکردەوە.

لەجیهانـدا هـیچ پارتیـەك بـەم ئەندازەیـە تێکۆشـانی لـەناو خۆیـدا بـەڕێوە نـەبردووە. لەبەرئەمـەش زۆر پـارتی تـر تەنانـەت دەوڵـەتیش کاریگـەری خۆیـان لەدەسـت دەدەن. بـەڵام PKK لەناو کۆمەڵگایەکی لەناوچوودا بەشێوەیەکی هەرە خولقێنەر پێکهێنـانی سۆسـیالیزمی بەبنـەما گـرت و، لەناوخۆشـیدا بـەردەوام دەبێـت و دەیگەیەنێتـە ئاسـتی بەسیسـتەم بـوون. لەبەرئەمـەش ئیمـڕۆ یـان سـبەی لەچاپی گەردونـدا دەبێت بەپارتیـەکی نموونـەیی. لێـرەدا هەموو شتێکی کۆتایی پێنەهاتووە.

ئازادیەکی (PKK ) هەیە رۆژانە لەسەر بنەمایەکی داهێنەرانە شەڕ بەڕێوە دەبات. ئەگەر بەیانی پرسیار بکرێت گوایە " مەترسی هەرە گەورە چییە بۆ PKK " ئەوە نەدوژمنە و، نە پێداگرتنی ئەم و ئەویشە لەدەرەوە، بەڵکو راگراتنی تێکۆشانی نێوخۆیی و بەتایبەتیش ئەگەر درێـژە بـە راستی تێکۆشـان و راسـتی بەڕێوەبەرایـەتی سۆسیالیسـتی نـەدرێت، ئـەوا پـارتی بندەکەوێت. بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی راست بەڕێوەی ببات، ئەوا شکست ناخوات. تاکە رێگای سەرکەوتن. ئەمەیە. ئەگەر ئەمـە لەتاکـە کەسـێك و کۆمیتەیەکدا بەرجەستە بێت، دەتوانێ پارتی بەسەرکەوتن بگەیەنێت. وەلێ ئەگەر بەلاڕێدا ببردرێت، کەسایەتی لەنێو خۆیدا بێچارە بێـت، لەکۆمیتـەی ناوەنـدی، بـیرۆی سیاسـیدا یـاخود لەتـەواوی کـادیرانی پارتیـدا چەقبەسـت ببێت. ئەوا ئەگەر دەوڵەتیش ئاوا بکرێت، ئـەو دەوڵەتـە بەشـێوەیەکی وا کـە هـیچ چاوەڕوانی لێناکرێت، لەدەست دەردەکەوێت و دەگۆڕێت بۆ ئامرازێکی پێچەوانە و رووبەڕووی دەبێتەوە.

ئێمـە لەراکێشانی مرۆڤـەکان بـۆ نێـو PKK سـەرەتا بـەمجۆرە لێپرسـینەوەیان لەگەڵـدا دەکەین کە " تۆ مرۆڤی، دەبێ بێیتە سەر رێگای ژیانی ئازاد"

دواتر ئەمەی پێدەڵێین: " دەبێ شەڕی پێداویستی بوون بە مرۆڤ. پێداوسیتی ژیانی ئـازاد، بکەیت" و " ئەگەر باوەڕی بەپێداویستی ئەمـە بکەیت و شـەڕی ئەمـە نەکـەیت، ئـەوا نابیت بەمرۆڤ و ئازادیش نابیت؟.

یەکەمین پێناسـەی ئـەو سۆسیالیزمەی لـە PKK دا پێکهاتووە ئەمەیـە و ئەمـەش خـاڵی سەرەکییە. ئەوەی ئەمـە بەبنـەما نـەگرێت، ئـەوا نـاتوانێ لەنێو PKK دا بمێنێ و تێکۆشـان پێشبخات و بەهیچ سەرکەوتنێکیش ناگات.

ئایا ئەمە تەنیا بۆ PKK بەمجۆرەیە؟ نەخێر! ئەگەر PKK نەبێت ئەوا خۆی لەخۆیدا ئەم کۆمەڵگایە شیرازەی هەڵوەشاوەتەوە و لەنێو ڕەوشێکی ئاڵۆز و پەرتەوازەیی دایە. هەڵبەتە ڕەوشی ڕێکخستنەکانی دیکە لەبەرچاوانە، بگرە بەهێزترین دەوڵەتە سەرمایەداری ــ ئیمپریالیزمەکانیش ناتوانن کورد پێناسە بکەن. هەربۆیە ئەمریکا یاخود ئەم یا ئەو دەوڵەت ناتوانن سیاسەت دابڕێژن. بۆچی؟ چونکە ناکرێ بەگوێرەی ئایدیۆلۆژییەکانی سەرمایەداری و ئایدیۆلۆژیە ئایینی یەکانیش کورد ـ کوردستان پێناسە بکرێ و سیاسەتی لەسەر دابڕێژرێت. مەگەر سۆسیالیزم بتوانێت ئەمە ئەنجام بدات کە لە گوزارشتکردنی زانستی کۆمەڵگادا هەرە بەبانگەشەیە و شکۆمەندکردنی مرۆڤ هەرە بە بڕیارە یاخود خاوەن ئامانجێکی بەمجۆرەیە. ئەمەش تەنیا بەوە دەبێت کە لەبنەما و شێوەی PKK دا پێکهێنانی سۆسیالیزم لە ڕاستینەی خۆماندا بەرجەستە بکەین و جێبەجێ بکەین. ئەو ڕاستیەی کە دەخوازرێت ئەنجام بدرێت و تاڕادەیەك سەلمێنراوە و بەرجەستە بووە، ئەمەیە.

دەبێ بزانن و بیر بکەنەوە کە " بۆچی سۆسیالیزم؟، سۆسیالیزمێکی چۆن و چۆن لە PKK دا سۆسیالیزم پێکهات؟"

وانەی سەرەکی ئێمە ئەمەیە.

ئەگەر ئەم وانانە نەزانرێ و دەرکی پێنەکرێت، ئەوا ناتوانن لەوە تێبگەن کە گەریلایەتی وەها بووە. شەڕی بەجموجۆڵە، کارگێڕیەکی بەرزە، سەرۆکە، فەرماندەیە، جگە لەمەش گەلێك هەڵەی مەزن ئەنجام دەدەن.

دیسان ئاماژە بەمە دەکەم: ئێمە داخوازی ژیانتان بۆ بەدەست دەهێنین. ئێمە بەنیشاندانی ڕێزی مەزن سنووردار نامێنین، هەردەم لەنەبوونەوە شتی نوێ دەخوڵقێنین. ئیدی پێویستە ئێوەش بۆ هەندێ زاراوە و دەستەواژەی بنچینەیی پەیوەنیداربوون نیشان بدەن. پێویستە هێزی پێکهێنان لەخۆتاندا نیشان بدەن. ئەمە بەتەنیا قسەکردن نابێت. مسۆگەر، بانگەشەی شێوە سۆسیالیزمێکی دیکە، درۆیە. ئەگەر بەگوێرەی ژیانی ئێمە هەڵنەکەن، هێزی ئایدیۆلۆژی نیشان نەدەن، ئیرادەی دەرنەخەنە مەیدان، ئەوا دەبنە درۆزن و ساختەکار. واتە دەمرن و بەئێوەش ژیان پێشناخرێت. ئەگەر ئێوە بێ مێشك بن، ئەوا خائین و سیخوڕ دەبن. بەمەش هەڵکردن لەگەڵ ژیان مەیسەر نابێت. (بابەتی) بوون، هیچ گرنگ نییە. وانەی سۆسیالیزم هەروا ڕوکەشانە نییە، بەڵکو وانەی سەرەکی ژیانمانە.

بە PKK یی بوونی ئەمە و پێکهێنانی لەنێو PKK دا بۆ ئێمە کت و مت دەبێتە خوڵقکاری و ژیانمانەوە بۆ خۆی. ئەگەر ئەوە بەجیددی و مسۆگەری بگرنە دەست، ئەوا دەکرا بڵێم دەتوانن هەندێك شەڕ بکەن و لەگەڵیشیدا بکەونە سەر ڕێگای ژیان و هەروەها باوەڕیتان بەسۆسیالیزم و پابەندبوونیشتان دەبوو بۆ ئەو سۆسیالیزمەی کە لە PKK دا پێشکەوتووە.

بۆیە ئیدی نە بەمردنێکی هەرزان و نەبە گرتنەبەری ژیانێکی هەرزان، خۆشتان و منیش هەڵنەخەڵەتێنن. کارەکان زەحمەتن.

**"کۆشش بۆ سۆسیالیزم و ژیان دەکەین"**

هەروەها لەبەرامبەر چۆن دوژمنێکدایە ئاشکرایە. ئەی تۆ نیت دەیەوێت بژی؟ شەڕی ئەو بدە بەرچاو شێوەی ئایدیۆلۆژییەکەی، شێوەی رێکخستنەکەی پێناسەکەی بۆ دۆست و دوژمن بەبنەما بگرە. جدیەتی ئەو، گرانیەکەی و ئامادەکاری لەهەموو ئاستێکدا بە بنەما بگرە. ئەی بۆ واناکەن؟ بۆچی یەکسەر بەرەو ساختەکاری دەچن؟

بۆچی ئاوا چەواشەی دەکەن؟ بۆچی ناتانەوێت گەلێگ شت ببینن؟ بۆچی پێویستیەکانی لە کەسایەتی خۆتاندا پێکیناهێنن؟ ئەگەر وابکەن، ناڵێم تەنیا خۆپەرستن، بەڵکو ئەگەر ساختەکارێکی گەورە نین. ئێوە چین؟ هەڵبەتە راستی سەرۆکایەتی، لەبەر ئەوەی جەنگاوەرێکی گەورەی چەمکێکی ئاوایە و لەبەر ئەوەی لەئاستێکی بڵندا تێکۆشانی بۆ سۆسیالیزمێکی بەمرۆڤنگە کردووە، ئەم راستییانە باش دەناسێ، پارتی خۆی و شەڕی خۆشی باش دەناسێ. چونکە چل ساڵە شەڕێکی بەڕێوەبردووە کە رۆژێ هەزار جار تاقی کردۆتەوە. چۆن نەتانناسی، چۆن خۆتان دەشارنەوە؟ چۆن خۆتان بەرەو مردن رادەکێشن، یاخود خۆتان هەرزان دەژێنن؟ ئەمە چۆن پەسند دەکرێت؟ سەرۆکایەتیەکی وەها سۆسیالیست، مسۆگەر کەوتنە نێو رەوشێکی بەمرۆڤنگە پەسند ناکات و دەرفەتیش پێ نادات و بەشێوەیەکی بێ ئامان رادەوەستێ. ئەو سۆسیالیزمەی کە لە PKK دا پێکهاتووە. بەمرۆڤنگەیە.

ئیمرۆ ئیمپریالیزم کە سەرمایەداری ئەمریکا نوێنەری هەرە ناسراوێتی دەڵێ: سەرۆکی PKK "بێویژدانە" و " زۆرداره" بەمەش گوزارشت لە راستییەك دەكات. سەرمایەداری بێ ویژدانی و زۆرداری خۆی وەك نموونەی "دز و خاوەن ماڵ" ئاوەژوو دەکاتەوە، بۆ ئەوەی گەلانی جیهان وشیار نەبنەوە، بۆ ئەوەی ئیمرۆ جارێکیتر سۆسیالیزم دەبێتە موڵکی مرۆڤایەتی، بەهونەر و بەهرەیەکی گەورەی ساختەکاریەوە، بێ ویژدانانە هێرشمان دێنێتە سەر و دەیەوەێ هەموو لایەکمان لێ دابخا. ئەو تاوانانەی کە دەیداتە پاڵمان، لەبەر ئەوەیە کە PKK وەکو شێوە سۆسیالیستێکی نوێ مسۆگەر پێشکەوتن نیشان دەدات. ئەگەر نا لەبەر ئەوە نییە کە بەربەریەتی تورکیان زۆر خۆش دەوێت. ئەوانیش زێدە پابەندی فاشیزمی تورك نین. بەڵام لەسۆسیالیزمی PKK زیاتر دەترسن، لەبەرئەوەش دژایەتی ئێمە دەکەن. ئەو ئەڵمانیایە کە وەستایە لەشەڕ دژ بە سۆسیالیزم کاتی بەسەرماندا دێت، لەبەرئەوە نییە بەڕێوەبەرایەتییە بەربەرەکەی تورکیای خۆش دەوێت. هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سۆسیالیزمی PKK زۆر مەترسیدار دەبینێت بۆ خۆی.

کەواتــە ئــەو سۆســیالیزمەی کــە لــە PKK دا پێکهــاتووە لەپێوانــە گــەردوونی و " ئەنتەرناسیۆنالیست"ەکاندا جێگایەکی زۆر گرنگی هەیە.

سۆسیالیزم خۆی لەخۆیدا لە راستینە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییەکانماندا تاکە ئایدیۆلۆژیای زیندووکەرەوەیــە، بــەواتای کــارتێکردنی لــە گۆڕەپــانی نێونەتــەوەیی. ســەرمایەداری ئەمــە لەبەرامبەر خۆی بە مەترسی هەرە مەزن دەبینێ. هەربۆیــە رێکخراوێك یاخود پارتییــەکی هــەرە خــاوەن بانگەشــەیە کــە نیشــتمانپەروەری و ئەنتەرناسیۆنالیزمیشــی لەســەر بنــەمای سەرکەوتن بەڕێوەبردووە.

ئەوەی لەنێو پارتیدا ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزمی زۆر بەباشی بۆ خــۆی بەرجەســتە کــردووە و، ئــەوەی کــە ئەمــەی پێکهێنــابێ، وەکــو سیاســەتمەدار و ســەربازێکی تــەواو دەتــوانێ هــەموو کێشەیەکیش چارەسەر بکات و هەموو ئامادەکاریەکیش دەکات. پێویستە بنــەمای ئایــدیۆلۆژی خۆتان بەمجۆرە بەهێز بکەن. بەئەنــدازەی ژمــارەی پەنجــەکانی دەســت، ئەمــە لــەنێو خۆتانــدا دەرخەنە ڕوو، ئەو کاتە پێداویستی هەرە بنچینەیی و سەرکەوتنت پێکهێناوە. ئەوەی دەمــێنێ رێکخستنێکی تەکنیکییە، گەورەبوونێکی چەندایەتیە، کاتبەندییە.

ئەگەر هێزتان هەیە، بۆ ئەوەی ببنــە سۆسیالیســتێکی وەهــا و، تێکۆشــانێکی بــەردەوامی بــۆ بەڕێوەببەن، ئەوا بەسەرکەوتن دەگەن.

ئەوانەی ئەمە پەسند ناکەن و بەچەمکی وەك " ئەوەی بــێ ئایــدیۆلۆژیا بێــت لەمەســەلەی سەربازی باش تێگەیشتووە".

جوڵاونەتەوە، گەلێك کەسیان لــێ دەرکــەوتووە. ئەوانــەی بنــەمای سۆســیالیزمییان نــەبێت، ئەگەرچــی تێگەیشــتنی سەربازیشــیان هــەبێت، ئــەو کەســانە لــەهیچ شــتێك تێنەگەیشــتوون. هەڵوێست و هەڵس و کەوتی هەرە مەترسیدار لەم کەسایەتییەوە سەرچاوە دەگــرێ. ئەگــەر وا بڵێین، راستتر دەبێت، لەسیاسەت تێناگات، بەڵام لەپــراکتیك تێدەگات. لــەتیۆری بــاش تێناگــات، بەڵام لەشەڕ بەباشی تێدەگات. لەم خاڵەدا یەکسەر دەست و برد "وڵاخ" م بــەبیر دێتــەوە وڵاخ لەچیادا باش بەڕێوەدەچێ و رێگە دەبرێ، بەڵام وڵاخ تەنیا وڵاخە. رەشۆ ـ ناوی وڵاخێــك بــوو ـ وەك قارەمانێــك راگەیــەنرابوو. فەرمانــدەی گشــتی ســوپای تورکیــا، مەگــەر بەئەنــدازەی ئــەو دەبێ.

گەریلایەتی، بێ ئایدیۆلۆژی و سیاسەت نابێت.

پێمــان وایــە، زەمینــەی ئایــدیۆلۆژی و هــزری زۆری پێویســتە. ئــەو سۆســیالیزمەی کــە لــە PKK دا پێکهاتووە زۆر باش دەزانین کە بە چ واتایەك دێت. کاتێ لەمە تێگەیشتین، ئەو دەم زۆر بــە باشــی لەتێکۆشــانی نێــو پــارتیش تێدەگــەین. بەدڵنیاییــەوە لــەنێو پارتیــدا تێکۆشــانی سۆســیالیزم بەشــێوەیەکی شــکۆمەند بــەڕێوەدەبردرێت. ئــەوەش بــەڕێوەبردرا و، ئەرکــە

پراکتیکیەکان،سەربازییەکان تەنیا دەبنە کاری چەندایەتی و زەمانبەندی بۆ گەیشتن بە سەرکەوتنی یەکجارەکی. کاتێك خەباتگێرێك راستی سەرۆکایەتی بەم شێوەیە گرتبێتە دەست ئەوا لە هیچ کێشەیەکی سیاسی، سەربازیدا بێچارە نامێنێت و کۆسپیش ناناسێت. وەستای مەزنی سیاسەت و سەربازییە، تاکتیك دانەرێکی گەورە و لێهاتووە. دەتوانێ بەپێنج کەس، پێنج هەزار سەربازی دوژمن تەخت بکات. چونکە تاکتیك دانەرێکی بلیمەتە. دەتوانێ و بوێرە، ئەو سیاسەت و بنەمای سەرکەوتن بەرێوە دەبات. تەنیا خەباتگێرێکی سۆسیالیستی بەمشێوەیە هەبێت دەستی خۆی بوکامە کێشە ببات، ئەوا بەدڵنیاییەوە چارەسەری دەکات.

ئەگەر دەتانەوێ سەرکەوتن بەدەست بخەن. دەبێ پێش هەموو شتێك ببنە خاوەن چەمکێکی سۆسیالیستی وەها. هێزی هزر، ئیرادە و هەموو جۆرە ئامرازەکانی پەروەردە تەگبیر، تەندروستی، هێزی فیزیۆلۆژی و هتد هەمووی بەیەکەوە گرێدراون، ئایا لەخۆتدا کۆت کردۆتەوە. ئەگەر بەیەکەوە گرێدراون. ئایا لەخۆتدا کۆت کردۆتەوە. ئەگەر بەدبەختیەك نەبێ، وەکو هەموو کاتێ گوتوومە. ئەگەر بەردێك لەئاسمانەوە بەسەرت دا بەرنەبێتەوە و شتێکی دەرەوەی ئیرادەی تۆ رێگەت لێنەگرێ، ئەوا ئەو شتەی کە تەنیا پێویستیت پێ دەبێت هەناسە وەرگرتنە. تاوەکو ئەمە بەرێوە بچێ، سەرکەوتن دوای سەرکەوتن بەدەست دەهێنی. من ناتوانم ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزم بەتەنیا بکەمە موڵکی خۆم لەسەر ئەم بنەمایە ئەوەی کە لە بە PKK یی بوون تێگەیشتووم. ئەمەیە تاوەکو ئێستاکەش ئەوەی بەسەر خراوە، لەسەر ئەم بنەمایە بووە. پێویستە هیچ کەسێك بانگەشە نەکات کە " لەراستیدا وەها کارمان کرد وەهاش خەباتمان بەرێوەبرد، بەڵێ PKK بەمجۆرە پێشکەوت" دڵنیابە ئەوانە هەمووشی راست نین و ئەوانەی زیاتر لەوەی کە مەزەندەی دەکەی رێگایان بۆ دۆڕاندن خۆش کردووە تاوەکو رۆژی ئەمرۆشمان هۆکاری هەرە بنچینەیی سەرکەوتنەکان بۆ دەستپێکردنێکی بەمجۆرەی ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزم لەنێو PKK دا تا ئەمرۆکە و بەپێداگریەکی مەزن و بەرێوەبردنی تێکۆشانێکی مەزن، ئەنجامگیر بووە.

کاتێ کە راستینەی کۆمەڵایەتیمان بووە جێگای باس، ئەمە تاکە چارەیە. ئەوەی کە دەشمێنێ. هۆکارێکی ترسناکە بۆ لەدەستدان. بێگومان کەوتنە نێو راستەڕێ ئایدیۆلۆژیاکانی ترەوە خۆی لەخۆیدا بەواتای کۆتایی پێهاتن و لەنێوچوون دێت. راستی هەرە بنچینەیی و سەلمێنراویش ئەمەیە. ئەگەر خاوەن بانگەشەن، و لەشەڕدا بەبڕیارن و دەیانەوێ بگەن بەهەندێ سەرکەوتنی گرنگ، ئەوا ئەم سۆسیالیزمەی کە لە PKK دا پێکهاتووە جارێکی دیکە بەهەموو لایەنەکانیەوە، دەبێ بەشێوەیەکی راست و دروست لێی تێبگەن. دەبێ ئەمەش لەکەسایەتی خۆتاندا بەرجەستە بکەن. ئەگەر بکرێ لەنێو پارتیدا ئەم شەڕە هەمیشە و

داهێنەرانە بەردەوام بکەن. ئەگەر ئەمە جێبەجێ بکرێت، ئەوا مسۆگەر بە سەرکەوتنی یەکجارەکی دەگەین.

# فاشیزمی تورک بە هاوکاری سۆڤیەت پێشکەوت

**ئەم ریپۆرتاژە ماکارنیکۆڤایم لە رۆژنامەی "نۆڤۆڤێرما"وە لەگەڵ سەرۆکی نەتەوەیی سەرۆک ئاپۆ، ئەنجامیداوە.**

کاتێ باس لە روسیا و گەلی روسیا دەکرێت، ناکرێت بیر لە مەزنایەتی و شکۆداری شۆڕشی ئۆکتۆبەر نەکرێتەوە. هەرچەندە ئێستا لە خاکەکانی روسیادا داڕووخانێکی مەزن بەرچاودەکەوێت. گەلی روسیا، هەموو کاتێك بۆتە سەرچاوەیەکی مەزنی روناکی و ئیلهام وەرگرتن. هەربۆیە گەلی روسیا، گەلێکی مەزنە. لە مێژوودا و لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا گەلێك رۆڵی مەزن و گرنگی گێڕاوە.

ئێستا بە قۆناخێکدا تێدەپەڕین کە گەلی کوردستان لەگەڵ گەلی روسیا بەرەو زیاتر یەکتری ناسین دەچن. لە سەرەتای سەدە و لە رۆژی ئەمڕۆشماندا بە دەرککردن بە سیاسەتی فڕکردنی فاشیزمی تورك دەبێ سیاسەتە راستەکان ئاشکرا و دەستنیشان بکەین. تورکیا رۆژی ئەمڕۆمان هەم بۆ گەلی کوردستان و هەم بۆ گەلی روسیا کێشەیەکی گرنگ پێکدەهێنێت.

گەلی روسیا نوێنەرایەتی شۆڕشی مەزنی ئۆکتۆبەر دەکات. ئایا شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە ئەنجامی کام چەوتی و کەموکورتی کەوتە نێو ئەم رەوشەوە؟

پێش هەموو شتێك من خۆم بە سۆسیالیست دادەنێم. خۆی لەخۆیدا دەوڵەتە ئیمپریالیستەکان سەبارەت بە من دەڵێن:"ئەو سۆسیالیستەی کە بەتەنیا ماوەتەوە". تەنانەت ئەمریکا وەك "مەترسیدارترین مارکسیست ـ لنینیست لە دونیا" پێناسەی دەکات. ئەمریکا لە بەرامبەر سۆڤیەتەکان شەڕێکی دژواری بەڕێوەبرد و تاوەکو ئێستاکەش هەر بەڕێوەی دەبات. کەواتە ئێستا ئیمپریالیزم بەشێوەیەکی دژوارتر هێرش دەکاتە سەر ئێمە. بەڵام ئێمە ناکەوینە بەرامبەر ئەم ئیمپریالیزمە. چونکە نە لە میانەی ئامانجەکانماندا زەرەرمەندیەك دەرکەوت، نە سەبارەت بە سۆسیالیزم لە خەباتەکانمان دواکەوتنێك روویداوە.

ئێمە دەتەوێن هەم ئەزموونەکانی خۆمان پێشکەشی ئێوە بکەین و هەم لە ئەزموونەکانی ئێوە سوودمەند بین.

لە رۆژگارێکدا کە ئەگەر رۆسیا قەڵای سۆسیالیزم بوو و گەل لە ناخەوە پابەندی سۆسیالیزم بوون، ئەی بۆچی ئێستا کە نەفرەت لە سۆسیالیزم دەکات؟ لە روسیادا نوێنەرایەتی سۆسیالیزم و رۆشنگەری مەزن دەکرا. ئاخۆ هۆکارەکانی داروخانێکی بەوجۆرە و تەنگەتاوبوونی گەل بەم ئەندازەیە لە پای چییە؟

من هیچ کاتێك لایەنگری پارتی کۆمۆنیستی تورکیا نەبوومە و تەنانەت لە نزیك بوونەوە لەو پارتییە خۆم بەدوور دەگرت. چونکە شێوازەکانی ژیانیان ئەوە نەبوو پەسند بکرێ.

لە1970کاندا لە کەسایەتی ئەواندا یەکێتی سۆڤیەتەکان و تەنانەت کەموکورتیەکانیشیم دەبینی. لە ژێر ناوی "ئەنتەرناسیۆنالیزم" یەکێتی سۆڤیەتەکان بە ساڵان هاوکاری TKP(پارتی کۆمۆنیستی تورکیا)ی دەکرد. دەتوانین لەساڵانی دامەزراندنی کۆماری تورکیادا، هاوکاریکردنی ئیمپریالیزم بۆ جوڵانەوەی موستەفا کەماڵ واتایەکی پێبدەین. بەڵام بەو قۆناخەدا بۆ پێشکەشکردنی هاوکاری لە ئاستی تاکتیکیدا، کە دواتر گۆڕا بۆ ستراتیژی دەوڵەتی سۆڤیەت، واتایەکی پێنادەین.

پێم وایە لە هۆکاری دیکەی هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت، بۆ ئەو هاوکاریانە دەگەڕێتەوە کە پێشکەش بە تورکیا کرا و دواتریش گۆڕا بۆ سیاسەتی دەوڵەت. ئەگەر نزیکبوونە تاکتیکیەکان بۆ ستراتیژی وەرچەرخێ و لەئایدیۆلۆژیادا لادان دەست پێبکات، ئەوا مامەڵەکردن لەگەڵ دونیا و ئەو سیاسەتەی پەیڕەو بکرێ، لەو چوارچێوەیەدا بەڕێوەدەچێ.

نزیکبوونەکانی لینین لە مستەفا کەمال تاکتیکی بوو. بەڵام ستالین ئەم تاکتیکەی بەشێوەیەکی زۆر دایە پێش و کردیە سیاسەتی دەوڵەت. لەسەر ئەم بنەمایە، نەخۆشییەکان قووڵبوونەوە و سۆسیالیزم گەلێك شتی لەدەست دا. بێگومان ئەم هاوکارییە تاکتیکیە کە دواتر وەرچەرخێنرا بۆ هاوکاری ستراتیژی، بۆ گەلی کورد یەکجار گرنگ بوو. چونکە لێرەدا قڕکردنی گەلی کورد و ئەو جولانەوە کۆکوژییەك کە لەلایەن فاشیزمی تورك پێکهات، لە ئارادایە.

گەر سەرنج بدرێ، مستەفا کەمال رۆژ لە دوای رۆژی بەرەو فاشیست بوون دەچوو و لە تورکیادا رژێمێکی فاشیزمیانە پێکدەهات و ئەمەش لەمیانەی ساڵانی 1940دا، بە هاوکاری سۆڤیەتەکان پێکدەهات.

لەنێوان ساڵانی 1925ـ 1940 دا سەرتاپای کوردستان قۆناخی یاخیبوونەکان بوو، بەهاوکاری ئیمپریالیزم سەرجەمی ئەم یاخیبوونانە لەلایەن مستەفا کەمالەوە بە ئەنجامدانی کۆکوژی بێ ئامان سەرکوت کران. لەلایەکەوە گەلێك بە رێگای کۆکوژیەکانەوە لەنێودەبردرێ، لەلایەکی دیکەش، مستەفا کەمال لە هەڵپەی ئەوەدا بوو خۆی وەکو دۆستێك هەم بۆ سۆڤیەتەکان و هەم بۆ ئیمپریالیزم، نیشان بدات. لە هەر دوو لایەنیش گەلێك هاوکاری مەزنی بەدەست خست. لەهەمانکاتدا بۆ رەخساندنی هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزم لە ساڵانی 1920 ـ 1921 دا مستەفا کەمال ویستی لەگەڵ ئینگلیزەکان رێککەوتن ببەستێ. دواتر لە ساڵی 1921 بە نانەوەی پیلانگێڕییەك 15 ئەندامی TKP لە سەرووی هەمووشیانەوە مستەفا سوبحی کوشت. بە هاوکاری سۆڤیەتەکان مستەفا کەمال لەسەرووی هەمووی ئەوانە دێت کە لە دونیادا زەبری هەرە مەزنی لە سۆسیالیزم وەشاندووە، دوژمنایەتی مستەفا کەمال بۆ سۆسیالیزم لەماوەی دواتر زۆر بە روونی دەرکەوتۆتە روو. خۆیلەخۆیدا هەر لە سەرەتاوە دوژمنێکی گەورەی سۆسیالیزم بوو. پیاوی هەرە تایبەتی ئیمپریالیزم و ئینگلیزەکانە. تاوەکو ئەمرۆ ئینگلیزەکان نرخ و بەهایەکی گەورە بە مستەفا کەمال دەدەن. هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە مستەفا کەمال لە ئەنادۆلدا زەبری لە سۆسیالیزم وەشاندووە.

جولانەوەی مستەفا کەمال بۆ دەوڵەتە ئیمپریالیستییەکان بنچینەیەکی ئامادە کرد ، سۆسیالیزمی چەقبەست کرد.

هیچ کەسێك هێندەی مستەفا کەمال گەمەی بە سۆسیالیزم نەکردووە.

ئـەمرۆ هێشـتان سیسـتەمی ئیمپریـالیزم ـــ سـەرمایەداری یـاری بـە گـەلان دەکـات و بـە شێوەیەکی خوێناوی داخوازیە هەرە بچووکە دیموکراسییەکانی گەلان سەرکوت دەکات. بۆچی ئیمپریالیزم بەم ئەندازە گەورەیە یاری بە گەلان دەکات؟ چونکە لـە سۆسـیالیزم دەترسـین و بۆ ئەوەی لە دژی سۆسیالیزم ڕێککەوتنێك ببەستێ، یاری بە گەلان دەکەن.

کۆماری تورکیا، لە راستییدا لە ساڵانی دامەزراندنی یارمەتی لە تەواوی وڵاتە ئیمپریـالیزم ـ سەرمایەدارییەکان وەردەگرت و، ئەم یارمەتیانەش تاوەکو ئەمرۆ بەردەوامە. چونکە لە دژی سۆسـیالیزم شـەڕی هـەرە گـەورەی بـەڕێوەدەبرد. لـە کاتێکـدا تـەواوی ئەمانـە جێبـەجێ کـرا، لەلایەکەوە ئامادەکاری بڕیاری مردنی کوردان دەکرا و لەلایـەکی دیکەشـەوە هـەمان سیاسـەتی لەسەر گەلە چەوساوەکان پەیڕەودەکرد. گریکەکان و ئەرمەنیەکانی تـەفروتونا کـرد و گـەلێك کولتووری تواندەوە (ئاسیمیلە کرد). تەواوی ئەمانە بە رادەیەك بە یارمەتی یەکێتی سۆڤیەت ئەنجامدرا.

من زۆر بەباشی کۆماری تورکیا دەناسم. فاشیزمی تـورك، رووسـەکان وەکـو دوژمـنی هـەرە گەورەی خۆیان دەبینن. تەنانەت دەڵێن:"لە دژی روسەکان شـەڕ بکـەین". لـە راسـتییدا ئەمـە راستەوخۆ لەدژی روسیا، جێبەجێکردنی ڕێککەوتنێکە.

لـەدژی روسـیا، لەسـاڵانی دامەزرانـدنی کۆمـاری تورکیـا، ئـەو ڕێککەوتنانـەی لەگـەڵ ئیمپریالیزم پێشیخست سنووردار بوو. کەچی ئێستا ئـەم ڕێککەوتنـە گـەلێك پێشـخراوە. ئـەم شێوە ڕێککەوتنانە زەرەری گەورە بە گەلان دەدەن. لە رابردوودا دەوڵەتێك بوو؛ کەچـی ئێسـتا بوونەتە پێنـج ـ شەش دەوڵەت. واتە سۆڤیەت حـەوت دەوڵـەتی کـردە دیـاری بـۆ ئیمپریـالیزم، ئەمەش ناکۆکییەکی گەورەیە. کەواتە زەبری هەرە گەورەی لەوانەوە پێدەگات.

لەراستیدا گەلی روس گەلێکە کە هەر خۆی زیـانی بـە خـۆی گەیانـدووە. هەنـدێ کەسـێتی وەها هەن، وەکو بڵێی بـۆ کۆمـاری تورکیـا خـولقێنراوە. لـە تورکیـادا بـاڵوێزێکی روس هـەبوو، دواتـر بریکـاری وەزیـری کاروبـاری دەرەوە. هـەموو سـاتێ لەشـێوەی "چـۆن دەتـوانم هاوکـاری تورکان بکەم" هەڵسەنگاندنی دەکرد و دەیگوت: "من دەچمە مۆسکۆ، چـەندە مـاڵ و خـانووی PKK هەبێ، هەموویان بەلاوە دەنـێم". ئێمـە نـە لـە مۆسکۆ ماڵمان هەیـە و نـە پەیوەنـدی بـەهێزمان هەیـە. هەنـدێ هـەڤاڵی ئێمـە هـەن، دەتـوانین لـەماوەی 24 کاتـژمێردا لـەوێوە بیانکێشینەوە. بەڵام ئـاخۆ بـە چ لۆژیکێك ئـەم هەڵسـەنگاندنانە دەکـات؟ ئـەو بەرپرسـیارێکی دیپلۆماسییە. دەتوانین لەسەر ئەم بابەتانەی دەست نیشان کران، بـە یەکـەوە گفتوگۆ بکـەین.

لەراستییدا ئەم ڕێپۆرتاژە کە لە ڕێگەی ڕۆژنامەکەتانەوە ئەنجام دەدرێت، ریپۆرتاژێکە لەگەڵ گەلی ڕۆس. ئەگەر بەقووڵی بەیەکەوە کێشەکان تاوتوێ بکەین، ئەوا بۆ گەلان، ئەمە شتێکی باشی لێ بەرهەم دێت.

**ماکارینکۆ ڤادیم:** گەلی ڕۆسیا، گەلێکە کە هەرە زێدە لەنێو هەڵکشان و داکشاندا ژیاوە. لەراستییدا ڕەوشی هەنووکەی گەلی ڕوسیا گوزارشت لە تراژیدیایەکی گەورە دەکات. دوای قۆناخێکی درێژ گەلی روس حکومەتی خۆی دامەزراند. دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر ڕۆژێکی نوێ لەدایك بوو و لەکاتێکدا پێویست بوو گەل بەرز بکرێتەوە، لەناکاو گەل ڕووبەڕووی کێشەی گەورە بۆوە. ئەو سیاسەتە ئێمە پەیڕەومان کرد، چەندە ئاڵۆز و تێکچڕاوە، ئێوە زۆر بەجوانی روونتان کردەوە. بۆ ئەوەی حکومەت بەشێوەیەکی تۆکمە دابمەزرێنرێ، دەبوو خەباتەکانی بەشێوەیەکی بەهێز بووایە، بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانە، پێویستی بە کادیری بەهێز هەبوو.

لەدوای مردنی لێنین، لەنێو پارتی کۆمۆنیست دا گۆڕانکاری مەزن هاتەکایەوە. ناکۆکییە ئایدیۆلۆژییەکان زیاتر دەرکەوتە ڕوو، ئەو تاکتیکانەی پێشخران، خزمەتی ستراتیژیان نەکرد. لە هەندێ مەسەلەدا کرانەوە ئەنجام درا، ئابووریەکی بەهێز پێکهێنرا. بەراستیش گەلەکەمان لەشەڕی دووەمی جیهانیدا هەڵوێستێکی بەهێزی لەدژی فاشیزم نیشاندا. گەلەکەمان خواستی گەلێك نرخ و بەها بپارێزی. لەدژی فاشیزم بە ملیۆنان قوربانی پێشکەش کرا. هەر گەلێك ناتوانێ هەروا بە ئاسانی ئەم قوربانیانە ببەخشێ. مرۆڤ بۆ ئەوەی کە ئاسن بگەیەنێتە ئاستی بەکارهێنان، هەوڵ و تەقەلایەکی گەورەی پێویستە.

دوای ئەوەی لە ئایدیۆلۆژیادا قەرەبوو (تعويض) درا، لە ئاستی پێشەنگایەتی کردنی سۆسیالیزمدا زیاتر بەلای ریفۆرم شکانەوە، ڕوویدا. زۆر بەچڕوپڕی قسە لەسەر کۆمۆنیزم کرا، بەڵام بۆ دوورکەوتنەوە لە ئایدیۆلۆژیا، کۆسپیان دانەنا. کاتێ لە ئایدیۆلۆژیا دوور کەوتەوە، لەرێلادانی جیاجیاش کەوتە نێو ڕۆژەڤەوە، بەمجۆرەش هەڵوەشانەوە و پەرتەوازەبوونی یەکێتی سۆڤیەت هاتە ئاراوە.

بەرژەوەندی تاکەکەسیەکان لەپێش بەرژەوەندیە کۆمەڵایەتییەکان دانران. هەموو کەسێك دەیخواست دەوڵەمەند، بەهرەمەند، ناودار بێت. هەندێ کەسیش کە بەو ئامانجانە گەیشتن، زەبری گەورەیان لە گەل دا. سەروبەندی ژیانی ئێمە بەرادەیەك بەمجۆرە تێپەڕی.

ئەمڕۆ لەنێو تەنگژەیەکی گەورە دایە. من لەو باوەڕەدام کە لەنێو گەلی روسیادا هێزێکی گەورە هەییە و ئەم هێزەش رادەبێتە سەرپێیان. هەرچەندە ئالۆزی مەزن لەئاراشدا بێ، دیسانیش بەهێزترین دەوڵەتە. تا ئێستاکەی بەهێزی گەوهەری خۆی لەسەر پێیە.

دووبارە سەبارەت بە هەڵوەستەکردن لەسەر پەیوەندی روسیا لەگەڵ تورکیا، دەکرێ هەندێ لایەنی دیکەشی ببینرێ و پەنجەی بۆ رابکێشێنرێ لەراستیدا لە ساڵانی 1920دا پەیوەندییە تێکچڕژاوەکانی نێوان روسیا و تورکیا، کت و مت پەیوەندی لەگەڵ ئەڵمانەکانیش بەر لە شەڕی دووەمی جیهانی لەئارادا بووە. پەیوەندی لەرووی ئابووری و لە رووی سەربازی جێگەی باس بوونبۆ نموونە قوتابخانەی هارپی خوێندکارانی ئەڵمانیا، فێرکردنیان لە روسیادا ئەنجامدەدرا. دوای ئەوەی شەڕ دەستیپێکرد، دەرکەوتە روو کە ئەم سیاسەتە چەوت بووە.

تورکیا مافی ئەوەی نەبوو لەشەڕی دووەمی جیهانی لەگەڵ ئەڵمانیا لەپشتەوە لە ئێمە بدات. ئەوەی راستی بێ لەوە ئاگادارین کە ماوەیەکی درێژ تورکیا دەتەوێ روسیا گەمارۆ بدات. هەربۆیە لەم بابەتەدا ئێمە و ئێوەش خاوەنی هەمان نزیکبوونین.

کاریگەرییەکانی سیاسەتی نەتەوەپەرستیانەی ستالین تاوەکو ئەمڕۆ، بەردەوامە. گەل دەربەدەر دەکرێن و کۆکوژی ئەنجام دەدرێن. سەقامگیرکردنی ئەم سیاسەتە چەوتە لەنێو گەلدا ، لە نزیکبوونە وە لە کوردانیش خۆی دەردەخاتە روو. هەڵبەتە ئەمە رەفتار و هەڵوەستەیەکی (پۆزسیۆن) راست نەبوو.

لێرەدا دەمەوێ دەست بە پرسیارکردنی خۆم بکەم، بەو رادەیەی کە من بینیومە، شەڕی گەریلایی ئەمڕۆ لە کوردستاندا بەرهەمەکانی خۆی دەدات. لە رۆژی ئەمڕۆماندا پێهەڵگرتنی تێکۆشانەکەتان چۆنە.

**عەبدوڵڵا ئۆجەلان:** هەڵبەتە نەناسینی گەلی کورد، تاوەکو ئەمڕۆ لەلایەن گەلی روس گەلێك هۆکاری گرنگ هەیە. گەلی کورد لە مێژوودا وون بووبوو و ئەمەش گوزارشتی خۆی لەمەوە دەبینێتەوە کە هەموو کەسێك ئومێدی زیندووبوونەوەی بەو گەلە بڕیبوو و، گەلێك کە زۆر سیلیك (Silik) بوو. خۆی لە خۆیدا بەم رەوشەی کە تێیدا بوو نەدەکرا ژیانێکی نوێ قازانج بکات. چونکە گەلێك بوو کە خاوەنی راستییەك بوو، ئەویش لەنێو گەلانی دیکەدا رووبەڕووی توانەوە بووبۆوە. هەربۆیە هەرکەسێك هیوای خۆی لەدەست دابوو.

هیچ کەسێك لە سەرەتای دەرکەوتنی جولانەوەکەمان، نەیدەخواست باوەڕی بە ئێمە بهێنێ. لەو رۆژگارەدا من تەنیا بووم. بگرە میراسێکی میللی و بونیادێکی چینیش لەئارادا

نـەبوو. بەسـالان مـن بـە تـەنیا بـووم. هەرکـەس دەیگوت:"نـاکرێ تـۆ ئـەم مرۆڤانـە زینـدوو بکەیتـەوە". ماوەیـەکی درێـژ بـەمجۆرە بـەردەوام بـوو. گروپێـك هـەڤاڵم هـەبوو و، ئـەوانیش باوەڕییـان نـەدەهێنا. تەنانـەت تـاوەکو سـاڵانی 1980 و سـاڵانی 1990، هـەڤالان و، گـەلیش تێڕوانینیان لەم چوارچێوەیەدا بوو. دوژمنـیش باوەڕی بـەوە نـەبوو کـە ئێمـە سـەردەکەوین. هەر بە تەنیا هەوڵ و تەقەلامدا کە ئەم شەڕە بەڕێوەببەم. دواتر دەرك بەوەکرا کە ئەم شەڕە گەشە دەسێنێو هەوڵدرا بنەماکانی گەریلا لە وڵاتدا دابنرێت. دەست بە سەرهەڵدانەکانی گەل کرا. رۆژ لەدوای رۆژ لە گەورەبووندا بوو. بـەکورتی دامەزرانـدنی پارتیمان، زێـدە هاوشـێوەی دامەزراندنی پارتە سۆسیالیستە کلاسیکەکان، نییە.

یەك پێهەلگرتنم، کت و مت وەکو پارتی کرێکارانی سۆسیال دیموکراتی روسیایە کـە لـە ساڵانی 1898 بە نۆکەسەوە دەستپێکرد. منیش لەگەڵ 9 هەڤاڵ دەستم بە خەبات کـرد. لـە دەرەوەی هەڤاڵێتیمان، هیچ کامێکمان ئامادەکاریەکی دیکەی نەبوو. لـە رووی ئایدیۆلۆژیشـەوە هیچ ئامادەکارییەکمان نەبوو.

بە دوو ووشە دەستمان بە تێکۆشان کـرد. وتمان:"کوردسـتان وڵاتێکی کۆلـۆنیکراوە و گـەلی کورد گەلێکی ستەملێکراوە. دەبێ ئەم گەلە ببێتە خاوەن وڵات". سەبارەت بە مافەکانی مـرۆڤ هەندێ پەرتووکم خوێندبووەوە. بەڵام زێدە قاڵ نەبووبوومەوە. لەو قۆناخـە ئـەوەی بـۆ مـن گرنگ بوو، ئە وە بوو کە بە جەسارەتێکی مەزنەوە پێکهێنانی گروپێك بوو. کـت و مـت وەکـو پـارتی کرێکـارانی سۆسـیال دیمـوکراتی روسـیا، لـە نێـوان سـاڵانی 1898 تـاوەکو 1903 نـاوی هـەبوو، کەچـی خـۆی لـە ئـارادا نـەبوو. بنـەمانی ئێمـە لاوازتـر بـوو. گەلەکـەمان خوێنـدن و نووسینی نەدەزانی. رۆشنبیری نەبوو. هەربۆیە گشت خەباتەکانم بـە تـەنیا بـەڕێوەدەبرد. بـۆ لەنێو بردنی ئێمە تەواوی دونیا یارمەتییان پێشکەش بە کۆمـاری تورکیـا کـرد. بـەڵام ئـەمڕۆ کەم تا زۆر ئیدی لەوە تێگەیشتوونە کە لەرێگای سیاسەتی قڕکردن، ئەمریکا و ئەڵمانیا بۆیـان ناکرێ ئێمە لەنێو ببەن. ئیدی ناکرێ گەلی کورد لـەرێگای کۆکوژیـەکان لـەنێوببردرێ. ئـەمڕۆ هەموو کەسێك ژیانەوە و بەرزبوونەوەی گەلی کورد پەسند دەکەن. خاڵی هەرە گـرنگ شـەڕی ئێمە گەلێك شتی سەلماندووە.

بەڵکو هێشتا بە تـەواوەتی رزگـاربوون پێکنـەهاتووە، بـەڵام گـەڕانـەوە بـۆ ژیـان بـەرجەسـتە بووە. پێویستە کێشەی کورد بەگوێرەی قۆنـاخ، دەرکـی پێبکـەین. پـێش ئـەوەی بـە رزگـاری و سەربەخۆیی بگەین، پێویستی بە ژیانەوە هەبوو. چونکە گەلێك بوو کـە رەگ و ریشـەی وشـك کـرا بـوو، دەمارەکـانی ژیـانی قـوت کرابـوو. هـەر تـەنیا یـەك ــ دوو دەمـاری مـابوو کـە وشـك

نەبووبوو. بۆ ئەوەی سەوز ببێتەوە، ئاودانێکی زۆری پێویست بوو. بەڵێ، ئەوەی ئێمە ئەنجامماندا، بەرادەیەك سەوزکردنەوەی بوو.

قۆناخ بەرەو رزگاربوون هەنگاو دەنێ. ئێستا لە قۆناخی رزگارکردنی وڵات و گەلداین. ئەگەر بەمجۆرە خەباتەکانمان بەرێوەببەین، رووەوە رزگاربوون هەنگاوی مەزن دەهاوێژین.

**"پرسیاری (چۆن بژین) بۆ گەلی رۆسیاش پێویست دەکات"**

**ماکار نیکۆ ڤایم** ــ باشە تەواوی ئەمانەت چۆن سەرخست؟ سەرلەنوێ ژیاندنەوەی گەلێك، چۆن ئەنجامدرا؟

**عەبدوڵلا ئۆجەلان** ـ تەواوی ئەمانە، ئەو شتانە نین کە بە ئاسانی و سادەیی بەدەستخراون. گەلی کورد گەلێك بوو کە باوەڕی بە خۆی نەمابوو، گەل لەلایەکەوە، تەنانەت هەڤاڵەکانیشمان دەیانگوت "ئێمە قورتار نابین". ئەرکی هەرە گەورەم ئەوە بوو کە سەرەتا ئەو راستییە بسەلێننین ئەم کۆمەڵەیە (کۆمەڵگایە) گەلە و دواتر تێگەیاندنی. ئەمەمان سەرخست و قازانجمان کرد. لەنێو پارتیشدا پێویست بوو هەر هەڤاڵێك ئەم سەرکەوتنە شایستەی خۆی ببینێ. گەل لەو مردوانە دەچوو کە لەسەر پێ وەستابن. پارتیمان ئەمەی سەلماند.

لەنێو گەل و پارتیدا، گەورەترین کێشەی ترمان پرسیار و کێشەی "دەبێ چۆن بژین" بوو. لە سەردەمێکدا بۆ گەلی روسیش ئەم کێشەیە گرنگ بوو. چەرنۆڤیسکی پەرتوکێکی هەبوو بەناوی "دەبێ چی بکەین"، ئەو بەرتووکە بە رادەیەك باسی رەوشی ئێمەی دەکرد.

ئێستا ئەو کێشە گەورەیەی کە هەڵسەنگاندنی لەسەردەکەم، کێشەی "دەبێ چۆن بژین"ە.

چونکە هەڤاڵان و گەلەکەشمان پێداویستی "چۆن بژین" نازانن. ئەوەی ژیان نەناسێ، شەڕیش ناناسێ. لەوانەیە ئێستا گەلی روس پێویستی بە پرسیارکردنی ئەم پرسیارەی نەبێ. بەڵام بۆ ئەوان، لە ساڵانی نێوان 1870ـ 1980 ئەم پرسیارە بۆ ژیانێکی ئازاد، زۆر گرنگ بوو. لە راستییدا بۆ گەلی ئێستاکەش پرسیاری "چۆن بژین" زۆر گرنگە و لەجێی خۆیدایە.

سەبارەت بە ژیان تا دوارادە دەرگاکانی مان کردەوە. کلیلی ژیانمان بەدەست خست. پێویستە ئەمە لەنێو پارتی سۆڤیەتیش، بەباشی دەرکی پێبکرێت.

پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت، خاوەنی دووەمین دەوڵەتی جیهانە. ئەمریکا لە کاتێکدا لەدژی سۆڤیەتەکان شەڕدەکات، لە دژی ئێمە ئەڵمانیا و ئینگلیزەکانیش لە پشت خۆی کۆدەکاتەوە و سێ ئەوەندە شەڕ دەکات. تەنانەت بە یارمەتی سۆڤیەتەکانەوە داگیرکەری تورك لە دژی ئێمە شەڕ دەکات. بەڵام وێڕای تەواوی ئەمانە، پارتیمان سەرکەوتنی بەدەست هێنا. رێگای ژیان

کرایەوە، بەرەو ژیانی ئازاد ڕێگایەکی ڕاست دەگرینە بەر. پارتیمان ڕۆژلەدوای ڕۆژ، بەشێوەیەکی گەورەتر ڕێگا دەبڕێ. گەلێك جار هەوڵدرا لە ناوەوە و لە دەرەوە پاکتاو بکرێین، بەڵام وێڕای تەواوی ئەمانە، ئەمڕۆ پارتیمان پارتییەکی شکۆمەندترە. ئەگەر بەو شێوازە درێژە بە تێکۆشان بدات، ئەوا پارتیمان کاریگەری و ڕەنگدانەوەی مەزنتر لە دونیادا پێکدەهێنێ.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ـ من، بەش بە حاڵی خۆم دەرك بە خەباتەکانی ئێوە دەکەم. پێشخستنی تەواوی ئەم شتانە، بەوڕادەیە، ئەوە نیشان دەدەن. دیارە نەك تەنیا لەڕووی ئایدیۆلۆژیا، لە بوارەکانی دیکەشدا بەهێز بوونە. ئەو پرسیارانەی کە دەیکەم، کەی سەردەکەون؟ چۆن دەسەڵاتی کوردستان بنیات دەنێت؟ ئایا دەیانەوێ حکومەتێکی سەربەخۆ دابمەزرێنن، یاخود فیدراسیۆن؟

**عەبدوڵلا ئۆجەلان** ـ کێشەی دامەزراندنی دەوڵەت، کێشەیەکی سیاسی و بەدەسەڵات بوونە. ڕەوشی گەلەکەمان، وەکو ڕاستی گەلانی دیکە نییە. بۆ ئێمە سەرلەنوێ گەڕانەوەی گەل بۆ ژیان گرنگە و ئەمەش جێبەجێدەکرێت. هەرچی ئێستاکەیە کێشەیەکی بەدەوڵەتبوونمان هەیە. کێشەی کورد کێشەیەکی سەربەخۆیی نییە. لە ڕۆژهەڵاتی ناوین لەنێوان تورك، عەرەب، فارسەکاندا دابەشکراوە. لەسەر کوردان بەیەکەوە سیاسەتێکیان بەڕێوەبردووە. هەروا بە ئاسانی دەرفەت بەوە نادەن دەوڵەت دابمەزرێنین، بەتایبەت تورکەکان، بەڵام ئێستا گەلێك پێشکەوتنی بەرچاو هەیە. لەنێوان خۆیاندا ڕووبەڕووی گەلێك ناکۆکی بوونەوە و هەر خۆشیان ناتوانن ببنە هێزی چارەسەری. ئێران ـ ئێراق، تورکیا ـ ئێران، تورکیا ـ سوریا لەنێوان خۆیاندا نابنە یەك یەکناگرن. هەربۆیە ڕەوشە دەرەکییەکان، هەندێ توانستی بابەتی پێشکەش دەکەن و، لە ناوەوەشدا شەڕی گەریلا پەلوپۆی هاوێشتووە و ڕەگ و ریشەی داکوتاوە. گەل تا دواڕادە یارمەتی دەکات. لە گۆڕەپانی سیاسیدا ئەگەربە تەواوەتی دەوڵەتیش نەبێت، ئەوا بۆ دامەزراندنی نیو ـ دەوڵەت، یەکجار لەبار و ڕەخساوە. دەکرێ ئەمە لەشێوەی فیدراسیۆنیش پێکبێت.

لە سەرەتادا کوردان لەشێوەی فیدراسیۆن دەتوانن لەڕۆژهەڵاتی ناوین ڕۆڵبگێڕن و شێوەی فیدراسیۆن لە باشووری کوردستاندا بەڕادەیەك پێکدێت. بەڵام لە باکووری کوردستاندا، بە شێوەیەکی لەناو یەکدیدا، پێش دەکەوێ. ناکرێ لە کوردستانی ژێر دەسەڵاتی تورکیا، بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە باشووری کوردستان هەنگاو بەرەو پێکهاتەیەکی فیدراسیۆنی بهاوێژرێ. پێویستە لەهەر پارچەیەکدا بەشێوەیەکی پەیوەست بەیەکەوە فیدراسیۆن پێشبکەوێت. هەرچی کێشەیەکی دیکەیە، ئەوەی کە لەرابردوودا تورکیا باشووری کوردستانی لەنێو سنوورەکانی میساقی میللیدا نیشاندەدا. هەربۆیە لەنێو تەواوی کێشەکانی باشووری کوردستان،

تورکیاش هەبوو. ناکرێ هەر پارچەیەك لەنێو خۆیدا رێکبخرێ. لەبەرئەمەیە یان ئەوەتا نکۆڵی لە هەر چوارپارچە بکەن، یان پەسندی بکەن. وێڕای ئەمەش ناکۆکییەکان دەردەکەوتنە روو.

لێرە بەدواوە، بە تایبەت لەباشووری کوردستان دەتوانین بەرەو بەدەوڵەتبوون هەنگاوی بەرچاو بهاوێژین. ئەگەر لەهەر پارچەیەکی کوردستاندا لەڕووی بەدەوڵەتبووندا بەهێزیش نەبێت، ئەوا لە پارچەی باشووردا شۆڕش پێکدەهێنین. لە بناری زاگرۆس، لە کەناری رووباری دیجلە و بەهۆی ئاوی بۆتان لەرێگای فەڵەمبازێك لە تواناماندا هەیە خەباتەکانی بەفیدراسیۆن بوون بەهێز بکەین. لەوانەیە لە باشووری کوردستاندا زیاتر شەڕ چڕ ببێتەوە. ئەم بڕیارەمان رۆژلەدوای رۆژ تۆکمەتر دەبێت. لەم رووەوە ئامادەکارییەکانیشمان بەردەوام دەکات. ئامانجی نزیکمان فیدراسیۆنی دیموکراسییانەیە. خەباتێك نییە کە چەندین ساڵانە لە خۆوە بگرێ، بەڵکو لەنێو چەندین مانگێکدا دەتوانین جێبەجێ بکەین.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ـ ئەوەندەی تێگەیشتم، دەیانەوێ لەگەڵ ئێراق، تورکیا و ئەوانی دیکەش بەرەو فیدراسیۆن هەنگاو بنێن.

**عەبدوڵا ئۆجەلان** ـ راستە، بۆ نموونە، روسیاش دەوڵەتێکی فیدرالیە. ئێمەش دەتەوێن لە رۆژهەڵاتی ناویندا فیدراسیۆنێك گەشە پێبدەین. دەکرێ لە رێگای فیدراسیۆنەوە ئەو گەلانەی لە دەورووبەری کوردستانن ببنە یەك. فیدراسیۆن و بەدەوڵەتبوون، هەنگاوێکی بچووك نییە و ئەگەر دیموکراسی بەرقەرار بێت، ئەوا وەکو دەوڵەت رۆڵی خۆی دەگێڕێ.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ـ باشە ئەمڕۆ، لە گۆڕەپانی نێو دەوڵەتیدا چ رۆڵێك دەگێڕن؟ پارتیتان چاوەڕوانی لە جیهان چییە؟

**عەبدوڵا ئۆجەلان** ـ پێش هەموو شتێك گەلانی جیهان چۆن دەژین، ئەوا دەتەوێن گەلی کوردیش بەوجۆرە بژی. دەبێ تەواوی ئەو قانونانەی کە بۆ مافەکانی مرۆڤ و مرۆڤایەتی دانراوە. بۆ ئێمەش پێك بهێنرێ. گەلێك شت دەگوترێ، کەچی لە پراکتیکدا هیچ هەنگاوێك نانرێ.

شەڕی ئێمە کاریگەری لەسەر سیاسەتی دەوڵەتەکانی جیهان کردووە. ئەگەر شۆڕشەکەمان سەربکەوێت، ئەوا گۆڕانکاری تەواو بەسەر پێگەی تورکیا، ئێراق و ئەوانی دیکەش دەهێنێت. کاریگەرکردنی ئەمانە، بە واتای کاریگەر کەردنی لەسەر سیاسەتەکانی جیهان دێت. ئەمڕۆ کوردستان گرێکوێرەی رۆژهەڵاتی ناوینە. ئەگەر ئەم کێشەیە چارەسەر بکرێت، ئەوا گەلێك کێشە دەردەکەونە روو. رۆڵێکی ستراتیژی دەگێڕێ. لە رابردوودا گەلێك دەوڵەت کوردانی بەکاردەهێنا. بەگوێرەی خۆی لەسەر کوردان گەمەی دەکرد. بەڵام ئێستا کوردان دەبنە خاوەن

ستراتیژیەك و ئەمەش گەورەتر دەبێت. ئەگەر ئەم هەنگاوەی ئایینـدەمان سـەركەوتووانە بێت، بۆمان دەكرێ لە خۆرهەڵاتی ناویندا رۆڵێكی گەورە بگێرین. ئەمریكا لەم رەوشەدا كەوتۆتە نێو لێكدانەوەی قووڵ. ئیدی وەكو رابردوو كێشەی فەلەستین گرنـگ نـابینێ و ئێستا دەڵێ: "كێشەی كورد، كێشەیەكی زۆر گەورەیە". بەرادەیـەكی زۆر سـەرنجی خـۆی خستۆتە سـەر ئـەم كێشەیە. چونكە خاڵی كلیلی پەترۆل، ئاو و هەرسێ گەل كێشەی كورد پێكدەهێنن. شۆڕشەكەمان لـەم بابەتانەدا هەنگاوی بەهێز دەنێ. كێشەی پـەترۆڵ و ئـاو تـەنیا كێشەی رۆژهـەڵاتی نـاوین نییـە بەڵكو لە جیهاندا سەرەكیترین كێشەیە.

**"روس و كوردان بەیەكەوە دەتوانن فاشیزمی تورك بوەستێنن"**

**ماكـار نیكـۆ ڤـایم** ـ سـەرۆكی بـەڕێز، ئایـا تێـڕوانینی رووسـەكان بـۆ كـوردان چـۆن لێكدەدەنەوە؟ بە سیاسەتێكی ستراتیژی چۆن، دەتوانرێ گەلانی روس و كورد بكرێتە یەك؟

**عەبدوڵا ئۆجەلان** ـ روسیا لەسـەدەی 19دا زۆر لەسـەر كێشـەی كـورد راوەسـتا. مینۆرسكی و گەلێك رۆشنبیری هاوشێوە لەرێگای لێتوێژینەوە و لێكۆڵینەوەی گرنگیان ئەنجامـدا و هەوڵیانـدا كێشەی كورد بە شێوەیەكی بابەتیانە رۆشنبكەنەوە. پـێش شۆڕشـی ئۆكتۆبـەر پەیوەندییـەكانی روسیا بە كوردانەوە بەهێز بوو. سوپاكانی روسیا تاوەكو كوردسـتان هاتوونـە و تەنانـەت تـاوەكو دێرسیم، ئەرزروم، بتلیس، وان، ئەرمەنستان چوونە. ئەگـەر روسـیا نەچووبایە، ئـەوا ئەرمـەن و كوردان دەبوونە دەوڵەت. پەیوەندی چڕوپڕ هەبوو، بەڵام دواتر هەموو شتێك ئاوەژوو بۆوە.

شۆڕشی ئۆكتۆبەر شۆڕشی ئازادی گەلانە. روسـیا، بـە یارمەتیـدانی مسـتەفا كـەمال كـوردان و ئەرمەنیەكانی وروژاند و لە ئەنجامدانی كۆكوژیدا رۆلی گێـڕاوە. ئەمـە ناكۆكییـەكی خراپـە. بـە پابەنـدبوون بـە یارمەتییـەكانی دەرەوە شۆڕشـێك ئـەنجام نـادرێ. بـەڵام دەبـێ لـەنێوان گەلانـدا هاوكاری هەبێت. ئێمە جوڵانەوەیەكی سۆسیالیستین و ناچارین هەندێ راستی ببینین. مێـژووی حەفتا ساڵەی سۆڤیەتەكان بـۆ تـورك و فـارس و عەرەبـەكان مێژوویـەكی بـاش بـووە. بـەڵام ئـەم حەفتا ساڵە بۆ كوردان مێژوویەكی خراپ بووە.

تەنیا سۆڤیەتەكان كێشە نەبوون. هەنـدێ كێشـەی نـاوخۆییش هـەبوو. بـە كـورتی هـەبوونی حەفتا ساڵەی سۆڤیەت بۆ گەلی كوردستان زێدە باش نەبوو. نەخۆشیەكانی سۆڤیەت رۆژلـەدوای رۆژ لە گەشەسەندندا بوو. هەم لـە نـاوخۆ و هـەم لـە دەرەوەش كێشـەكانی قورسـتر دەكـرد. ئـەو كاتەی هەڵوەشایەوە، زێدە دڵگران نـەبووم. پـێش ئـەوەی ڤۆنـاخی گۆرباتچۆڤ دەسـتپێبكات، لـە ساڵی 1985 هەندێ هەڵسـەنگاندنی مـن هـەبوو. ئامـاژەم بـە لەیـەكتر نزیكبوونـەوەی هـەر دوو سیستەم كردبوو. چونكە تەواوی كێشەكانیان لەتەوەری خۆیاندا بەئاستی گرێكوێرە گەیانـدبوو.

گەلێك شۆڕش بۆ ئەم گرێكوێرەیە دەبوون بە قوربانی. خاوەنی سیاسەتێكی راست نەبوون. دەرەنجام وێڕای گەلی روسیا گەلێك نەتەوە زیانیان پێگەیشت. ئەوەی هەڵوەشایەوە سۆسیالیزم نەبوو، بەڵكو نەخۆشیەكانی نێو سۆسیالیزم بوو. ئێستاكەش گەلی روسی ئێش و ئازارەكانی ئەمە دەكێشن. دوای هەڵوەشانەوەی سۆڤیەتەكان، بۆ ئێمەی كورد ئەو رەوشەی دەركەوتە روو، زێدە خراپ نەبوو. ئەگەر گەلی روسیا دووبارە لەرابووندا سەربكەون، ئەوە بۆ خۆی دەبێتە سەرلەنوێ لەدایكبوونەوە. سیاسەتی ئەمڕۆی روسیا بە تەواوەتی رون و ئاشكرا نییە. دەكرێ بگوترێ رۆژ لەدوای رۆژ لە سیاسەتی خۆیدا ئاشكرابوون دێتە ئاراوە و لەسەر سیاسەتی نێودەوڵەتیش كاریگەری دروست دەكات.

ئێستا لە روسیادا هەندێ كێشە سەریان قوت كردۆتەوە و، ئەم كێشانەش لە نزیكەوە پەیوەندی بە گەلانەوە هەیە. بۆ نموونە، كێشەی چیچانیەكان؛ توركیا بە كارەكتەرێكی تەواو شۆڤێنیانە، چیچانەكان دەپارێزێ. هەروەها توركیا بەشێوەیەكی شۆڤێنیانە لەئازەربایجان، كازاكیستان، توركمەنیستان، ئوزبەكیستان سیاسەتێك پەیڕەو دەكات و دەتەوێ لەو شوێنانە فاشیزم رەوا بكات. هۆزە تورانیەكان هەن. ئێمە دژی ئازادی چیچان و توركەكان نین، بەڵام رەوشی قووڵكردنەوەی فاشیزم لەلایەن توركیاوە، مەترسیدارە. بەتایبەتی فاشیستەكانی وەكو توركیش ئەمە قووڵ دەكەنەوە. ئەمە بۆ روسیا و گەلانی دیكەش سیاسەتێكی یەكجار مەترسیدارە.

بۆرژوازیەتی تورك لە ئەنادۆل، ئەو رێككەوتنانەی كە لەگەڵ هەندێ دەوڵەت دا ئەنجام دەدەن، لە بنەمادا لەدژی گەلی روسە. دەبێ بەباشی دەرك بەم سیاسەتە بكرێت. لەوانەیە ئێستا توركیا لاواز بێت و زێدە شتێكی لەدەست نایە، بەلام لە هەڵپەی مەزنبووندایە. تەنانەت دزەی نێو روسیاشی كردوە. هەر لە ئێستاوە سەبارەت بە بابەتی پەترۆڵ گەلێك كێشە سەریان هەڵداوە. لە قۆناخی داهاتوو هەندێ ناكۆكی سیاسی بەپەلە خۆی دەخاتە نێو رۆژەڤەوە.

رژێمی شەڕی تایبەتی تورك رۆژ لەدوای رۆژ كارەكتەرێكی فاشیستیانە وەردەگرێت. چەندە فاشیزمی توركیا پەرەبستێنێ، بۆ گەلی روسیا هەندێ كەند و كۆسپ خۆی قوت دەكاتەوە. لە مێژووشدا رەوشی لەچەشنی ئەمە گەلێك روویانداوە. ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بە درێژایی چەندین سەدە لەدژی روسیا شەڕیان كردووە. لەدژی سۆڤیەتیش وەكو لایەنگری NATO شەڕی كرد. ئێستاكەش لەقۆناخی ئامادەكاری شەڕدایە. دەوڵەتی توركیا هەروا بە ئاسانی دەست لەسیاسەتی شۆڤێنیانەی خۆی بەرنادات. ئێستا كوردان لەدژی سیاسەتی كۆماری توركیا شەڕدەكەن. تاكە گەلێك لە باشووری سۆڤیەتەكان بتوانێت لەدژی ئەم مەترسیانە رۆڵی خۆی بگێڕێ و شۆڤێنیزمی تورك بوەستێنێ، گەلی روسە( یان گەلی كوردە؟)

پەیوەندی نێوان روسیا لەگەڵ گەلی کورد بنەمای مێژوویی و رۆژانەی هەیە. پێویستە پەیوەندی نێوان هەر دوو گەل لەرووی ستراتیژی، ئابووری و سیاسیدا بەهێز بێت. روسیا بە گوێرەی گەلێك گەلی دیکە هەرە زێدە دەتوانێ پارمەتی لە کوردانەوە وەربگرێ و زەمینە بابەتییەکانی ئەمەش لەئارادایە. روسیا لەگەڵ تورکیا و گەلێك وڵاتی دیکەی رۆژهەڵاتی ناوین پەیوەندی هەیە. پێم وایە ئەم پەیوەندیانە بۆ گەلی روس قورسایی پێکدەهێنن. بڵندبوونی ئاستی گەلی کورد کێشە مێژووییەکانی گەلی روس روون دەکاتەوە و رەنگە ئێستا گەلی کورد رۆڵێکی زۆر گەورە نەگێڕێ، بەڵام تێکۆشانی گەلی کورد بۆ هەر دوو گەل هەلومەرجی لەبار و گونجاو و ئامادە دەکات.

تاوەکو ئێستا روسەکان لەبەرامبەر ئەو یارمەتیانەی بە کۆماری تورکیای داوە، زەرەری پێگەیشتووە، لە راستیدا کۆماری تورکیا بە یارمەتی روسیا بوو بە دەوڵەتێك. کەچی ئەمڕۆ ئەم رژێمە فاشیستە هەڕەشە لە گەلی روس دەکات. پەیوەندی ستراتیژی ئەوان، لەدژی روسەکانە.

لەبەرئەوەی سیاسەتمەدارێکی لاواز نیم، ناڵێم: "وەرن، یارمەتی ئێمە بدەن". بەلام کێشەکە کێشەی هەمووانە و کێشەی گەلانە.

بنەمای ئەم رێککەوتن و یارمەتیانە چیین؟ ئایا بۆچی گەلی روس کە هۆشیاریی مێژوویی و سەربازییەکانی بەو رادەیە بەهێزە، تاوەکو ئێستا جەخت لەسەر پەیوەندی لەگەڵ تورکیا دەکات؟ کێشەی کوردستان کێشەیەکی بنەڕەتیە کە رۆژەڤ دادەگرێت. ئەگەر لایەنی ئابووری، سەربازی، سیاسی بە قووڵاییەوە لێبکۆڵینەوە، ئەوا سەبارەت بە بابەتی چارەسەرکردنی کێشەی کورد، ئاشکرایە کە هەرە زێدە پێویست دەکات روسیا رۆڵی خۆی بگێڕی. لەسەر ئەم بنەمایە، لە قۆناخی داهاتوودا، گەلەکانمان بەشێوەیەکی زۆر باشتر یەکتری دەناسن. هەرجۆرە پەیوەندیەك لەگەڵ گەلەکەمان ببەسترێ، ئەوا هەم بۆ گەلی روسیا و هەم بۆ گەلی کوردیش سوود و کەڵکی گەورەی لێدەکەوێتەوە.

### "رێککەوتنی کورد ـ روس دەتوانێ زۆر کێشە چارەسەر بکات"

سەرهەڵدانی گەلی کورد کاریگەری لە سیاسەتەکانی گەلێك دەوڵەت دەکات. بەڵام لەروسیادا کۆمەڵێك کێشە لەئارادان. روسیای تازەدامەزراو بە هۆی ئەو کێشانەوە، زێدە گرنگی بە کێشەی کورد نەداوە و نەکەوتە نێوی لێگەڕینی پەیوەندی کردنەوە. ئێستا لە روسیا هەندێ گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕ لەئارادایە، تەنانەت لە ئاستێکدا هەندێ نوێکاریش هەیە. دەکرێ لەنوێوە قۆناخی گۆڕانکاری بەسەردا بێت. لەیەکێتی سۆڤیەتی رابردوودا لەئاستی سەرۆکایەتیدا لادان بە ئایدیۆلۆژیا هەبوو. هەردەم بیریان لە گەشەسەندن دەکردەوە و، لەبەرئەمەش کەندوکۆسپە

رۆژانەییەکانی بەردەمیان نەبینیوە. کاریگەری سیاسەتەکانی یەکێتی سۆڤیەتی رابردوو هێشتا لەبەرچاوانبوو. هەربۆیە لە ئەستانبولدا چاوپێکەوتنیان کرد. ئەو سیاسەتانەی لەو قۆناخەدا دەستنیشانیان کردبوو، پشتی بە بنەمای راست نەبەستبوو. وێڕای ئەوەی رێگاکانی دەریا بۆ گەلی روسیا ئەوەندە گرنگ نەبوو، کەچی گرنگییەکی چڕوپڕیان پێبەخشی. لەم خاڵەشدا زەرەرمەند بوون. روسەکان، تەنیا لە رۆژهەڵاتی ناویندا نەکەوتنەی نێو کەموکورییەوە لەو سیاسەتانەی بەرێوەیان برد، بەڵکو لەتەك ئەمەدا چەوتی جددیش جێگەی باسە. ئەگەر ئەوانە بەباشی تاوتوێ نەکەین، ناکرێ هەنگاوی راست و دروست بنرێت.

پێویستە لەم بابەتەدا بە قووڵی بیر بکرێتەوە. ئەم کەموکەرتیانە لەگەڵ کێشەی تورکەوە دەستپێکرد و لە تەواوی رۆژهەڵاتی ناویندا بڵاوی کردەوە. لە سیاسەتی جیهانیشدا هەمان نەخۆشی هەبوو. لێرەدا رەخنەکردن یان رەخنەنەکردنی گرنگ نییە, بەڵام زەرەر و زیانی گەورەی پێگەیشت. دەمگوت "ئەمە چ شێوەی سیاسەتێکە" سەرم سوڕ دەما، ئێستاکە ئەوان بە خۆشیان ئەمە دەبینن.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ـ لەو قۆناخانەدا حکومەتی روسیا سیاسەتێکی وەهای پەیڕەو دەکرد کە هیچ کەسێك بۆی نەدەکرا باس لەراستییەکان بکات. حکومەت بووبە پاشڤەڕۆ و بەرگە گرتنی ژیان زەحمەت دەبوو. پێویستە حکومەتی هەنووکە داخراو نەبێت. پێم وایە ئێوەش هەڵوەستە لەسەر ئەم بابەتە دەکەن. ئەو نارەحەتیانەی لە ناوچەکەدا دەردەکەوت، کاریگەری لە ناوچەکانی دیکەش کردووە. دەرەنجام ئەم رەوشە هەڵوەشانەوەی سۆڤێتی لەگەڵ خۆی هێنا.

**عەبدوڵڵا ئۆجەلان** ـ ئەو شتانەی باستان کرد گرنگن. رەنگە گەلێك شت لەبیر بکرێت، بەڵام ئێستا هەموو شتێك زۆر بە روونی دەبینرێ. هێشتا کەموکورتییەکانی سیاسەتی روسیا سەبارەت بە تورکیا بەردەوام دەکات. یارمەتی زۆر گەورە پێشکەش بە دەوڵەتی تورکیا کرا. بەڵام ئەگەر کەسێك یارمەتی گەلی کوردی بکردایە، ئەوا گەلی روسیا دەقات زیاتر سوودمەند دەبوو. هەڵوەشانەوەی کۆماری تورکیا پەیوەستە بە تێکۆشانی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردستان. لە ساڵانی 1920دا نەك لەگەڵ کەمالیستەکان، بەڵکو لەگەڵ کوردان پەیوەندی ببەستبایە، ئەو کێشە بنبەستکراوانە هەر لە زووەوە چارەسەر دەبوون. نە تورکەکان دەبوونە هاوپەیمانی ئەمریکا، نە شای ئێران هانای بۆ ئەمریکا دەبرد، نە ئێراق دەکەوتە نێو ئەم رەشەوە. تەنیا یەك شت پێویست بوو؛ ئەویش پەیوەندی بەستن لەگەڵ کوردان. من ناڵێم کەموکورتی کوردان نەبوو. خاوەنی کەموکورتی زۆر مەزنیشن. بەڵام هەندێ تەقەلا نیشانبدرایا، ئەنجامی باش دەردەکەوتنە روو. لە ساڵی 1920 تا ساڵانی 1945، ئەم

دەرفەتانەی هەبوو. لەئەنجامی کەموکورتییەك ئەم دەرفەتەیان لەدەستدا. ئەمەش بۆ گەلی روسیا زیانی گەورەی لەگەڵ خۆیدا هێنا.

ئەمڕۆ کوردان، لە رۆژهەڵاتی ناوین باڵابوونێکی گەورە ئەنجامگیردەکەن. تێدەکۆشێ خۆی بۆ جیهان بسەلمێنێ. ئەگەر سیاسەتەکانی نێودەوڵەتی تاوتوێ بکەین، ئەوا گەشەسەندنی تێکۆشانی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردستان بۆ گەلی روسیا کەڵکی مەزن لەگەڵ خۆی دەهێنێ. هەردوو گەل لە گەلێك بابەتدا تایبەتمەندی هاوبەشیان هەیە. لە رەوشی هەنووکەدا لەدژی روسیا هەرجۆرە سیاسەتێکی خراپ پەیڕەو بکرێ راستەوخۆ بەشێوەیەکی خراپ کاریگەری لە کوردانیش دەکات.

بۆ نموونە، بۆ ئەوەی کێشەی قەفقاسیا چارەسەر بکرێ، دەکرێ گەلێك شت لەگەڵ کوردی ئەوێ لەنێو هاوکارییەکدا ئەنجام بدرێ. لەکێشەی ئەرمەنییەوە بگرە تاوەکو کێشەی تورك و چارەسەرکردنی گەلێك کێشە، پەیوەندی بە کێشەی کوردەوە هەیە. کێشەی چیچانەکان و گەلێك کێشەی تریش بەیەکەوە پابەندن. ئەم کێشانە روسیاش زۆر سەرقاڵ دەکات. ئەگەر رەوشی هەنووکە بێنێتە بەرچاو، ئەوا دەکرێ رێککەوتنی گەلی کورد و روس بۆ چارەسەرکردنی گەلێك کێشە رۆڵی کلیل بگێڕێ. فاشیزمی تورك لەژێرناوی ئیسلامییەت مەترسییەکی گەورەیە. لە چیچان هەندێ کەموکورتی روویاندا. ئەگەر بەیانی هەمان کەموکورتی لە ئوزبەکستان و کازاکستان رووبدەن، ئەوا چۆن دەتوانرێ بوەستێنرێ؟ بەڵێ، کوردان رۆڵێکی مەزن بۆ چارەسەرکردنی تەواوی ئەم کەموکورتیانە دەگێڕێ.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ـ لە 1920کاندا ئێمە مانان نەبووین. بە ئەزموون دەرخستن لەو کەموکورتیانەی لە مێژوودا دەرکەوتوون، دەکرێ پەیوەندیەکی راست لەنێوان گەلی کورد و روس ببەسترێ.

**عەبدوڵلا ئۆجەلان** ــ مسۆگەر وەهایە. ئەوانەی گەلی خۆیان خۆشدەوێ و دەیانەوێ تێکۆشانێکی ئایدیۆلۆژیانە بەرێوەببەن، دەبێ یەکێتی و یەکبوون پێکبهێنن. گەلی روسیا گەلێکی فیداکارە. لە قۆناخێکدا گەلی کورد دووچاری کەوتن و داکشان دەبۆوە، لەگەڵ کۆماری تورکیا رێککەوتنی بەست. بەتەواوەتی لەو قۆناخەی کە رێکخستنیان ئاواکرد، روسیا بەرەو دواوە هەنگاوی دەهاوێشت. لەو بڕوایەدام کە ئیدی ئەم بێ شانسیە بەلاوەدەنرێت.

### "خوڵقاندنی مرۆڤێکی سۆسیالیست لە دامەزراندی دەوڵەت گرنگترە"

**ماکار نیکۆ ڤایم** ــ بەو ئەندازەیەی تێیگەیشتوومە ئامانجی PKK، تەنیا رزگارکردنی خاك نییە. هاوکات خوڵقاندنی شێوەیەکی نوێی مرۆڤیشە. ئایا مرۆڤی نوێ چۆن دەخوڵقێنن؟

**عەبدوللا ئۆجەلان -** بیانووی بنەڕەتی شەڕی ئێمە، خولقاندنی کەسایەتی مروڤی نوێیە. ئێمە تەنیا بۆ پارچە خاکێك یان بۆ گەلێك تێناکۆشین. لەبنەمای ئایدیۆلۆژیای ئێمەدا، خولقاندنی کەسایەتی مرۆڤی نویٚ بنچینەیە. لە یەکێتی سۆڤیەتدا، لە میانەی سۆسیالیزمی بونیادنراودا لەم خاڵەدا کەموکورتی جددی دەبنین و گرنگی زۆریان بە سنوورەکان داوە. لەشێوەدا ئەنتەرناسیۆنالیزم بوو، بەلاّم لە گەوهەردا (لە ناوەوەدا) نەتەوەپەرستی بە قورسایی سەقامگیر بوو.

لە قۆناخی سۆسیالیزمی سۆڤیەتدا لەوانەی کە ڕێبەرییان بۆ سیستەمی ئەوکاتە دەکرد لەسەرمایەداری کەمتر نەبوون.

دەوڵەتێکی سۆسیالیستی دامەزرا، گەلێکی سۆسیالیستی ڕێکخرا، بەلاّم مرۆڤی سۆسیالیست، نەخولقێنرا. بۆ نموونە، ستالین تا چ ئەندازەیەك لەژێر کاریگەری فیوداڵیزمدا بوو؟ ئایا چەندە خۆی گەیاندە کەسایەتییەکی سۆسیالیستی؟ ئەگەر ئەم پرسیارانە بەباشی دەرکی پێنەکرێت، ئەوا ناکریٚ دەرك بە کێشەکانی سۆسیالیزم بکرێت.

هەروەها خرۆشۆڤ چۆن دەرکەوتە روو؟ تا دواڕادە پابەندی ستالین بوو. هەرچی دوای مردنی ستالین رۆڵی دوژمنایەتی کردنی بینی، ئەو دوو هەڵوێستەش راست نییە. لە نێو پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەتدا پرەنسیپی عەلەنیەت (ALENIYET) ونەدەبوو. رۆحی مرۆڤیان دەخنکاند، دواتر تەقینەوەیەکی خراپیان لێکەوتەوە. ئەو میتۆدانەی من پەیڕەوم کرد، بە تەواوی پێچەوانەی ئەوانەیە. من هەموو شتێك زۆر بەباشی و بەروونی ئەنجام دەدەم.

"گلاستنۆس" لەسەرەتاوە تاکو ئەمرۆ پرەنسیپی هەرە بنەڕەتی منە.

ئەو سیاسەتەی لەدژی دەوڵەتی تورکیا پەیرەوی دەکەم، بە شێوەیەکی ئاشکرا ئەنجامی دەدەم. تا دواڕادە پەیڕەوی پرەنیسپی عەلەنییەت دەکەین. شێوەیەکی دیکەی مرۆڤ ناتوانیٚ لە دژی فیوداڵیزم و پاشڤەڕۆیی تێبکۆشیٚ. ئەگەر ئەم میتۆدانە نەبن، ئەوا سۆسیالیزمی زانستی پێکنایەت. لەمیانەی یەکێتی سۆڤیەتدا، کۆمیتەی ناوەندی کاتیٚ کە بە ناوی سکرتێر کاروباری جیاجیا ئەنجامدەدا، گەلیش دەچەوسێنرایەوە. لەسەرەوە مەکتەبی سیاسی خۆی زۆر مەزن راگەیاند. ئەمەش دەرەنجام ڕێگای لە پێش تەقینەوەی گەورە کردەوە. نەدەبوو وەها رووبدات. خەریك بوو لە دونیادا وەکو خودا خۆی پێناسە بکات. هەڵبەتە ئەمە سۆسیالیزم نییە، بێگومان کە دووچاری رووخان دەبۆوە، رووخانیشی پێویست دەکات. لەنێو ئەو سنوورەی کە خۆی دروستی کرد نەك سەرمایەداری، بەڵکو دەبیٚ سۆسیالیزم دابمەزرێنریٚ. چونکە سۆسیالیزم

نوێنەرایەتی مرۆڤایەتی نوێ دەکات. دەبێ سۆسیالیزم بۆ مرۆڤایەتی بکرێتە شێوازێکی ژیان و ئەمە بڵاو بکرابوایەوە.

مرۆڤی نوێ، مرۆڤی راست، مرۆڤی جوان، مرۆڤی سۆسیالیست. بۆچی مرۆڤ لەنێو سنوورەکان زیندانی بکرێت؟ بۆچی خۆی حەشار بدات؟ من دژی تەواوی ئەمانەم.

ئێمە لە کوردستاندا مرۆڤی نوێ دەخوڵقێنن. بەجۆرێك بەتەواوەتی دووربێ لە بەرژەوەندی کەسایەتی و تاکە کەسی. هیچ کەسێك بە زۆر لەنێو پارتیدا ناهێڵرێتەوە. هەر هەڤاڵێکی ئێمە وەکو فیداییەکە. پارتی نەك لەسەر بنەمای فشاری دیسیپلینی، بەڵکو لەسەر بنەمای دڵخوازی بەڕێوەدەچێ. ئەگەر بەمجۆرە نەبێت، ئەوا ناکرێ لەبەرامبەر دەوڵەتی تورکیا شەڕ بەڕێوەببەین. ناکرێ شەڕ و شۆڕش لەرێگای فشاری دیسیپلینی و سەنترالیزمەوە، بەڕێوەبچێ.

ئەگەر لە روسیادا هەندێ هەڤاڵ هەبێت کە بتانەوێ خەباتی سۆسیالیستی بەڕێوە ببەن، ئەوا دەتوانن کەڵك لەخەبات و ئەزموونەکانی ئێمە وەربگرن. پێویستە هەندێ دڵنزم (موتەوازی) بن. ئەگەر مرۆڤێك کەمووکەرتیەکانی خۆی باس بکات، شتێکی خراپ نییە. منیش راستینەی خۆم زێدە مەزن ناکەم. تا ئێستاکە من نەچوومەتە نێو گەلی کورد، بەڵام من وەکو سەرۆك و سەرکردەیەك گەورە دەبینن. ئەمە چۆن دەبێت؟ بەتەواوەتی نوێنەرایەتی ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیست دەکەین و پارچەیەکی گەورەی دونیا دەخەینە بەرامبەر خۆمان؟ ئاخۆ چۆن ئەم گەلە بەم رادەیە لە هێڵێکی ئاگرین دا مەیسەر دەبێ و بەم رادەیە هەڤاڵ لەگەڵ من بەڕێوە دەچن؟ پێویستە هەڵوەستە لەسەر ئەمانە بکرێت. لەنێو پارتیدا لەسەر خوڵقاندنی مرۆڤی نوێ بەچڕوپڕی هەڵوەستە دەکەم. چونکە خوڵقاندنی مرۆڤێکی نوێ لە دامەزراندنی پارتی و دەوڵەتێك گرنگترە.

ئێستا ئەگەر لینین لەسەر ستالین هەڵوەستەی بکردایە و بە تەواوەتی وەك سۆسیالیستێك گەورەی بکردایە، ئەوا مەترسیەکان بەو رادەیە نەدەبوو. ماوەیەکی کورت پێش مردنی لینین ویستی لەسەر بابەتەکانی وەکو شۆڤنیزمی روس، و بیروکراتیزم بوەستێ و هەندێ پرسیاریشی پرسیارکردووە. لەراستییدا لینین ئەم مەترسیانەی بینیبوو. بەڵام بەشی نەدەکرد. وەسیەتەکانی لینین گرنگن. پێویستە هەڵوەستەی لەسەر بکرێ.

**"من رەخنەدانی سۆسیالیزمی بونیادنراو دەدەم"**

**ماکار نیکۆ ڤایم ـ** ئێوە شێوەی مرۆڤی نوێ دەخوڵقێنن، شێوازی پەیوەندی نێوان کەسایەتی مرۆڤە نوێیەکان؛ بۆ نموونە پەیوەندییەکانی نێوان ژنان و پیاوەکان چۆن دەبێت؟

هەروەها ئایا لەدوای سەرکەوتن دەزگای خێزان پێکدەهێنرێ؟ خۆشەویستی لەمیانەی سۆسیالیزمی بونیادنراودا لە چوارچێوەی سیستەمی سەرمایەداری دا بوو؟

**عەبدوللا ئۆجەلان ـ** لە خەباتەکانمدا کێشەی ژن یاخود پەیوەندییەکانی نێوان ژن و پیاو جێگایەکی گرنگی هەیە. لەم بابەتەدا گەلێك خاڵ هەن کە رەخنەم لە سۆسیللیزمی بونیادنراو کردووە. پەیوەندییە خۆشەویستییەکان لە چوارچێوەی سیستەمی سەرمایەداری دا بوو. زێدەخۆی لەو شێوازەی پەیوەندی رزگار نەکردبوو. پیاو پیاوی کلاسیك و ژنیش ژنی کلاسیك بوو.

بۆ نموونە دەکرێ هەڵوەستە لەسەر شێوەی هاوسەرێتی ستالین بکرێت.

ئەو پەیوەندیەی کە هەبوو سۆسیالیستی نەبوو، بەڵکو دەسەلات و باڵادەستی ستالین بوو. لە راستیدا لەو باوەڕەدام ئەم خاڵە لە هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراوادا رۆڵێکی گرنگی هەبوو. لەم بابەتەدا هەموو ساتێ، من خۆم نوێ دەکەمەوە. کاتێ ئەم خەباتانەم بەرێوەدەبرد، لەگەڵ ژنێکدا شەڕم بەرێوەدەبرد و دەرەنجام سەرکەوتنم بەدەست هێنا. ژنێك چەندە لەگەڵ دوژمن و چەندە لەگەڵ گەلە؟ دەرئەنجام ئەو ژنە چووە لای دوژمن. ئەو شێوازە ژیانەی ئاراستەم کرد، لەگەڵ خۆیدا پارتێکی سۆسیالیستی خوڵقاند. سەبارەت بە دیاردەی خۆشەویستی تا ئێستاکەش بەرشتەوە هەڵوەستەی لەسەر دەکەم.

لەسەر بنەمانی پەیوەندیە کۆیلایەتییەکان، نە خۆشەویستی و نە شەڕیش فەراهەم نابێ.

دوژمن خۆشەویستی کوشتووە.

خۆی لە خۆیدا لەمیانەی قۆناخە مێژووییەکاندا ژن بەڕادەیەکی مەزن رووخێنراوە. بەتایبەت لە کوردستاندا ژن گەلێك زیاتر دادەڕووخێنرێ و ژن نوێنەرایەتی لاوازیەکان دەکات و خێزانەکانی کورد بەتەواوەتی نوێنەرایەتی داڕووخان دەکەن. ژنان و پیاوەکان، لەرێگای پەیوەندییەکانیان یەکدی نغرۆ دەکەن (دەخنکێنن). ژنان هەم لە رووی سەرژمێریدا زۆرن، هەم بە تایبەتمەندییە هەنووکەییەکانیان جێگەی خۆیان لەنێو شەڕ دەگرن. زۆربەیان دەیانەوێ بەشداری و پەیوەندی بکەن بە شۆڕشەکەمان. بۆ ئەوان سوپا دادەمەزرێنین.

خۆشەویستی چییە؟

سۆزداری (عاتیفە) چیە؟

چۆن لەگەڵ یەکترا دەگوزەرێن؟

وەکو ئەوە لە پەرتووکەکەی جیرنۆڤیسکی دا هاتووە. بۆ نموونە لەو پەرتووکەدا ژنێك هەیە، پێم وایە ناوی "ڤەرا"یە، ئەوە بۆ ئێمە نموونەیەکە. "ڤەرا" دەتەوێ کەسایەتی ژنی ئازاد لەخۆیدا بخولقێنێ. شۆڕشگێڕە روسەکانیش لەبن ئەو کاریگەریەدا دەژیان. ئێستا ئەم خەباتانە زۆر زیاتر پەرەپێدەدەین.

ژنی ئازاد کێیە؟

بۆ هەموو ساتێ لەنێو لێگەڕینی ژنێکی ئازاد دام.

پەیوەندی نێوان ژن ـ پیاو لەنێو کورداندا نوێنەرایەتی مردن دەکات. ژیانی بێ پەیوەندی، بێ ژن گوزەران نابێ و هاوشانی ئەمەش گوزەران زەحمەتە. ئێستا لەم رەوشەدا دەبێ چی بکرێ؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە کە دەبێ لەلای ئێمە وەلامی بدرێتەوە. بە پیاوان دەڵێم کە دەبێ خۆتان بۆ شێوازێکی ژیانی ئازاد و یەکسان ئامادە بکەن. ئەگەر ئێوە تا دواڕادە ژیانی نوێ بەرجەستە نەکەن، ژن بۆ ئێوە نییە. بە هەڤاڵە کچەکانیش دەڵێم؛ ئەم پیاوانە سەداسەد هەوڵدەدەن لەسەر ئێوە دەسەلاتدار و زاڵ بن و، ئێوە ئەوانە چۆن پەسند دەکەن. یەك رۆژ چیە ژنایەتی کردن بۆ ئەوان، سەد قات لە مردن زەحمەتترە. ئایا ئێوە دەتوانن ئەوان پەسند بکەن؟ کچێك کە بکەوێتە بن بالادەستی پیاو، ئەوا دەبێ مردن هەڵبژێرێ. بەم شێوە هەنووکەییە ناکرێ ژیان پەسند بکرێ.

پیاوێکی چۆن؟ کەسایەتی ئەو پیاوەی کە دەخوازرێ بخولقێنرێ، دەبێ لەسەر بنەمای ئازادی و یەکسانی و خۆشەویستی بێ لەگەڵ ژندا. ئەگەر تەواوی ئەوانە نەخولقێنرێ، ئەوا پەیوەندییەکان زیانیان لێدەکەوێتەوە. ژیان بەم گەندەڵیانەوە ناکرێ درێژەی پێبدرێ.

هەڤالانمان گوێڕایەڵی تەواوی ئەمانە دەبن. من خۆشم بۆ ئەوان نموونەیەکم. بۆ نموونە من چۆن حەز دەکەم و کەسانی دیکە چۆن منیان خۆش دەوێ؟ بە پشتبەستن بە دەسەلاتی سیاسی لەسەر ژنان و هەڤالان دەسەلاتی خۆم سەقامگیر ناکەم. لەم بابەتەشدا دەبێ دیموکراسی بەهێز بێت. بە خۆشەویستیەکی راست نزیکی ئێمە دەبنەوە. ئێمەش ئەم خۆشەویستییە لەگەڵ ولاتپارێزی دەکەینە یەك؛ لە گەڵ کەسایەتی پارتی و سیاسەتی پارتی پابەندی دەکەین. ئەو کەسەی بخوازێ لە من حەز بکات پێویستە ببێتە ولاتپارێز، بزانێ شەڕ بکات، لە رێبازی پارتیدا بەڕێوەبچێ و پێش هەموو شتێکیش خۆی ئازاد بکات. ئەگەر وەها نەبێ هیچ کەس ناتوانێ نزیکی من ببێتەوە. ئەمەیە فۆرمیلەی ئێمە.

**ماکار نیکۆ ڤایم ـ** ئەو مرۆڤانەی کە نزیکتان دەبنەوە، زۆر بە زوو بە ئێوە کاریگەر دەبن.

**عەبدوللا نۆجەلان -** ئێستا من ڕەخنەدانی تێپەڕاندنی ئەو نەخۆشیانەی کە لە سۆسیالیزمی بونیادنراو دەرکەوت دەدەم. گەلی روس لە پێناو سۆسیالیزم، مرۆڤایەتی و ئامانجە شکۆمەندەکان، زۆر خوێنی ڕژاند.

ئێمە هەردەم ڕێزمان هەیە بۆ گەلی روس.

ئێستا خاوەنی هەندێ لایەنی کەوتووە. من لەو باوەڕەدام کە لە قۆناخێکی نزیکدا دووبارە سەردەکەوێ. بۆ ئەوی هەڵسێتە سەرپێیان، کاریگەری سۆسیالیزم بەهێزە. ناکرێ گەلی روس لە چەند ساڵێکدا لەژێر ئەم کاریگەرییە رزگار بکرێت. سۆسیالیزم خۆی نوێ دەکاتەوە.

سۆسیالیزم لە هەموو کاتێك زیاتر، ئەمڕۆ بۆ مرۆڤایەتی پێویستە.

سۆسیالیزمی بونیادنراو، سۆسیالیزمێکی کۆرپەییانە بوو. بەلاّم ئێستا شێوەیەکی سۆسیالیستی هەڵبژاردانەتر پێویست دەکات. پێویستە لەسەر ئەمە قاڵ ببنەوە. سەرمایەداری ڕۆژلەدوای ڕۆژ کارەساتی نوێ بۆ مرۆڤایەتی دەهێنێ. ئەمە چارەنووسی مرۆڤایەتی نییە. سۆسیالیزم ڕۆڵی خۆی بە شێوەیەکی دیکە دەگێڕێ. تاوەکو جیهان و مرۆڤایەتی هەبێت، سۆسیالیزمیش دەبێت.

سۆسیالیزم خاوەن مێژووییەکی حەفتا ساڵانە نی یە. لە دروست بوونی مرۆڤایەتییەوە تاوەکو ڕۆژگاری ئەمڕۆکەمان بوونی هەیە. لە یەکێتی سۆڤیەت ئاواکردنی سۆسیالیزم گران شکایەوە. بە ملیۆنان مرۆڤ خۆیان فیدا کرد. سەرمایەداری بە ئامانجی گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی دەتوانێ بە ملیۆنان مرۆڤ بکاتە قوربانی.

ناکرێ ئەمە ببێتە ڕاستی مرۆڤایەتی. پێویستە نە تاك ئەوەندە لەسەر کۆمەڵگا بالاّدەست بێت و نە کۆمەڵگاش مافەکانی مرۆڤ بەلاوە بنێ. ئێمە لەسەر ئەمانەش هەڵوەستە دەکەین. ئێمە بە خەباتەکانی خۆمان بۆ ئەوانە (واتە روسەکان) ببینە پشت و پەنا.

**"سۆڤیەتەکان کەسایەتییەکی خۆخوازیان خوڵقاند"**

**ماکار نیکۆ ڤایم -** ئێمە چەند ڕۆژێك لەگەڵ هەڤاڵە خەباتگێڕەکاندا ماینەوە. ئەمە بۆ ئێمە شانسێکی مەزن بوو. لەگەڵ گەلێك لەو هەڤاڵانە کە لە شەڕدا بریندار بووبوون، گفتوگۆمان کرد و، مشت و مڕمان کرد، ئەمەش کاریگەری زۆری لەسەر ئێمە کرد. ئێمە لەگەڵ دایکێکی بەساڵاچوو گفتوگۆمان کرد و ئەمەی گوت :"بۆ وڵاتی خۆم ئامادەم هەموو جۆرە زۆر و زەحمەتییەك بکێشم". ئێمە بەچاوی خۆمان بینیمان کە چۆن میلەتێك سەرهەڵدەدات. لەقسە کردنی هەڤالان تێگەیشتم کە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان لە ڕژاندنی خوێنی خۆیان ناترسن و

بە ئاسانی دەرکم بەوە کرد کە "ئێوە چۆن دەژین" و "ئێمە چۆن دەژین". خۆشەویستی هەڤالان بەرامبەر بە ژیان، زۆر کاریگەریان لەسەر من کرد.

**عەبدوللا ئۆجەلان** ـ ئێستا گەلی روس لەبەرامبەری ژیان ساردبۆتەوە و وەڕەس بووە. بەلام دیسانیش حەز لە ژیان دەکەن. گەلی کوردیش گەلێکی زۆر دواکەوتووە، بەلام بەرێگای شەڕکردن فێری گوزەران دەبن.

قۆناخەکانی مان و نەمانی تێپەڕاند. لێرەبەدواوە بەڕێوەبردنی شۆڕش ئاسانترە. ئێمە بە قوولی کەلکمان لە ئەزموونەکانی سۆڤیەت وەرگرت. ئەو نەخۆشیانەی کە لە شۆڕشی سۆڤیەت دەرکەوتن، بۆ ئەوەی لە شۆڕشی کوردستانیشدا هەمان نەخۆشی دەرنەکەون، تەگبیری گەورە وەردەگرین. مەکتەبە سیاسی و، سکرتێرەکانی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت خۆیان زۆر لە سەرووی گەلەوە دەبینی. نەك سۆسیالیزم، بەلکو بیرۆکراسی پێکهێنرا. سنوورەکانی دەولەت پیرۆز کران (فەتیشیزم). پێویستە تاکەکان خۆیان لەسەرووی گەل نەبینن. پێویستە ببنە خزمەتکاری گەل و سۆسیالیزم.

من هەموو رۆژێ ئەو هەستە خۆ مەزن دیتنانە، لەخودی خۆمدا دەکوژم. ئەگەر من ئەم هەستە خۆمەزن دیتنانە نەکوژم، ئەو شتەی بەسەر روسیادا هات، پێش ئەوەی ببین بە دەولەت، بەسەر ئێمەشدا دێت. ئەو شتانەی کە "لینین و ماو" و ئەوانی دیکە کردیان، خەباتە مێژووییەکانن و من بچووکیان نابینم. بەلام ئەو خەباتانەی کە بۆ پارتی کردیان، من لاوازیان دەبینم. گەلێك شت پشتگوێ خران و، بە شێوەیەکی کلاسیك خەبات بەڕێوەبردرا. بە تەواوەتی دیموکراسی و سۆسیالیزمی زانستیان پێکنەهێنا.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ـ سەرۆکی بەڕێز، بوژانەوەی ئابووری گەلی کورد چۆن دەبێت؟ هەروەها ئێوە چۆن دیاردەکانی پارتی و دەولەت هەلدەسەنگێنن؟

**عەبدوللا ئۆجەلان** ـ بوژانەوەی ئابووری گرێدراوی سیاسەتێکی راستە. کاتێ ئێمە دەستمان بە شۆڕشی کوردستان کرد، ئێمە بە قەرزەوە دەستمان پێکرد. من خۆشم لادێییەکی هەژار بووم. بەلام ئێستا ئەوانەی کە هەم لە رووی ئابووری و هەم لە رووی سیاسەت بەهێزن، ئێمەین. من باوەڕیم بە تواناکارییەکانی مرۆڤ هەیە. گەلی کود گەلێکی زەحمەتکێشە. خاوەنی خاکی دەولەمەندە. لەرابردوودا لەرۆژهەلاتی ناوین بە کوردستانیان دەگوت "بەهەشت". ئێستاش دەبێتە بەهەشت. بەلام دوژمن 100٪ گەلەکەمانی دووچاری بێکاری و لاوازی کردووە و، سەرچاوە دەولەمەندە ژێرخان و سەرخانەکانی تالان دەکات. تەواوی دەولەمەندیەکانی گەلی کوردی یان لەژێر زەوی هێشتۆتەوە یان هەموویانی تالان کردووە.

من دیسان دەستنیشانی دەکەم؛ ئەو تەنگژانەی کە لە روسیا دەرکەوتوونە راستەوخۆ گرێدراوی سەرمایەدارین. دەکرێ شێوەی نوێ سۆسیالیست تەواوی ئەو تەنگەژانە بنەبڕ بکات. کێشە ئابووریەکان زێدە گرنگ نین. ئەگەر کێشەکان بە رێگای سیاسی چارەسەر بکرێت، ئەوانی دیکە ئاسانن. بێگومان ئەگەر هەندێ کەس گەمەی پێبکەن، هەڵدەوەشێتەوە. گەلێك یاری بە سۆڤیەتەکان کرا. بۆیە دەڵێم، پێویستە پارتی هەردەم تا دوارادە راست و دروست بێت. دەبێ پارتی و دەوڵەت لەنێو گەلدا بتوێنەوە. بەلام لە سۆڤیەتدا ئاوەژووی ئەمە دەرکەوتە روو.

گەل لەنێو دەوڵەت و لەنێو پارتیدا توایەوە. بۆ ئەمەش ئێمە پارتی لەنێودەبەین. من زێدە گرنگی بە دەوڵەت نادەم. بەلام من دەخوازم میللەتێکی سەربەخۆ و ئازاد بخولقێنم. ئەگەر بخوازرێ گەلێك ئازاد بکرێ، پێش هەموو شتێك دەبێ کادیرەکانی پارتی بەهێز بکرێن. هەموو شتێك بۆ پارتی و دەوڵەت نییە. بەڵکو بە پێچەوانەوە، هەموو شتێکی بۆ بالابوونی مرۆڤایەتییە.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ـ دوای ئەوپرسیارە گرنگانە، ئێستا دەخوازم پرسیارێکی سادە بکەم؛ ئایا کادیرەکانی پارتی ..... ناسنامەیان هەیە؟

**عەبدوڵا ئۆجەلان** ـ نەخێر، ناسنامەیان نییە. ئەم بابەتانە زێدە گرنگیان پێنادەین. من گەلێك لەوانە کێن و لە کوێوەهاتوون ناناسم. بەلام بە شێوەیەکی بەرجەستە هەڵوەستەیان لەسەر دەکەم. ئەم شتانەی شتێی شێوەیین. بۆ ئێمە ئەوانە زێدە گرنگ نیین. بە شێوازە شێوەییەکان (رووکەشییەکان) ناکرێ تاك بەڕێوەببردرێ. بۆ نمونە، روسیا لەم بابەتەد لەرووی شێوەدا زۆر بەهێز بوو.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ـ ژمارەی ئەو گەریلایانەی لە چیادا شەڕدەکەن و خەباتگێڕەکانی پارتی چەندەن؟

**عەبدوڵا ئۆجەلان** ـ بە تەواوەتی دیار نییە کادیری پارتی چەندەن؟ کێن ئەوانەی مەرکەزن؟ کێین ئەوانە لە ئاستی ژێردا ئەرکی پێسپێردراوە؟ ئەمانە زێدە شتی جیاواز نین. من هێشتا ناوی مەکتەبی سیاسیم دانەناوە. ناوی مەرکەزی پارتیم دیارنەکردووە. مەکتەبی سکرتاریەتی جیاوازی من نییە. رێکخستنی شێوەیی بۆ من مەترسیدارن. نە لەبەرئەوە نییە کە ئێمە نازانین رێکخستنی بەوجۆرە دروست بکەین، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە زیان بەخشن، ئێمە دروستی ناکەین. ئێستا ئەوانەی لە روسیا دەژین، کاردانەوەی زۆریان لەبەرامبەر مەرکەز و سیاسەتی کۆن هەیە. من لەوانە تێدەگەم. ئەو ئەزموونانەی کە من دەرمخستۆنەتەروو، نەك بۆ کێشەی کورد هەروەها بۆ ئەنتەرناسیۆنالیزم و سوسیالیزمی جیهان پشتیوانیەکە. ئەوەی گرنگە،

خەباتەکان بەڕێوەبچن. بەڕاستیش ئێمە تێکۆشانێکی مەزن بەڕێوەدەبەین. ئەگەر دەوڵەتێکی دیکە لەبەرامبەر ئەم دوژمنە شەڕی بکردایە، ئەوا هەر لە زووەوە شکستی دەخوارد. بەڵام ئێمە شکستمان نەخوارد، بەڵکو سەرکەوتنمان بەدەستهێنا.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ـ ئەم بابەتانەی کە ئێوە باسی لێوەدەکەن بەڕاستیش راستە. ئەو شتانەی کە ئێوە بەسەرتان خستووە، لەبەرچاوانە.

**عەبدوڵڵا ئۆجەلان** ــ کەموکورتیە جدیەکانی ئێمەش هەن. لەبەرامبەر ئەوانە رۆژانە تێدەکۆشم. من مرۆڤێکی خۆخواز نیم. ئەو کەسایەتییەی کە سۆڤیەتەکان خوڵقاندیان، کەسایەتییەکی خۆخوازە. خۆیان دەخستە شوێنی خودا. ئایەتوڵاکانی ئێران هێندەی ئەوانی خۆخواز نیین. پێویستە کەسایەتی سۆسیالیست دڵنزم (متەوازی) بێت. پێویستە بە پێداگریەوە لەسەر ئەم بابەتانە هەڵوەستە بکەین. لێرەدا سۆسیالیزم یان کۆمۆنیزم تاوانبار نیین. تاوانبارەکان، تاکە کەسەکانی خۆیانن. من ئایندەی گەلی روس لەنێو سیستەمی سەرمایەداری بەدیناکەم. گەلی روس گەلێکە کە زێدە حەز لە خۆپەرستی ناکات و، بەڵکو زیاتر شێوە ژیانی کۆمۆنەی هەیە. واتە لە رووی تایبەتمەندیە مێژووییەکانیش بەو جۆرەیە. نازانێ لەگەڵ سیستەمی سەرمایەداری هەڵبکات. سەرمایەداری کاری گەلی روسیا نییە.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ـ گەلێك میللەت هەن کە لە راستییدا ناخوازن سیستەمی سەرمایەداری بەرجەستە بکەن. لەنێو لێگەڕینی ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیست دان. لەو ساتانەی کە مارکس ئایدیۆلۆژیای زانستی دەرخستەروو، سەرمایەداری هێشتا تازەبەتازە لە پەرەسەندن دابوو. تێڕوانینەکانی مارکس زێدەتر ئایندەی پێناسە دەکرد. بەڵام مارکس، لە یەکەمین قۆناخەکانی دەرکەوتنی سەرمایەداریدا، ئەوەی دەستنیشانکردووە کە شانسی ژیانی سەرمایەداری نییە. بەڵام کاتێ کە لە قۆناخەکانی دواتر سەیر دەکەین لە بواری ئابووریدا سەرمایەداری پەرەدەسێنێ. سۆسیالیزمی بونیادنراویش لە هزردا سەرمایەداری پەسند دەکات. تەنانەت بیر دەکەنەوە کە ئەویش تێبپەڕێنن. بە تەواوەتی دەرکیان بە سۆسیالیزم نەکردووە.

**عەبدوڵڵا ئۆجەلان** ـ بێ ئەوەی لە سەرمایەداری تێبگەن، بیریان دەکردەوە کە بپەڕنەوە بۆ سۆسیالیزم.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ـ بە راستیش نەیاندەزانی کە سۆسیالیزم چییە؟

**عەبدوڵڵا ئۆجەلان** ـ خاڵی گرنگ ئەوەیە کە بۆچی سەرمایەدارییان خۆش دەوێت. چونکە لە خۆیاندا کەسایەتییەکی سۆسیالیستیان نەخوڵقاند. سۆسیالیزم تەنیا ئابووری نییە، پێویستە مرۆڤ سەرنج بداتە ئەمە. بۆ نموونە، فاکتەری مۆراڵ گرنگە. بەڵام لە سۆڤیەتدا زیاتر گرنگی بە

ئابووری، و خۆ پڕچەککردن درا. مۆڕال پشتگوێ خرا. ئێستا کاتێ سەیری بازاری ئابووری روسیا دەکەین، بە تەواوەتی لەرووی ماددیەوە پڕکراوەتەوە. گیانی (رۆحی) مرۆڤایەتییانە بەلاوەنراوە. وەکو ئەوەی شتێکی نەدیتبێ، هەموو شتێك دەخەنە نێو گیرفانی خۆیان. لە راستییدا هەل‌ومەرجەکانی ژیانی ماددی بەوڕادەیە خراپ نییە، بەڵام گرنگی بە شتی ماددی دەدەن. مەحاڵە مرۆڤ بەمجۆرە تێر ببێ، ئەمەش گرێدراوی مۆڕاڵە.

بۆ نموونە، ئێران چۆن بەڕێوەبەرایەتی دەکات؟ بە تەواوەتی لە رێگای مۆڕاڵەوە بەڕێوەدەچێ. تەنانەت ئەوەی کە سەرمایەداریش بەڕێوەدەبات، مۆڕاڵە. بەڵکو سەرمایەدای مرۆڤ هەڵدەخەڵەتێنێ و درۆ دەکات، بەڵام دەرەنجام بەڕێوەدەچێ.

پێویستە سۆسیالیزم نەبێتە دیاردەیەکی دووری سروشتی مرۆڤ. سۆسیالیزم لەسەر سروشتی مرۆڤ ئاواکراوە. (پێکهاتووە). ئەمەش راستییەکی حاشاهەڵنەگرە. ئەوە سۆسیالیزمەی کە لە سروشتی مرۆڤ دوور بێ، پەرش و بڵاو دەبێتەوە (هەڵدەوەشێتەوە). ئەو هۆکارەی کە لە مێژوودا گەلێك دەوڵەت بەهۆیەوە هەڵوەشاونەتەوە، دوورکەوتنەوەیانە لە سروشتی مرۆڤەکان. سۆسیالیزمی بونیادنراو، لەبەر ئەوەی کە لە سروشتی مرۆڤ دوور دەکەوتەوە، دووچاری هەڵوەشانەوە هاتووە. لێرەدا کێشەی ئایدیۆلۆژیا و مۆراڵ دەردەکەوێتە پێش.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ـ سەرۆکی بەڕێز، من لە ژیانی ئێوەدا گەلێك دەوڵەمەندی دەبینم. سەرچاوەی ئەمە لە کوێوە رێچکە دەگرێ؟

**عەبدوللا ئۆجەلان** ـ ژیانی ئێمە زۆر دەوڵەمەندە. ئەو تیۆریانەی پێشدەخرێن، پێویستە خزمەتی ژیان بکەن، نەك ژیان مەحکوم بکەن. لە هەندێ بابەتدا، تیۆری وەکو ئەوەیە کە مرۆڤ بەچاوی ئەسپێ سەیری شتەکان بکات. من هێندە (بە ئەندازەی) ئەوەی کە مرۆڤەکانی تێبگەن تیۆری دروست دەکەم. دەبێ تیۆری بە ئەندازەی ئەوەی لە ژیاندا بتوانرێ هەنگاو بۆ پێشەوە بهاوێژرێن ئەنجام بدرێ. جگە لەوە تییۆری بەکاربراو نییە. بەڵکو من پێناسەی سادە دەکەم، بەڵام ئەمە شێوازی منە. تا دواڕادە لەسەر پێشکەوتنی مرۆڤ هەڵوەستە دەکەم. هەوڵدەدەم کێشەکانیان تێبگەم و چارەسەرییان بۆ بدۆزمەوە. ئەمە بە پەرتوکەکان چارەسەر ناکرێت. پەرتووکی هەرە مەزن ژیان خۆیەتی.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ـ من دەمەوێ پرسیارێکی جیاواز بکەم. ئەوەندەی دەیزانم ئێوە میتۆدی سوقرات بەکار دەهێنن؟

**عەبدوللا ئۆجەلان** ـ سوقرات بە خۆشی ئەکادیمیانی سەربازی خوێندوە. ئێمەش وەکو ئەفلاتۆن میتۆدێك واتە شێوازی دیالۆگ پێکدەهێنین.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ـ دڵخۆش بووین بۆ ئەو بابەتانەی کە لەرێیەوە ئێمەت رووناکتر کردەوە؟

**عەبدوللا نۆجەلان** ـ من هەردەم ئامادەم، لەنێو ئێمە ژیانی جیاواز، تایبەت، و فەرمی بوونی نییە. بەڵکو هەموو تێکچرژاون. گەلی روس دەتوانێ هەندێ پرسیار لە ئێمە بکات. هەربۆیە بە پێویستیمان دیت لەسەر هەندێ خاڵ هەڵوەستە بکەین. ئەو شتانەی کە لە سۆڤیەت روویانداوە، لەلای من نامۆ نین، بەڵکو بە شێوەیەکی سروشتی دەیانبینم. من گومان دەکەم لەوەی کە ئاخۆ ئایدیۆلۆگی نوێ دەربکەون یان نا.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ـ ئەم خاڵە رەوشێکە، کە هەر دووکمان بیری لێدەکەینەوە، واتە کێشەی ئایا سەرۆکی نوێ دەردەکەون یان نا. لە روسیا گەلێك پارتی و گەلێك تاکە کەس هەن. هەمووشیان خۆیان بە رۆشنبیر لەقەڵەم دەدەن. بەڵام هەمووشیان لێکدانەوەی تاکەکەسی لەخۆوە دەگرن و لەدوای دەسەڵاتدا وێڵن. ئەمەش بۆ ئاییندەی روسیا شتێکی باش نییە.

**عەبدوللا نۆجەلان** ـ گەلی روس شایستەی خرابەکاری بەوجۆرە نییە. ئەمە داروخانێکی یەکجار گەورەیە.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ـ خۆپەرستی و "ئەگۆیزم" (تاکپەرستی) بەرجەستە دەکەن. هەموو شتێکی خۆیان پابەندی حکومەت کردووە.

**عەبدوللا نۆجەلان** ـ لە رابردوودا هەموو شتێکیان پابەندی حکومەت کردبوو، ئەمرۆش پابەندی شتی دیکە دەکرێن. لە راستیدا کەسایەتییەکان هاوشێوەن.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ـ ئەم رەوشە کێشەی جدی دەخوڵقێنێ. وەکو مالی فرۆشتن خۆیان هەراج کرد. بەڵام مەترسی ئەمەشیان نەدیت. پێش ئێستا ئێوە باسی (ژێرنۆڤسکی)تان کرد. لە راستیدا ئەو شتانەی کە لە پەرتووکەکەیدا باسی لێوە دەکرێ، ئەو رەوشانە نین کە تەنیا پەیوەندیدار بن بە گەلی روس. بەڵام گەلی روس لەهەمانکاتدا گەلێکی بەتوانایە. پێویستی بە سەرۆکایەتییەکی راست هەیە. پێویستە ئایدیۆلۆژیایەکی راست بەرێوەببردرێت؟

**عەبدوللا نۆجەلان** ـ گەلێکی تا ئەو رادەیە خاوەن ئەزموون و فیداکارە. پێویستە سەرۆکایەتی خۆی بەپەلە ئاوا بکات. تەنانەت دەکرێ سەرۆکایەتییەکی سەرمایەداریش دەربکەوێتە روو. هەندێ کەموکورتی دەکەن کە منالێ چیە ئەوانە ناکەن. من زێدە روسیا ناناسم، بەڵام شەش مانگ لەنێویان بمێنم، دەتوانم سەرۆکایەتییەکی باشتر لەوانەی کە خۆیان بە سەرۆك دادەنێن، بکەم. من لەم بابەتەدا باوەڕیم بە خۆم هەیە. لەم خاڵەدا لای من سەیر دێت. ئەو شتەی کە ئەنجامی دەدەن، پێویستەی بە تەواوەتی رایپەڕێنن. ئەگەر سەرمایەداری پەیرەو دەکەن، با

بەتەواوەتی فەراهەمی بکەن. هەروەها ئەگەر بەنیازن سۆسیالیزم بەردەوام بکەن, با بە تەواوەتی درێژەی پێبدەن. دیماگۆجی دەکەن، زۆر خۆخوازن. لەم خاڵەدا کەموکورتی جددی هەن. بەڵام دیسان گەلی روس گەلێکی کۆڵنەدەرە و خاوەن توانایە و هەر دەگاتە سەرۆکایەتییەکی بەهێز. ئەو شتەی کە من لێی تێناگەم ئەوەیە بۆچی زوو دەرناکەون. بۆ نموونە، لە شەڕە جیهانییەکاندا رۆڵێکی مەزنیان گێڕا. ئەتۆمیان دروست کرد و بەرەو گەردوون (فەزا) ملی رێگایان بڕی. گەلێك کاری گرنگی دیکەش هەن کە ئەنجامیان داوە. بەڵام ئێستا بە پێچەوانەی ئەمانە لە نێو پێشکەوتنێکدایە.

**ماکار نیکۆ ڤایم** ــ پێش ئەوەی هزرە نوێیەکان لە روسیا دەربکەون، گەل قۆناخە تەنگژاوی و ئالۆزەکانی تێدەپەڕێنێ. گەل زۆر بیر دەکاتەوە.

**عەبدوللا ئۆجەلان** ــ بۆ دەرکەوتنی هزرێکی نوێ و جێبەجێکردنی هەڵمەتێکی گەورە، قۆناخێکی بەوجۆرە پێویست بوو. من لەو باوەڕەدام ئەم قۆناخە زێدە درێژ ناکێشێ.

# پێویستە لە پێناو یۆتۆپیادا بژین

ئێمە لەسەر پێداویستی سووربوون لەسەر سۆسیالیزم، هەڵوەستە دەکەین، هەروەها ئەمەش دەکەین بەدروشم؛ تاوەکو مرۆڤایەتی هەبێت، یۆتۆپیای سۆسیالیزم وەکو چێژی خەبات لەژیاندا دەبینرێت.

ئەمڕۆ سیستەمی سەرمایەداری ئیمپریالیست وەکو دێوەزمە بۆتە بەڵایەك بەسەر مرۆڤایەتییەوە. ئیمپریالیزم بەپشت بەستن بەتوانستە تەکنیکیەکانەوە زەبرێکی گەورەی لەدۆز و داخوازییەکانی رەنجدەران و کرێکاران وەشاندووە و، شان بەشانی ئەمەش بەشێوەیەکی ماددیانە و توندڕەوانە هێرشی کردۆتە سەر ئەو دەسکەوت و سەنگەرانەی کە لەسەدەی بیستەمدا یەکێتی سۆڤیەت بەدەستی هێنابوو، ئەگەر بەشێوەیەکی کاتیش بێت ئەمەی بەسەرکەوتن گەیاندووە.

ئیدی سیستەمی هەنوکەی سەرمایەداری بانگەشەی ئەوە دەکات کە کێشەی رەنجدەران نەماوە و یۆتۆپیای سۆسیالیزم بێ واتایە و ئەمەشی کردۆتە چارەنوسێکی ئەزەلی و هەتا هەتایی بۆ مرۆڤایەتی، تەنانەت چارەنوسێکی وەهای بەسەر مرۆڤایەتیدا سەپاندووە کە ناتوانێ خۆی لێ رزگار بکات.

ئەو هێرشانەی کە لە (90) کانەوە لەلایەن ئیمپریالیزم دەستیپێکردووە بەرلەوەی بکەوێتە سەدەی (21)مینەوە دەتەوێ ئەو سەنگەرانەی کە نەکەوتۆتە ژێر دەسەڵاتییەوە، ئەوانیش بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە و لەم پێناوەشدا هەموو هێزی خۆی بەکار دەهێنێ.

هەرچۆنێ بێ دەتەوێ تەواوی دونیای خۆی بەسەر تاکە رەنجدەرێ و کۆمەڵە شۆڕشگێرێکدا بسەپێنێ.

پێش ئێستا بەیەکگرتنی تەواوی سیستەمی ئیمپریالیست کەوتنە جموجۆڵ و هێرشیان کردە سەر کۆمەڵێك لە شۆڕشگێڕانی پیرۆ و کەوتنە جموجۆڵەوە. دەست لێبەردە پیرۆ، ئەگەر ئەو هێرشانەی کە "تیمە تایبەتەکانی" ڕژێمی ئۆلیگاریشی فاشیستی تورکیا کە بەهاوکاری و پشتیوانی نێودەوڵەتی دەکاتە سەر گەریلاکانمان و، هەروەها ئەو هێرشە شێت و هارانەی کە دەکرێتە سەر پێشەنگ و قەڵای دوایی کۆمۆنیزم PKK، بێنینە بەرچاوی خۆمان، ئەوا جارێکی دیکەش گرنگی پێناسە کردنی سۆسیالیزم دەبینین و کە سەرچاوەی پەیام و ڕێبەری ئایدۆلۆژیامانە.

**"یۆتۆپیای سۆسیالیزم لەهەموو کاتێ و لەهەموو شتێك زیاتر بۆ ئێمە پێویستە"**

یۆتۆپیا بەواتای خەیاڵە کۆمەڵایەتییەکان دێت. مرۆڤایەتی کاتێك هەنگاوی بەرەو پێشەوە هەڵهێناوە، کە خەیاڵ و یۆتۆپیای بەرزی هەبووە. کۆمەڵگایەکی بێ یۆتۆپیا کە مەحکومی ژیانێکی ڕۆژانەیە، تەنیا بەواتای ئەوە دێت کە مەحکومی ژیانێکی کۆیلایەتی قووڵە. ئەگەر مرۆڤێك، کۆمەڵگایەك، نەتەوەیەك، پارتیەك مەحکومی بێ یۆتۆپیایی بکرێت، واتە خەیاڵ و باوەڕی و هیوا سەرەکییەکانی لەدەست بدات، ئەوا ئەوەی دەمێنێتەوە تەنیا کەلاوەیەکی وێرانەیە. کۆمەڵگایەك ئەگەر تەکنیك و سوپا و سیاسەتی لەهەرکەسێك گەورەتریش بێت، ئەوا مەحکومی تێکشکان و پەرتەوازە بوونە. بەڵام ئەو کۆمەڵگایەی کە خاوەن بانگەشە و یۆتۆپیای زۆر بەرزە، هەرچەندە بچوکیش بێت لەماوەیەکی کورتدا ئەو سەرکەوتنانەی چاوەڕوان ناکرێ بەدەستی دەهێنێ و، تێکشکاندنی هێزی هەرە گەورەشی بەلاوە شتێك نییە و مێژوو پڕە لەنمونەی بەمجۆرە. هەرچەندە ئیمپراتۆریەتی ڕۆما کە بەهەموو گەورەیی و شکۆمەندی خۆیەوە، بەرامبەر بەمرۆڤ و مرۆڤایەتی زوڵم و زۆرداریەکی هەرە دژواری پیادە کرد، کەچی، حەزرەتی عیسا، لەگەڵ چەند حەوارییەك توانی بەرەنگاری ئەو ئیمراتۆریەتە ببێتەوە، هەرچەندە لەخاچیاندا بەڵام 12 حەواریەکانیشی درێژەیان بەو ڕێبازە دا. هەڵبەتە ئەم کۆمەڵەیە بەبانگەشە و یۆتۆپیای خۆیان، بوون بەهەڕەشەی هەرە مەزن بۆ سەر ئیمپراتۆریەتی ڕۆما.

هەرچەندە ئەو کاتە ئەم گروپە بچوك و بەباوەڕانە هیچ تەکنیك و هێزی گەورەشیان لەدەستدا نەبوو، بەڵام دواتر توانیان بەتێکۆشانێکی گەورە و بەپێداگرییەوە، لەماوەیەکی دیاریکراودا دونیا فەتح بکەن. هەروەکو دەزانین تا ڕۆژی ئەمڕۆشمان بەردەوامن و ئەو هێزەی خۆشیان دەپارێزن. ئەگەر لەگەوهەری خۆشی دوورخرابێتەوە، ئەوا ئایدۆلۆژیای ژیانێکی خاوەن کاریگەرە، لەجیهانی مەسیحیەتدا موسڵمانێتی یەکەم جار لەنیمچە دوورگەی عەرەب دەرکەوتە مەیدان. یۆتۆپیایەکی گەرمەسێلی بیابان بوو. کاتێك کە کۆمەڵە مرۆڤێك بەم

یۆتۆپیایەوە کەوتنە جموجۆڵەوە، دوای ماوەیەکی زۆر کورت نیمچە دوورگەی عەرەبی بوو بەمەڵبەندی ئیمپراتۆریەتی بیابان.

مارکس و ئەنگلس دوو برادەر بوون کە بەزەحمەت بژێوی خۆیان پەیدا دەکرد، کە یۆتۆپیای سۆسیالیزمی زانستیان دەرخستەمەیدان، رژێمی سەرمایەداری ئەو کاتە لەمێژبوو دەسەڵاتی خۆی بەسەر جیهاندا سەپاندبوو. کاتێ کە ئەم یۆتۆپیایە، لەماوەیەکی زۆر کورتدا بوو بە موڵکی کرێکاران و رەنجدەران، ئەوا کۆمۆنەی پاریس پێکهات و لەدوای راپەڕینەکانی 1905، شۆڕشی ئۆکتۆبەر، گەلێك بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی هێنایە ئاراوە، لەم میانەدا زۆری نەمابوو کە هەموو دونیا فەتح بکات.

ئەم نموونانەی سەرەوە ئەو راستینەیەمان بۆ دەسەلمێنن: کاتێك کە یۆتۆپیا لەتوانای داهەبوو مرۆڤایەتی خاوەن ماف دەرخاتە مەیدان و پێشیان بخات، ئەوا سەرەتا هەرچەندە ژمارەشیان کەم بێت و، چەندە تەکنیك و ئامێری دەستیشیان لاواز بێت ئەوە زێدە گرنگ نییە، بەس تەنیا باوەڕی هەبێت و لەو پێناوەدا بەپابەندبوونێکی پتەوەوە تێکۆشان بکرێت، ئەوا مسۆگەر لەتوانایدا هەیە سەرکەوتن بەدەست بهێنێت.

پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە PKKش دەرکەوتنێکی یۆتۆپیایی بوو.

ئەمرۆ لەریزەکانی ئێمەدا شێوە ژیانێکی رۆژانەیی، لۆژیکی خۆبەرێوەبردن و تەنانەت جەنگاوەریش بۆتە خویەك، کە هەمووتانی گەمارۆداوە. ئەمەش گەورەترین فریودانە. ئیدی وای لێهاتووە کە هەرکەس بەدەسەڵاتێکی (دەستەرۆیی) بچوك و تواناکاریەکانی ئەم دەسەڵاتە، تەنیا بۆ ئەوەی خۆی بژێنێ، تەنازول لەهەرشتێك دەکات.

ئەمەش نزیکایەتی و رەوشێکی زۆر پێچەوانە و ئاوەژووە لەگەڵ تایبەتمەندی بنچینەیی و گەوهەری PKK.

ئەمە زۆر ئاشکرایە کە کاتێ ئێمە سەرەتا دەستمان بەتێکۆشان کرد هیچ کاتێ وەهامان بیر نەدەکردەوە و نەماندەگوت: "PKK سکمان تێر دەکات و بەدەسەڵاتی PKK خۆمان بەهێز دەکەین، لەسایەی PKK وە ژیانێکی تایبەتی پێکبهێنن" و خەیاڵی بەمجۆرەشمان نەبووە.

بەپێچەوانەوە باوەڕی و بیری مەزنی راستمان هەیە و، گوتمان "ناتوانین ئەمەش بەهیچ شتێك بگۆڕینەوە". پیشە و ژیانێکی خاوەن باوەڕمان هەبوو، لەبەرامبەر ئەمەدا و لەبەرامبەر ئەو خەیاڵانەی کە بەبنچینەمان وەرگرتبوو، سیستەمێکی زەبەلاحی فاشیست هەبوو و، لەو کاتەشدا هێزێکی بالای رەهای هەبوو. رەنگە ئەو توانستانە نەبوون کە بەتەواوەتی لەگەڵ ئەم سیستەمە بکەوینە نێو کێشمەکێش، وەلێ ئەو راستیانەمان هەبوو کە شانازیمان پێوە دەکرد و باوەڕیمان پێدەهێنا. بەو بۆچونانەی کە ئەمە گوزارشت لەبەرژەوەندیە ژیانییەکانی رەنجدەرانی گەلێك دەکات، واتە لەمیانەی زانیاری سۆسیالیزم و

ئەو سیستەمە باوەڕیەی کە خوڵقاندوویەتی، سەر بۆ هیچ کەسێك دانانەوێنێت، دوژمن کێ دەبێ و چۆن دەبێ بابێ هەرگیز گوێی پێنادەین و لەم پێناوەدا سەریخۆشمان دانانەوێنین. ئەگەر سەرنج بدەن، ئەوسا هەندێ پارەمان بەدەستەوە بوو، ئەوەشماندا بەچەند پەرتوكێكدا.

ژیانی رۆژانە بۆ ئێمە تەنیا ئامرازێکی ئاسایی (سادە) بوو، وەلێ خەیاڵەکانمان، زانیاری سۆسیالیزمیمان سەرچاوەی باوەڕیمانە، بەها پیرۆزەکانی ئێمە بوو کە بێ ئەوانە نەماندەتوانی بژین و، ئەوانە هێزی بەڕێوەبردنی ئێمە بوون.

تاوەکو ئێستاکەش شایەنی بەبیرهێنانەوەیە کە مسۆگەر؛ هەقیەکان، کەمالەکان خەیریەکان، مەزلۆمەکان، شۆڕگێڕ و خەباتگێڕی ئەم باوەڕیە مەزنە بوون و تەنانەت لەژێر سەخترین و قورسترین هەلومەرجدا هەستیان بەبچوکترین پەشیمانی و تەنگەتاوی نەکردووە و هەڵسوکەوتێکیشیان نیشان نەداوە کە دەور و بەری خۆیان ناڕەحەت بکەن.

ئەوانە گوزارشت لەبنەمای پیرۆزی ژیانی PKK دەکەن. ئەمەش ژیانێکی یۆتۆپیانەیە.

ئەوانە بۆ ژیانێکی ئازاد خەیاڵ، بانگەشە، هیوا و باوەڕییان لەسەرووی هەموو شتێکەوە داناوە.

ئەوانە دەیانتوانی ببنە خاوەن پیشەیەکی باش، وەلێ بە وشیاریەوە دەست بەرداریيان لەوەکرد و مسۆگەر دەشیان زانی کە لەم رێگایەشدا شەهید بوون هەیە. وەلێ نەکەوتنە نێو بچوکترین دوودڵی و پەشیمانیەکەوە، هەموو رۆژەکانیان بەجۆش و رۆژانی جەژن بردەسەر. من هەمیشە ئاماژە بۆ ئەم گەوهەرە دەکەم، وەلێ ئەگەر سەیری PKK ییەکانی ئەمڕۆمان بکەین وەك ئەوە وان کە خەیاڵ و هیوایان نەمابێ!

لەکوێدا دەسەلاتی PKK ، لەکوێ ئیمکانی PKK ماڵێکی ئاسوودە هەبێ، لەکوێ جێگایەکی خۆش و زەنگین هەبێ بەڕێوەبەران چاو دەبڕنە ئەوێ. ئەگەر پێویست بکات ئەمانە هەزار جار دەڵێم و دووبارەی دەکەمەوە.

دەستبەردان لەیۆتۆپیا و خەیاڵ و وشیاری و باوەڕی PKK ، بەواتای ئەوە دێت کە مەزنترین خراپی بەرامبەر بەخۆمان بکەین. هیچ کەسێك و بەهیچ بیانویەکەوە مافی ئەمەی نییە.

تاوەکو ئێستا دەگوترێ و ئەمە بەئێمەش دەگات کە :" باشە چێژی ماددی ئەم ژیانە چۆن دەبێت یاخود ئەنجامەکانی پراکتیکی چۆن رووبەڕوومان دەبێتەوە؟" ئەمانە، بەجۆرێك ئیسلامیان پێ دەگوترێت، کەچی ئەم توێژە بەتەواوی گوزارشت لەمونافیق دەکەن و، لەشوێنی ئەوەی ئەم تێکۆشانە بەم شێوەیە هەڵبسەنگێنرێ کە رۆحی مرۆڤی ئەوەندە بەرزکردۆتەوە و، وشیارییەکەی ئەوەندە پرشنگدار کردووە، بەختەوەری و ئاسوودەییەکی کە هیچ کاتێك بەبەها ماددیەکان ناگۆڕێتەوە و، خولقاندوویەتی؛ وەکو مونافقێك ئەڵێ " دەدزم ـ دەڕفێنم

بەشێوەیەکی هەرزان ژیان بەسەر دەبەم" ئێمە نامانەوێ تەنانەت ناویشیان بهێنینە سەرزارمان.

من سەیری ژیانی خۆم دەکەم: من زۆر باش دەزانم کە ژیانی ماددی چ واتایەك لەخۆوە دەگرێ. هێشتا لەبیرمە کە بۆچەند فلسێك دەگریام بۆ بەدەستخستنی خواردنێکی باش کاری قورسم دەکرد، وەلێ دواتر لەپێناو باوەڕیەکانم، تاڕادەیە بیرم لەئازادی کردەوە. لەهەندێك پەرتووك و زیاتر لەمیانەی ژیاندا، لەلێگەرینێك دابووم و ئەوەی مەبەستم بوو، دۆزیمەوە. تاوەکو ئەمڕۆش لەسەربنەمای ئەم لێگەڕینانەوە بەرێوە دەچم. ئەو بەهایانەی کە لەقۆناخی منالیمدا بەدوایدا وێڵ بووم، ئەمڕۆ بەلامەوە بێ نرخن.

هەرگیز خۆم گەورە نابینم و، بەلای منەوە هیچ شتێك هێندەی خەیاڵە هەڵقوڵاوەکان و بۆچوونە خوڵقکارەکان و پراکتیکی رێبەڕایەتی بەنرخ تر نابێت و، تەنیا ئەمە لەتوانایدا هەیە من تێر بکات.

ئەمە لەهەمانکاتدا بەگوێرەی یۆتۆپیای سۆسیالیزم گوزارشت لەهێزی سەرنج راکێشەری ژیان دەکات.

ئەگەر هەرە بەهێزیان من بم، ئەوا ئەمە لەبەرئەوەیە کە یۆتۆپیای سۆسیالیزم بەهێزە. چونکە پابەندم بە یۆتۆپیای سۆسیالیزم. بەدڵنیاییەوە جگە لەوە تایبەتمەندیەکی دیکەم نییە.

لەم واتایەدا ئەگەر ئەمڕۆ PKK بزوتنەوەیەکی هەرە بەبانگەشەیە و بۆتە خەونێکی ترسناك بۆ ئیمپریالیزم ــ سەرمایەداری، ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە PKK گرێدراوی یۆتۆپیای سۆسیالیستە. سەرباری ئەو هەموو هەولانەی کە لەدژی دەکرێن وەلێ ئەنجامیان نەگرتووە و بێ سوودن، چونکە لەچەمکی سۆسیالیزمدا هەرگیز پاشگەز نەبۆتەوە و تێکۆشانێکی زۆر گەورەی بەچێژەوە لەژیاندا پێکهێناوە.PKK شتێکی لەمە جیاوازیش نییە، ئەگەر لەهەموو لایەنەکانیدا و لەژیاندا پێکبهێنرێت، ئەوا سەرکەوتنی PKK هەرگیز ئاستەم ناکرێت.

باهیچ کەسێك بەهیچ بەهانەیەکەوە نەخۆی و نەئێمەش هەڵنەخەڵەتێنێ، چ لەنێو ئێمەدا بێت یان لەدەرەوە و ئێمە چیمان، چۆن خوڵقاند باش دەزانین، ئازادیەکی ئاوامان بەدەست خستوە، کە هیچ هێز و کەسێك لەمێژوودا بەدەستی نەخستووە، ئەو شتەی کە هیچ باوەڕی و ئایدۆلۆژیایەك لەمێژوودا پێکینەهێناوە و، ئێمە لەمیانەی ئەم یۆتۆپیا و ئایدۆلۆژیایە پێکمان هێنا.

ئایا ئەمانە هەموو لەسایەی سۆسیالیزمەوە پێکهات! ئاخۆ هۆکاری جیاواز هەبوون کە ئێمەیان پێشخست؟ بەڵێ رێزم هەیە بۆ رەنجی گوندیەکان، رێزم هەیە بۆ سەرهەڵدانی مرۆڤە

چەوساوەکان و کۆششی رۆشنبیرانیش بچوك ناکەمەوە. بەڵام ئەگەر من خۆم پەروەردە و، رێکنەخستایە و، سەرۆکایەتیم بۆ نەکردبایە، ئەوانەش بێ واتا دەبوون. رۆشنبیرەکان بەرامبەر بەهەڕەشە و هێرشێکی بچووك، لەماوەیەکی زۆر کورتدا یان پەشیمان دەبوونەوە یاخود پەرتەوازە دەبوون، یاخود لە لەنێوچوون رزگاریان نەدەبوو لەبەرامبەر رژێم و دوژمنێکی وەهادا.

ئەی رەنجدانی گوندیەکان چییە؟

سەدان ساڵە خەبات دەکەن و کاردەکەن کەچی ناتوانن "سکی خۆشیان تێر بکەن" لەنێو ئارەقەی حەمبالی و کاری سەختدان. . ئەوەندەی دەتەوێ و دەتوانێ با تێبکۆشێ، بەڵام بەمشێوە بێگاریە (سوغرەیە)، ناتوانێ هیچ شتێك رزگار بکات و بەدەست بێنێ.

لێرەدا شتێك کەمە: بۆ ئەوەی گوزارشت لە واتایەك بکات، یۆتۆپیای سۆسیالیزم، باوەڕی، هۆشیاری، رێکخستن، پێویستە؛ بۆیە ئێمە دستبەرداری ئەمە نابین. لەبەر ئەوەی سووربوونی سەرۆکایەتی و ئەو تایبەتمەندییەی PKKمان خستە پێش هەموو شتێك، ئەمڕۆ PKK بەهێزە. PKK بەرامبەر دونیا شەڕ دەکات،

**"سەرۆکایەتی PKK بەهێزە، بەردەوام خۆی بەهێز دەکات"**

لە سەردەمێکدا کە سۆسیالیزم رووبەڕووی زۆرترین هێرش بووەوە و بەڕادەیەك کە هەموو سەنگەرەکانی لەدەست دا، گرێدراو بە سۆسیالیزم مانەوە، هەروەها بەردەوام پەیوەست بوون لەسەر بنەمای باوەڕی و هۆشیاری، مسۆگەر رێگای بۆ ئەمە کردۆتەوە و ناچاریشین دان بەمەدابنێن. زۆربەتان بە شێوەیەکی شەرمنانە دەڵێن " ئەو سۆسیالیزمە لە کوێ دەرکەوت". هەم لەناو ئێمەدا و هەم لە دەرەوشدا ئەوانەی بەم شێوەیەی بیر دەکەنەوە، ژمارەیان کەم نییە. لێرەدا بە شێوەیەکی زۆر سەرنج راکێش پێویستە بڵێم ئەوەی من لە سۆسیالیزم تێگەیشتووم. باوەڕی بە ئازادی و هۆشیاری ئەمە یە. هەروەها زەوقی تێکۆشانە لەپێناو ئەمە. مسۆگەر پێویستە لەم دوو زاراوەیە تێبگەن و پێویستییەکانی جێبەجێ بکەن.

پێویستە لە پێناو یۆتۆپیادا بژین، خەیاڵەکان بوونیان دەبێ. خەیاڵەکان چین؟

ئەمڕۆ کاتێك گەل و وڵاتەکەمان دەبێتە جێگای باس؟ ژیان و ئازادیەکی بەدڵی ئێمە هەبێ یاخود ئیرادەیەکیتر، نموونە ئیرادەی داگیرکەرێك تێکبشکێنرێت و وڵاتێکی سەربەخۆ دروست بکرێت. دروست کردنی وڵاتێکی سەربەخۆ ، واتا دروستکردنی گۆڕەپانی خەباتی سەربەخۆ و ئاواکردنی گۆڕەپانی کاری سەربەخۆ.

لەم واتایەدا، پێك هێنانی چوارچێوەیەکی زەبەلاح و گشتگیرە بۆ بەرهەمهێنان. دەوڵەتێکی سەربەخۆ ئەمەیە. هەرچەندە وەکو یۆتۆپیاش دێت، ئەگەر ئەو یۆتۆپیایە هەندێك بەرجەستە ببێت، بەو ئامانجەی کە دەردەکەوێتە مەیدان چەندی بخوازی لەسەر ئەو خاکە بە

ئازادی رەنج دەدەی، بەرادەی خولقاندنی بەهەشت دەتوانی هێزی بەرهەمهێنان بەکار بێنی. ئەمەش بەواتای راکێشانی خەڵك دێت بەرەو چالاکی خولقاندنی بەهەشت. ئەمەیە وڵاتێکی سەربەخۆ و سۆسیالیزم.

خوڵقاندنی گەلێکی ئازاد واتا پارچەکردن و تێکشکاندنی ئەو کۆت و بەندانەی کە دەبنە مایەی ئیفلیج کردنی رۆح و دیل کردنی ئیرادە و هۆشیاری ئەو . کاتێك ئەمە بەرجەستە دەبێت، هەموو کاتێك لەدوای پیلانەکان، بیری پێشکەوتوو و ئیرادەیەکی بەهێز دەردەکەوێتە مەیدان. ئەگەر بگەیینە ئاستی گەلێکی وا کە خۆی دۆزیوەتەوە و خۆی ناسیوە. کاتێك ئەو گەلە لەسەر خاك و وڵاتی ئازاد و رزگار کراوی خۆیدا بکەوێتە نێو کارکردن، ئەوا هیچ شتێك نییە کە نەتوانێ نەیخولقێنێ.

لێرەدا تا رادەیەك ئەمەیە یۆتۆپیای سۆسیالیزم و یۆتۆپیای بەهەشت.

خەبات، دوای ئەوەی بە یۆتۆپیا گرێدەدرێت، بو نموونە شەڕی رزگاری نەتەوەیی خەباتێکە، بەڵام لە پێناو یۆتۆپیای سەربەخۆیی نەتەوەیی، لە پێناو ئازادی گەل یۆتۆپیایەکە و رێکخستنی گەلیش کارێکە. لێرەدا پارتی خۆی خاڵی یەکخستنی خەیاڵ و رەنجە بە شێوەیەکی هەرە وەستایانە و هونەرمەندانە. لەبەر ئەوەیە ژیانی پارتی ژیانێکە کە دەفرێت. چونکە خەیاڵ و رەنجی سۆسیالیزم وە یان رەنج و خەیاڵی سۆسیالیزم، واتە خەیاڵ و باوەڕی ئەو بووە بە یەك و بە رەنجی ئازاد، بەڕەنجی ئەو مرۆڤە کە ئازاد بووە ، هێزیکی سەرسوڕهێنەرە.

لەم واتایەدا، سەرۆکە سۆسیالیستەکان کاتێك دەست بە خەباتێك بکەن، بەرەو پێشەوەی دەبەن و گشتگیری دەکەن. ئیدی ئەمە خەباتی ئابووری بێت، سەربازی بێت، رێکخستن و پرۆپاگەندە بێت یاخود هەر خەباتی تر بێت. بۆچی؟ چونکە لەوێدا خەیاڵێکی مەزنی سۆسیالیستانە و زەوقی کارکردن دەبنە یەك؟ بۆیە بەم شێوەیەن. رەنجدەرە سۆسیالیستە قارەمانەکان و هونەرمەندە سۆسیالیستە قارەمانەکان بەردەوام بەمشێوەیە دردەدەکەونە مەیدان.

ئەگەر یۆتۆپیا زۆر سەرنج رانەکێشێت و خۆی نەگەیەنێتە ئاستێك کە بڵێ " من لەوانەیە بێ نان و ئاو بژیم، بەڵام بێ خەیاڵی ئازادی ناتوانم بژیم". هەروەها لە خەباتی نوێی شۆڕشگێری ئیدی لەخەباتی پراکتیکدا، لە شەڕ بگرە هەتاکو ژێرخان و هەموو کارەکانی تر، هەتا کاری بونیادنانی کۆمەڵگایەکی سۆسیالیست نەکاتە ئارەزویەك نابێتە سۆسیالیست.

ئە وەی من رۆژانە لەسەر پێ رادەگرێ ئەوەیە کە بە هەندێك ئامانجەوە گرێدراوم، پێی دەڵێین ئامانجی مەزن.

ـ وڵات رزگار دەبێت؟

ـ گەل ئازاد دەبێت؟

ـ شەڕ بەردەوام دەبێت؟

خەیاڵ و پراکتیك ئەوەندە سەرنج راکێشە و بەردەوامە ، ئێدی هەبوونی فیزیکیمان هەرچۆنێ بێت کەوتۆتە نێو ناخۆشی.

سەیری هەندێك دەکەم: هەبوونی فیزیکی و ماددی و رۆحی، هۆشیاری تێکشکاوە و خۆراوە. هەروەها هەبوونی فیزیکی هەروەکو باڵۆنی لێهاتووە یا قەڵەو بووە و زۆر بێبەرهەمە واتە تەمبەڵ بووە. کار بۆ خۆی وەك حەمباڵی دەبینێ.

دیسان ئەمە منداڵێتییەکی زۆر کۆنە. با یەکسەر دایکم بەبیر بێنمەوە. کار بۆ من بە تەواوی وەکو حەمباڵی دەهات. کاری پەموو و بژارکردن؛ هەموو کاتێك دەمگوت :"نابێ بەم شێوەیە کارناکەم". لەڕاستیدا زۆرم کار دەکرد بەڵام کار بەگوێرەی خەیاڵی من لەوێ نەبوو. هەروەها من لەم کارانە نارەحەت دەبووم ، بۆچی؟ چونکە ئەمە کارێکی بێ یۆتۆپیایە.

دیسان خەیاڵێکم هەبوو: ئایا بچم بۆ ئەوێ، ئەمە بەدەست ناخەم. دەمگوت دەفڕیم هیچ هێز نەیدەتوانی بمگرێت. ئەمە هەولێکی گرێدراوی خەیاڵ بوو. لە شوێنی ئەمە کاتێك بە پێی پێوانەکانی باوکم و خێزان، بۆ بەدەست هێنانی نانێك دەیانگوت " بڕۆ ئەو کارە بکە". لە نێو تەمبەڵییەك دا بووم کە باوەڕ ناکرێت. هەڵنەدەستامەوە. دوو سێ بەردم دانەدەنایە سەر یەکتری. تەنانەت هەڵنەدەستام جامێك ئاو بێنم. بۆچی؟ ئەمە بۆ من لەنێو سیستەمی خێزاندا وەکو کارێکی بەکرێ وابوو. ( هەڵسە ئەمە بکە، ئێمەش ئەمە بە تۆ دەدەین). نەك لەبەر ئەوەی تەمبەڵ بووم کارم نەدەکرد. بەمشێوەیە کارم پێ خۆش نەبوو. ئەگەر نا بۆ کارێکی جیاوازتر بەڕاکردن دەچووم و وەکو رەشەبایەکم لێدەهات.

لێرەدا جیاوازی لە نێوان دوو کاردا هەیە: یەکێکیان کارێکە گرێدراوی بانگەشەیە. ئەویتر بە کرێیە. یا خود بە سیستەمەوە گرێدراوە. کارێکە کە بە گوێرەی خێزان و سیستەم، چەندی لە یەکێکیان رابکەیت، چەندی تەمبەڵی بکەیت. لەوەیتریان ئەوەندە چالاك دەبیت و ناتوانرێت کۆنترۆڵ بکرێت. دوای ماوەیەك بەتەنیا دەستم بەم دۆزە کرد.

تا ئێستاش هەرکەس دەڵێت (نهێنیەکانیمان دەرنەخست).

دوای ئەوەی بە گوێرەی خۆمان باوەڕی و هۆشیاریەکەمان پێکهێنا. خۆمم بە شێوەیەکی سەرسۆڕهێنەرانە بەکار هێنا. دەتوانین بڵێین لەسەر ئەو بنەمایە خەباتی سیاسی و سەربازی بە خێرایی فرۆکە ئەنجام دەدەم.

لە رابردووشدا نموونەیەکم هێنابووەوە: بە گوێرەی من خێرایی سیاسەتمەدار و شەڕکەرەکان هەتا لە نێو ئێوەشدا شەروانی وەك ئەوە وایە کە لە دەشت دا لە سەر پشتی حوشتر یا خود لەسەر پشتی کەر بەڕێگا دا بڕۆن. ئەگەر شتێکی هەندێك پێشکەوتووتری

شایانی ئەم خێراییە ببینینەوە، ئەوا بە ئەتۆمبیلێکی کۆن یاخود بە لۆریەکی مودیلی 1950 دەچێت. وەکو خێرایی پاسێکیش نابێت. بەڵام ئێمە ئێستا سیاسەت وەکو خێرایی فڕۆکە بەڕێوەدەبەین. هەتا یەکێك دەیگوت وەکو خێرایی تیشکە. بەڵێ، خەیاڵەکانی سۆسیالیزم بەم رادەیە کار ئەنجام دەدات. بەتایبەت کاتێك فاشیزم دەیەوێت تاریکایی خۆی بە شێوەیەکی رەها باڵادەست بکات، تۆش بێ ئامان بە خەیاڵەکانی خۆتەوە گرێدراو بیت. ئەوا سیاسەت و شەڕی تۆ خێراییەکەی وەکو موشەکە هەتا دەتوانێ بگاتە خێرایی تیشك. ئەمەش هێزی هیچ دوژمنێك نایگاتێ. بەڵێ ئێمە ئەم هێزە نیشان دەدەین. ئایا لە دەرەوەی ئەمە دەتوانین پێناسەیەکیتری PKK بکەین؟ و یان دەتوانرێت ئەو سۆسیالیزمەی کە لە PKKدا بەرجەستە بووە، لە دەرەوەی ئەمە گوزارەی لێبکرێت؟ باوەڕ ناکەم. چونکە خۆی لە بنکەوتن رزگارناکات.

باشە بۆچی ئێمە بەو پێناسەیە گەیشتین؟

**"ژیان بۆ خۆی شەڕێکی بێ ئامانە"**

PKK ناچار بوو سۆسیالیزم بەم شێوەیە پێش بخات. خاوەن بانگەشەکان و خەیاڵەکان و یۆتۆپیا بێت، لەهەمان کاتدا سەرسوڕهێنەرانە لەنێو ئارەزوی کارکردندا دەبێت.

خەباتی رێکخستن بۆ من زەوقێکی گەورەیە.

لە رابردوودا بۆ ئەوەی بە ئاسودەیی بخەوم لە کات گەڕام. بۆ ئەوەی بە کەیفی خۆم خۆم درێژ بکەم و بە کەیفی خۆم نازانم چی بکەم. رۆژم دەژمارد بەڵام ئێستا ئەمانە هەمووی بۆ من وەك ئەشکەنجەنە. هەرچەندە بونیاد زەحمەتیش ببینێ، هەوڵە سۆسیالیستیەکان پرۆپاگەندە، رێکخستن ...هتد ئیدی بەڕێوبردنی رێکخستن و شەڕ بۆتە خوویەکی مەزن.

ئارەزوو بە واتای بێ ئەو ئەنجام نادرێت، دێت.

دەتوانین بڵێین کە سەرۆکایەتی PKK سۆسیالیزمی تەنها لە میانی ئەم پێناسە گشتییە لە خۆدا بەرجەستە نەکردووە. لەهەمان کاتدا سۆسیالیزمی بونیادنراو هەیە کە قۆناخێکی پاکتاو کرد. نەمانی خێرایی قۆناخەکانی رزگاری نەتەوەیی لە ئارادایە. سیستەمی ئیمپریالیزم خێرایی مەزن بەدەست دەهێنێ. لەبەرامبەر ئەمانە هەمووی، PKK خۆی نوێدەکاتەوە. با خۆ نوێکردنەوە لە بەرامبەر ئەمانە لەولاوە بمێنێ. بەرەو ئاستێك دەچێت بە خێرایی و شێوازی غاردان لە سەرکەوتنێکەوە بۆ سەرکەوتنێکی تر دەچێت.

بە بۆنەی رۆژی کرێکاران ئەو خەڵاتە بەنرخەی دەتوانین بیدەین بە رەنجدەرانی جیهان ئەوەیە کە، لە کەسایەتی PKKدا گرێدانێکە بەم شێوە خەیاڵانە و هەوڵی شۆڕشگێڕی وەهایە کە بن ناکەوێت و پراکتیکی شۆڕشگێڕانەی سەرکەوتووە، هەروەها گەیاندنی ئەمە بە

سەرکەوتنی بێ پسانەوەیە. خەڵاتی لەمەش بەنرختر پەیدا نابێت. چونکە سۆسیالیزم لە قۆناخێکدا تا ئەو رادەیە یاری پێکرا کە دەیانگوت ئیدی بۆ شتێك بەکار نایەت، ئەو سۆسیالیزمەی لە کەسایەتی PKKدا بەرجەستە ببێت، هێزێکی گەورەیە .

سیستەمی سەرمایەداری ـ ئیمپریالیستی کۆمەڵگای لە هەموو بەها مرۆڤایەتییەکان دابڕیوە، یا بەها مرۆڤایەتییەکان لە نێو کۆمەڵگادا خنکاون. بەمەش تێر نابێت، پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤ و سروشت تا ئاستی لەناوبردنی سروشت و تارومار کردنی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و سروشت کە مرۆڤایەتی بە شێوەیەکی رەها پێویستی پێی هەیە بردووە. سەرچاوەکانی ژێر زەوی و سەر زەوی ئەوانەی کە بۆ مرۆڤایەتی زۆر پێویستن و سەرچاوەی ژیانین، گەیاندوەتە رەوشێکی وەها کە سوودیان نەبێت.

**"لەچوارلاوە مرۆڤایەتی لەژێر هێرشدایە"**

لەپەسندکردنی رەوشی سۆسیالیزم لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لەبەرامبەر ئەو سیستەمە زیاتر، بەشێوەیەکی چەوت کەوتنە رەوشێکی پێچەوانەی شەروانانی سۆسیالیزم کە سەدان ساڵە لەپێناو مرۆڤایەتی تێدەکۆشن، لەواتای خیانەت زیاتر شتێکی تری لێ ناکەوێتەوە. بەتەواوی بەپێچەوانەی ئەمەوە، بەڵکو لەهەموو کاتێك زیاتر. سەرنج راکێشانی یۆتۆپیای سۆسیالیزم و دەستبەرنەدان لێی، لەهەمووش گرنگتر نەوەکو شێوەکاری حەمباڵیانەی سەرمایەداری، بەڵکو بەبنەماگرتنی شێوەکاری سۆسیالیستیانە کە زەوق دەبەخشێت، بەخستنیە پێش هەموو شتێك، دەبێتە تاکە رێگای رزگاری بوونی مرۆڤایەتی. هەروەکو بەئومێدێکی مەزنەوە پێیەوە گرێدراوین لەهەمان کاتیشدا هەست بەدڵخۆشیەکی مەزنیش دەکەین.

**هیچ کاتێك هەستمان بەپاشکۆیەتی نەکردووە.**

ئەمڕۆ دەڵێن ئەوەندە "مرۆڤەم فەتح کردووە" نامەوێت بەگوێرەی بۆچوونی سەرمایەداری بۆ بەهاکان تەنازول بۆ ژیان بکەم. سەرەڕای ئەوەی بووینە پارتیەك کە بەردەوام لەژێر ئەشکەنجەداین، سەرەڕای ئەوەی ئەوەمان بە بەرپرسیارێتییەکی مەزن لەنێو ئەشکەنجەی تاڵی و سوێریەکان بەڕێوەبرد، تائەوڕادەیەی، ئەو زەوقەی کە ئەم ژیانە دەیدات بەهیچ بڵێت تری ناگۆڕینەوە، بە باوەڕیەوە سەیری خۆم دەکەم. بەقەناعەت بەغرور. ئەگەر وابڵێ بە شتێکیتر دەگۆڕمەوە، ئەوکاتە نەکو من هیچ حسابی گۆڕینەوە ناکەم، ئەوا تەنانەت بەهیچ شێوەیەك نامەوێت سەیری رووی ئەو کەسە و ئەو ئایدیۆلۆژیایە و ئەو سیستەمە بکەم. لەبەرئەوەی خاوەنی یۆتۆپیایەکی مەزنین یاخود یۆتۆپیامان پێشخست. باس لەمە ناکەم، دیسان ناشڵێم لەنێو رەنجێکی گەورەی کارکردنداین. لەنێو غروری پەیوەستمان بەمرۆڤی سۆسیالیست و بەشێوازی کاری ئەودا دەژیم.

نرخی پێ دەدەم و وەکو پرەنسیپێك پێکی دەهێنم. بەبێ ئەوەی خۆم هەڵبخەڵەتێنم بەشێوەیەکی زۆر هۆشیارانە و بەپیلان. ئەمە لەبەرئەوە نییە کە لەچوارچێوەیەکی تەسکدا ماوم یاخود بەمە توانستی پێشکەوتنم بەدیهێناوە، بەڵکو ئەمە لەبەرئەوە پێك دەهێنم؛ چونکە ئەمەم وەکو شێوازێکی دەست لێبەرنەدراوی ژیان بینی. لەڕەوشێکی وەهادا لەسەریدا ئێوە وەکو PKK یی ئەو ئەنجامەی کە پێویستە لێی دەربخەین چییە؟

ئەگەر دەکرێ خۆت بەم شێوازە بە PKK یی بکە.

ئێوە باس لەگرێدان بوون دەکەن، هەموو رۆژێك سوێند دەخۆنەوە ئەگەر بەگوێرەی من پەیوەست بوونێکی سنوورداریش هەبێت، ئەوا بۆ بوون بە میلیاتانێکی سۆسیالیستانە هیچ هۆکارێك نییە. ئەگەر میلیتانێکی سۆسیالیستیی باش بن، ئەوا لەبواری هەر کارێکدا کە گرتوتانەتە دەست، هەم کارکردن بەزەوقێکی گەورە، هەم لەبەرئەوەی بەردەوام پڕن لەهۆشیاری و باوەڕی، هۆشیاری ڕێگاتان رووناك دەکاتەوە، باوەڕیش ئیرادەتان بەهێز دەکات هەربۆیەش هیچ هۆکارێك نییە، بۆئەوەی نەبنە خاوەن رێپێوانێکی تۆکمە. ئەگەر دووڕوو نین و خۆتان بەنەخۆشیەکانی رژێم ئیفلیج نەکردووە، هۆکارە بەرامبەرەکان کاریگەر نابن لەسەر ئەوەی کەببنە خاوەن رێپێوانێکی سەرکەوتووانە. هەروەها هیچ یەکێکتان ناتوانن باس لە بەهانەیەك بکەن کە ببێتە رێگر لەبەردەم ئەوەی کە نەبوونەتە خاوەن رێپێوانێکی تۆکمە و نەبوونەتە میلیتانێکی راستی PKK. یاخود بڵێین ئەو هۆکارە منی وەها لەنگ کرد، ئەو هۆکارە نازانم منی چی لێکرد. ئەو تایبەتمەندیە، PKK لە PKKیی بوون دوور دەخاتەوە. گوتنی وەکو ئەو تایبەتمەندییە چینایەتیانە... هێرش کردنە بۆسەر باوەڕی بەرزی رەنجی سۆسیالیستیمان وەکو دز یاخود وەکو دوژمن.

لەم واتایەدا ئەو کارەی پێویستە لەسەرەتاوە بیکەین ئەوەیە؛ ئایا من سۆسیالیستێکم؟ لایەنی کەم خۆم گەیاندۆتە ئەو هێزە لەسەر شێوازی سەرۆکایەتی؟

ئەو پرسیارانە لەخۆتان بکەن و هەوڵ بدەن وەڵامەکانیشیان بدەنەوە و ئەوانەی وەڵامی سەرەتای پرسیارەکان نەدەنەوە، دەتەوێ بادەوڵەتیش دامەزرێنن، نابنە خاوەن هیچ سەرکەوتنێکی جددی. گوایە سۆسیالیزمی بونیادنراو چۆن هەڵوەشایەوە؟ نازانم چەند سەرکەوتنێك بەدەست بهێنێ، سوپای سۆڤیەت زۆر سەرکەوتنیشی بەدەستهێنا، بەڵام ئەمڕۆ سوپای سوور لەدونیادا خراپترین سوپایەکە کە چەکی خۆی بە (5) قروش دەفرۆشێ. هەڵبەتە کاتێك پەیوەندی بەیۆتۆپیای سۆسیالیستی دەپچڕێ، وەهای لێ دێت. ئێوە سەرکەوتنی بەم شێوە مەزنیشتان نییە. ئێوە هێشتا بەشێوەیەکی راست و دروست پێویستی یەکانی کاری ئازادیشتان پێك نەهێناوە.

باوەڕی و خەیاڵی وەها بەهێزتان نییە.

پێویستە دڵ نـزم بـن، پێویستە بـۆ بـوون بەسۆسیالیست هەستیاری نیشان بدەن. دەبێ بەباوەڕی و هۆشیاری و رەنجی دەست لێ بەرنەدراوی ئەمە خۆتان بکەن بەخاوەن کەسایەتی. تائەمـە پێـك نەیـەت، هـیچ نزیکبـوونێکی ئێـوە، هـەتا کارەکانیشتان، ئەگـەر چـەند شـەڕێکی گەورەش ببەنەوە یاخود تەنانەت ببنە دیماگۆژێکی گەورەش. ئەوا گوزارە لە نرخ و بەهایەکی وەها ناکات.

مـن لـەناو PKK دا بۆچـی دەتـوانم ئەوەنـدە بەکاریگـەر بم؟ بـاس لـەوە ناکـەم کارەکـان تەواون و بێ کەم و کورتین. گفتوگۆکردن لەگەڵ مرۆڤەکان لەسەربنەمای ئایدیاکانمان کارێکی سادەیە. پەیوەندی دروستکردن کارێکە هەرکەس دەتوانێ ئەنجامی بدات. ئەگەر ئەمە شەڕیش بێت، ئەوا لێرەدا کارەکان مەزنتر دەبـن، واتـا دان بەسوپای دوژمـن یـاخود هـی خـۆی، قـوڵایی یەکی زیاتر لەخۆوە دەگرێت. تەنانەت کەسایەتییەکی هەندێك سۆسیالیستیش بێت بیر لـەوە ناکاتەوە کە مەودا وەرنەگرێت. ئەگەر نا دیماگۆژێك بێت رەنـج دز بێت،

وەیاخود گوندەیەك، حەمباڵێك، رۆشنبیرێك بێـت، زوو یـا درەنـگ ئەگـەر سەرکەوتنیشی هەبێت لەئەنجامدا مەحکومی ئیفلاس کردنە.

نـەبینراوە لـەدەرەوەی رێگـای دزی هـیچ گوندیـەك بـەرەنجی خـۆی گەیشـتبێتە ئاسـتی کاربەدەستی. نەبینراویشە کە هـیچ دیماگۆژێـك بـەبێ ئـەوەی بەشێوەیەکی رووکەشـانە مـرۆڤ بخـولقێنێ، هێزێکـی سیاسـی یـاخود سـەرکەوتنێکی سـەربازی بەدەسـت بهـێنێ. سـەرکەوتنی یـەکێکیان لـەدزی کـردن دایـە و ئـەویتریش لـە هەڵخەڵەتانـدنی مرۆڤدایـە. دزەکـان دەدزن و دەرفێنن بڵند دەبن، دەبنە مەزنترین. دیماگۆژەکانیش بەدرۆ مرۆڤەکان دەخەوێنن و لەوانەیە ببنە دکتاتۆرێك. ئەمانە لـەدنیای ئێمـەدا زۆرن، لـەناو ئێمەشـدا بـەم شێوەیە ئەمانـە هـەموو رۆژێك دەیانەوێت دەربکەون. بـەڵام بەئاشکرا دەڵێم کـە لەشێوازی سـەرۆکایەتی ئێمـەدا نـە هـەوڵی دزی کـردن و نەهەڵخەڵەتانـدنی دەوروبـەر بەشـێوەیەکی دیماگۆژیانـە هەیـە. نـەخێر. لەبنچینەدا جێگا بۆ هەردووکیشیان نییە.

ئایا خۆتان دەگەیەننە کەسایەتییەکی سۆسیالیستی تۆکمە؟

بەڕاسـتی بـە ئامانجـەکانی کەسایەتییەکی سۆسیالیسـتی گرێـدراون؟ دەڵێن بـەڵێ. ئەوکاتـە دەگاتـە ئـەنجامی پێوانـەی رێکخسـتنی تۆکمـە و هێڵـی رێکخسـتنی و چـەندی دەچـێ دەگاتـە خەیاڵەکان. هەتا بیر لەوەش ناکاتەوە بکەوێتە ژێر کاریگەری زیانێکی تر.

دووبارە دەڵێم: بەساڵان مانەوە لەناو PKK دا وەها نییە. تەنانەت بەڕێوەبردنی ئێوە بۆ ئەوەی هەنگاوێکی ئاسایی و سەرەتایی بهاوێژن بەسە.

گوایە حەقییەکان زۆریان لەسۆسیالیزم دەزانی؟ نەخێر، بەزانابونێکی زۆر کەم کەوتنەڕێ، بەڵام ئەوەش دەزانین کە زۆر بەباوەڕ بوون. گوایە خـەیری و کـەمال و مـەزلوم ئـەم خاکـەیان

زۆر دەناسی؟ نەخێر. بەڵام لەدڵەوە باوەڕیان بەسۆسیالیزم و هەوڵ و کۆششی ئەو هەبوو و بەحەزکردنەوە گرێیان دابوو. ئەوانە PKK یی ڕاستەقینە بوون.

بەڵام ئێستاکە سەیری ریزەکانمان دەکەم هی واهەن کە زانابوونیان چل جار لە حەقی و کەمال و مەزلوم زیاترە. هەروەها سەرەڕای ئەوەی 10 ـ 15 ساڵە شەڕوانە، لەوانەیە سەد جار لەسەرووی ئەو PKK ییە مەزنانە هەندێك هەبن، بەڵام هەموویان بوونەتە بار.

بۆچی؟

چونکە کەوتۆتە رەوشێکی پێچەوانەی تایبەتمەندیە بنچینەیەکانی کەسایەتی سۆسیالیستی. زۆربەیان کەسایەتی و ناسنامەیان لەنێو حساباندایە.

رۆژ دەربازکردن، ژیانێك کە پشت بەپلە و پایە دەبەستێت، بەگەڕان بەدوای ماف، هەرچۆنێك بێت بۆتە PKK ییەکی سەربەخۆ، هەم لەناوخۆی وڵات و هەم لەدەرەوە رەوشێکی وەها پێك هاتووە کە شۆڕشگێڕێتی بەپلە و پایە و هەروەها شۆڕشگێڕێتی بەفەرماندە و شتی تریش، گیانی PKK دەخۆن. ئەوانە بەردەوام کێشە دەخوڵقێنن.خۆی لەخۆیدا شتێکیش بە PKK نادەن. رەنجی خۆی، خوێنی ئەو هەموو شەهیدانە و ئەو هەموو بەهایانەی کە گەل راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ داویانە، هەیە. ئەوانەی نوێنەرایەتی ئەو تایبەتمەندیانە دەکەن کە لەسەرەوە ژماردمانن، بەردەوام لێیان دەخۆن. ئیدی دەڵێم ئەمانە هیچ نرخێکیان نییە بۆچی؟ زۆر ئاشکرایە ئەوانەی لەناو پارتی ئێمەدان یا دزن یا دیماگۆژێکن، ئەوانی تریش رەنجدەری گوندی ئاسایین، حەمباڵەکانن. نەخێر، بەردەوام بۆ ئێوە دووبارەی دەکەمەوە و دەڵێم کە ئەوە کەسایەتی سۆسیالیستی نییە. بێ هیچ گومانێك ئێوە دەڵێن: پارتی جێگایەکە یاخود پێکهاتەیەکە کەشەڕی چینایەتی بەگرانی تێدا چڕبۆتەوە. راستە پێناسەی پارتیمان بەم شێوەیەیە.

پارتی جێگایەك نییە کە سۆسیالستە چوار بەچوارەکان تێیدا یەکیان گرتبێت. هەرچۆنێك بێت گەلەکەمان لەڕەوشی بەکۆمەڵگابوون دەرکەوتووە، تایبەتمەندیە چینایەتیەکانی رووبەڕووی شێوان بۆتەوە. یاخود دەرفەتی پێشکەوتنی نەبووە. هەربۆیە هەرچۆنێك بێت هەموو شتێك لەناو پارتیدا دەبێتە کۆمەڵگا، دەبێتە سیاسی، دەبێتە چین. بۆیە ئاشکرایە کە لەڕەوشێکی وەهادا شەڕێکی چڕ و قووڵ بەڕێوەدەچێ.

شەڕێکی رزگاری نەتەوەیی، شەڕێکی چینایەتی بەڕێوە نابەن.

بۆچی؟ لەبەرئەوەی چوار بەچوار خراپ بوونێك لەئارادایە و مێشك پەرش و بڵاو بۆتەوە و ئیرادە ئیفلیج کراوە. لەم واتایەدا شەڕێك لەبنەمای کۆمەڵگادا لەئارادا نییە. ئەمە تەنها لەکۆمەڵگای کوردستاندا بەم شێوەیە نییە، بەڵکو ئەمرۆ لەکۆمەڵگای تورکیا و هەتا لەتەواوی کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناوین رەوشێکی بەم شێوەیە لەئارادایە. ئەم تێکۆشانە یا دەربازی ناو

دەوڵەت کراوە یا ناو پارتی. لەبەرئەوەی لای ئێمە دەوڵەت نییە، ئەمە دەربازی نێو پارتی کراوە. لەبەرئەوەی لەتورکیادا دەوڵەت هەیە دەربازی نێو دەوڵەت کراوە. ئەمڕۆ تێکۆشانی چینایەتی لەتورکیادا لەنێو دەوڵەت یاخود بەهاوکاری بەڕێوە دەچێت. هەرچی لای ئێمەیە لەناو PKK دا بەڕێوە دەبرێت.

ئێستا باشتر لەوە تێدەگەین کە لەکۆمەڵە هەڤاڵە ساف و کۆنەکان زیاتر. لەبەرئەوەی بۆتە گشتی، هەموو ئەو ئەندامانەی کەشەڕ دەکەن بەپەیوەندی و ناکۆکییەکانی خۆیەوە وەرمان گرت و خستمانە نێو پارتی. بەڵام پێویستە ئەمەش لەسەرەتاوە پەسند بکەن کە، سەرۆکایەتی ڕێکخستنی ئەو کارەی بەم شێوەیە ئەنجام داوە، ئەو سەرۆکایەتییەیە کە بۆ ئێوەم پێناسە کردووە. ئەو سەرۆکایەتییەی کە بە بەرجەستەکردنی تایبەتمەندییە سۆسیالیستەکان لەکەسایەتیدا، پێناسەکراوە. لەوانەیە ئێوە لەچینەکانی تر هاتبن، لەوانەیە ئێوە بەشێوەیەکی پڕاوپڕ و سەرسوڕهێنەرانە، بەپێشبینی چینی بورژوازی بچووك و نیوفیودالّ و بەپێشبینی گوندی و حەمباڵ و ڕۆشنبیری، هاتبن. ئەمە خاڵی سەرەتایە کە مرۆڤ ناتوانێ لێی رابکات. بەڵام ئێستا بەسووربوونەوە بەڕێوەبردنی ئەمە، هەتا گەیاندنی بەئاستی سیاسەت و هێز، بە واتای شەڕکردن لەبەرامبەر دز و دیماگۆژەکان دێت. خۆی لەخۆیدا لەبەرئەوەی پارتیمان ئەمانەی بەم شێوەیە گرتۆتە دەست، شەڕی ناوخۆیی بەرز کردۆتەوە

کاتێك سۆسیالیزم بووە جێگای باس، پێویستە شتێکی تریش بڵێین. بۆ نموونە، ئەو ستالینەی کە لە شەڕی چینایەتیدا خاوەن هەڵوێستێکی زۆر توندوتیژ بوو، لەبەر ئەوەی نەیتوانی لەناو پارتییەکەیاندا شەڕی چینایەتی بە شێوەیەکی بەرفراوان بەڕێوەببات، هەروەها لەبەر ئەوەی کە پێی وابوو بە شێوازە دۆگماتیك و داپلۆسێنەرەکانی خۆی دەتوانێ کێشەکان چارەسەر بکات، هەربۆیە لە سەردەم و کاتی خۆیدا بە هۆی ئەو خائینانەی کە خوڵقاندی، ئەو دامەزراوە سۆسیالیستیە گەورەیەی بەرەو هەڵوەشانەوە برد. نەك تەنها دامەزراوی پارتی، لەبەر ئەوەی نەیتوانی ئاواکردنی سۆسیالیزم کە دەیتوانی لە یەك لەسەر سێی جیهان بەکاریگەر بێت، پێشبخات، کاتێك لە نێو پارتی نەیتوانی تێکۆشانی چینایەتی ڕاست بەڕێوەببات، دیسان لەبەرئەوەی کە لە نێو دەوڵەت دا نەیتوانی دیموکراسی سۆسیالیستی ڕاست پێناسە بکات و پێشبخات، بەو سەرەنجامە گەیشت کە ڕوویدا.

**"PKK ناوی ئەزموون دەرخستنە لە مێژووی سوسیالیزم بە شێوەیەکی قووڵ"**

ئەگەر ببین بە دەوڵەتیش، بێگومان سۆسیالیستی دیموکراتیك دەبێت. بەر لە دەوڵەت تێکۆشانی چینایەتی نێو پارتی واتە، دیموکراسی نێو پارتیمان بەکارامەییەکی گەورەوە تا ئێستا بەڕێوەبردووە. ئەگەر ئەم تێکۆشانەمان بەڕێوەنەبردایە، بەهەرحاڵ لە قۆناخێکی

وەهادا، کە دەوڵەتە سۆسیالیستە گەورەکانی تێیدا هەڵوەشایەوە، PKK زۆر لەوان ئاسانتر هەڵدەوەشایەوە.

ئەگەر PKK هەڵنەوەشاوەتەوە، لەبەر ئەوەیە کە تێکۆشانی سۆسیالیستی نێو خۆی بە پێی پرەنیسپ و تاکتیکی بنچینەیی نوێ، واتە کردوومانەتە بنچینەی راستی رێکخستن. تێکۆشان، لەگەڵ ئەو نوێکاریانەی کە دامانهێناوە، بەڕێوەمان بردووە.

ئایا ئێوە نوێنەرایەتی دواکەوتووییەکی کەم دەکەن؟ نەخێر. ئەو دواکەوتوییەی کە لە کەسایەتی کورددا هەیە، پێم وانییە لەنێو هیچ نەتەوەییەکی تردا هەبێت. هاتنی هەر یەکێکتان، وەکو تەواوی تۆڕی پەیوەندییە دواکەوتووەکانی سەدان ساڵەیە، هەتا ناتوانم بڵێم بە گوێرەی خۆشتان خاوەنی هۆشیاری و زانیارییەکی چینایەتین. جگە لە تەڤلیبوونێك بە کەسایەتییەکی کوێرانە، گوزارشت لە هیچ تایبەتمەندییەکی تر ناکات. ئایا بە بیر و بۆچوونێکی روون و دیاریکراو هاتوون؟ نەخێر! ئایا بە ئارەزووی خەبات کردنەوە دێن؟ نەخێر!

لەدواوەی چین و کۆمەڵگا دا ماون و هۆشتان پەرتەوازە و بڵاو بۆتەوە، ئیرادەشتان ئیفلیج بووە، مەگەر بەم شێوەیە هاتبن.

کاتێك هەندێك خۆتان کۆ دەکەنەوە و کۆ ناکەنەوە، ئەگەر لە کوێك دا گوندی بن، ئەوا تایبەتمەندی وردەبۆرژوای گوندێتی و، ئەگەر لە کوێك دا بازێڕین، ئەوا تایبەتمەندی وردەبۆژوای بازێڕی، ئەگەر پاشماوەی ئاغایەتین، ئەوا ئاغایەتی و ، ئەگەر لە ژێر کاریگەری نەتەوەی سەردەست دان، ئەوا ئەو تایبەتمەندییانەی کە لە ئێوەی دا چاندووە، دەسەپێنن. من خۆم وای دەبینم و لێکیدەدەمەوە کە بەشێوەیەکی داپلۆسێنەرانە وەك ئەوەی یەکسەر بە تەنیا ئاراستەی من کرابێت. هیچ خەمیشتان نییە. بۆچی خەمتان نییە و بە خەیاڵیشتاندا نایەت؟ چونکە هەوێنی چینایەتی و راستی کەسایەتیتانە و بۆ ئێوە ئاسانە و کەیفتان پێدێت.

بۆ نموونە، دەڵێی " بەگوێرەی شێوازی سەرۆکایەتی PKK نە بیر دەکەمەوە، نە ئەنجامیشی دەدەم، نە شەڕ دەکەم و نە رێکیش دەخەم، پرۆپاگەندەشی بۆ ناکەم". کەوابێ تۆ چی دەکەیت؟ " بەگوێرەی شێوازی خۆم" . ئایا شێوازی تۆ چییە؟ بێگومان شێوازێکە کە دوژمن لە هەنگاوی یەکەمدا دەستی لێ وەشاندووە و لێی داوە، لە مێژە تەخت و خاپووری کردووە. دەڵێ " لەمنەوە ئەوەندە"( واتە، ئەوەندەم پێی دەکری؛ چارەسەری). لە تۆوە ئەوەندە، بەڵام ئەمە بۆ من بەس نییە. بگرە ئەمە بۆ خۆ رزگار کردنیش بەس نییە. شەڕی چینایەتی لایەنێکی بەم شێوەیەشی هەیە کە شەڕکردنە بەرامبەر بەوەی کە بەس نییە. ئێوە بەس نیین. لەبەر ئەوەش نوێنەرایەتی دۆڕاو دەکەن و کەسێکیش زۆر بە خراپە ناوتان نابات. بە ئێوە دەگوترێ : لەبەر ئەوەی ئێوە خۆتان بە گوێرەی ڤارەمانێتی رەنجی سۆسیالیزم،

یۆتوپیا و خەباتی سۆسیالیزم لەبەرامبەر رەوشی ئیمپریالیزمی سەردەم کە شێوە داگیرکەری فاشیستییانەی تورکیا ناسنامەکەیەتی، هەروەها ئەو شەڕە تایبەتەی کە ئەمرۆ بەڕێوەی دەبات، ئاوانەکردووە؛ نوێنەرایەتی بنکەوتن دەکەن. ئایا ئەمە چی لەبندا هەیە؟ بێگومان کەم وکوڕی هەیە. کەم وکوڕی رێکخستن، هەروەها کەم وکوڕی کۆشش و رەنج و ناتەواوی لە خەیاڵدا هەیە. بە ژیانێکی هەرزان تێردەبن و بەسی دەبینن، هەروەها بە دەستەڕۆییەکی بچووك سەرخۆش دەبن و بۆ خۆتانی بە سەرکەوتن دەبینن.

بوون بە کەسایەتییەکی خاوەن پلەوپایە (فەرماندە)ی هەرزان و بێ بایەخ لەلای PKK بۆ ئێوە هەموو شتێکە. چالاکییەکی بچووك، نوێنەرایەتی یاخود یەك سەرکەوتنی بچووك بۆ ئێوە وەك ئەوە وایە کە هەموو شتێك کۆتایی پێ هاتبێ و کار تەواو بووبێ. هەڵبەتە بۆ ئێمە هەنگاوی بەم شێوەیە نەك تەنها بەس نییە، بگرە سکیش تێر ناکات. لە راستینەی سەرۆکایەتی PKK دا ئەمانە بە سەرکەوتنیش ناو نابردرێن. هەر رۆژەی بە سەدان سەرکەوتنی بەم شێوەیەم هەیە. وەلێ هەر ئاوڕیشان لێ نادەمەوە. خۆم بە خۆم دەڵێم "توخوا ئەمانەش سەرکەوتنن". دەڵێم "هەرگیز بەمانە خۆم فریو نادەم". چونکە گەورەیی دوژمنەکەم لە میدان دایە. دوژمنم بە خێرایی پێشدەکەوێت، کەوابێ، چۆن بە چەند سەرکەوتنی بچووك، خۆم هەڵبخەڵەتێنم؟"وەلێ تەماشای خۆتان بکەن. شتێك ماوە کە ناوی پێوانە بێت؟ بەس نەبوون ( ناتەواوی) لە ئیرادەتان دا رەنگی داوەتەوە و ئیرادەش ئیفلیج بووە، لەسەر ئەم بنەمایە لەگەڵ ئێوە شەڕ دەکەم. شەڕی "گەیاندنی بەس نەبوون بەرەو بەس بوون"تان لەگەڵدا دەکەم. لە پشت تەواوی ئەمانە تایبەتمەندی چینایەتی هەیە. وەکو تەواوی تایبەتمەندییە چینایەتییەکانی تر. دووبارەی دەکەمەوە: گوندییەکانیش رەنجدەرن، حەمباڵەکانیش رەنجدەرن، بۆرژوا بچووکەکانیش رەنجدەرن، ئاغاکانیش رەنج دەدەن، بەڵام رەنجی ئەوان بەشی ئەوە ناکات کە نیشتمانی پێی رزگار بکەن و کۆمەڵگای پێی ئازاد بکەن.

کەوابێ، چۆن ئەبێ؟ دەبێت چی بکەین بە گوێرەی یۆتۆپیای سۆسیالیزم؟!

تەنانەت شێواز و خێرایی راستی سەرۆکایەتی ئێمە کە بە خوێنی ئەوەندە شەهیدانە و ئەوەندە فیداکارییەی گەل پێشکەوتووە، ئەمە دیاریدەکات. ئەگەر بتوانن لە چوارچێوەی ئەم پێناسانە، کەسایەتییەکی سۆسیالیستی لەخۆتاندا بەرجەستە بکەن، ئەو کاتە دەتوانن بڵێن :"من میلیتانێکی راستەقینەی PKK م ". ئەگەر ئەمانە بەدەست خۆتان نەخەن، ئێوە چیین؟ بەڵێ، لەوانەیە میلیتانێك یاخود جەنگاوەرێك بن، وەلێ میلیتانی راستەقینەی PKK نیین. بەڵکو بەو مانایە دێت کە ئێوە لەبەرامبەریدا جێگەی خۆتان دەگرن، یاخود بەو مانایە دێت کە لە دواوەی یاخود لە چەپ و راست و تەنیشتەکانیدا جێگە دەگرن، یاخود وەکو کەسایەتییەکی خۆ کوژ (انتحار) زۆر لە پێشەوەیدا جێدەگرن. وەکو دەشبینن، ئەمانە

هەمووشیان PKK دەخەنە زەحمەتییەوە، بەرەو سەرکەوتن نا، بەڵکو بەرەو بن کەوتنی دەبەن. دەبێ لەم واتایەشدا خۆتان بە پێوانە بکەن و دروست بکەن.

"ئایا من لە کوێوەی بەPKKیی بوون و میلیتانێتی PKK دام؟ ئایا لە کوێوەی ناسنامەی PKK ییەکی سۆسیالیست و کەسایەتییەکەیدام. ئایا من زۆر لەلای چەپی دام یا زۆر لەلای راستی دام؟ ئایا لە پێشی دام یان زۆر لە دواوەی دام؟ کاتێك ئەمانە پێناسە دەکەم، لێکدانەوە بەگوێرەی دوژمن و بەگوێرەی خەیاڵ و یۆتۆپیای ئێمە، هەروەها پێوانەی خەباتی ئێمەش هەیە. "ئایا زۆر بە ئارەزوو خەبات دەکەم؟"ئایا بە ئارەزوو و زەوقێکی گەورەوە واتا دەدەمە تەواوی خەباتە ئایدیۆلۆژی و سیاسی و رێکخستنی و چالاکییەکان و خۆشم پراکتیزە دەکەم؟"ئەگەر بڵێن: "بەڵێ" ، ئەو کاتە ئێوە میلیتانی سۆسیالیستن و PKKیی راستەقینەن و بەگوێرەی پێناسەی PKK خۆتان کردۆتە میلیتان.

بەڵی ئەو کەسایەتییە کار ئەنجام دەدات. توانستەکانی ئێستای PKK ش بەسە بۆ ئەو کەسایەتییە کە هەموو جۆرە سەرکەوتنێك بەدەست بهێنێت. بگرە زێدەشە. بەو مەرجەی کە ببن بە میلیتانی پارتییەکی سۆسیالیستی بەم شێوەیە. هەروەها مەرجی سەرکەوتنی بنچینەییش ئەمەیە. مەرجەکانی تری وەك زێدەبوونی ژمارە و چەك و ... هتد ئەمانە هەموو شتی لاوەکین و دیاریکەر نین.

ئەو کاتە، ئەگەر باوەڕییەکمان بە دۆزی رەنجدەران هەیە، ئەگەر رێزیشمان هەیە بۆ یۆتۆپیای سۆسیالیزم کە بە میلیۆنان مرۆڤ لەپێناویدا شەهید بوونە و، ئەگەر بە راستیش ئەم ڕۆژە وەکو رۆژی تێکۆشانی یەکێتی و هاوکاری تەواوی رەنجدەرانی نێونەتەوەیی هەڵدەسەنگێنین، ئەو کاتە وەڵامی هەرە راست کە بیدەینەوە ئەوەیە کە لە هەل و مەرجە نێونەتەوەیی و رۆژانەییەکاندا خۆ بگەیەنینە ئاستی میلیتانێکی بەم جۆرە لە نێو PKK دا، هەروەها گەیاندنی بە لوتکەی سەرکەوتن و زیاتر بەرزکردنەوەی تا ئەو رادەیەی کە بە هیچ جۆرێك پێشی لێی نەگیردرێت، بەمجۆرە دەتوانین ببین بە وەڵام. ئەمەش دەبێتە وەڵامێکی تەواو، هەرچەندە هەتا رادەیەك وەڵامیشمان دابێتەوە، پێویستە زیاتر وەڵام بدەینەوە. بەو زاراوانەی کە ئیفلاسیان کردووە، ئەم رۆژە یاد ناکەینەوە. هەروەها نامەوێ بە زاراوەی سۆسیالیستە ناوەڕۆك بەتاڵ و بۆشەکان ئەم رۆژە هەڵبسەنگێنم. ناشمەوێ باسی گوتنی رەنجدەرانی هەرزان بکەم. بەڵکو نەفرەت دەکەم لەو رەنجدەرانەی کە لە خزمەت سەرمایەیەکی بەم شێوەی ئێستادان. ناتوانم حەز لە رەنجدەری وەها بکەم. ئەوانە، کوێلەی سەردەمێك کە خۆیان لای ئیمپراتۆرییەتە هەرە مەزنەکان خۆشەویست دەکرد، دەهێننەوە یاد. هیچ لایەنێکی ئەوانە کە خۆش بویسترێت نییە. رەنجدەر وەها نابن! رەنجدەر ئەو رەنجدەرەیە کە رێز لە خۆی بگرێت، ئەگەر بە باوەڕییەکی ئاوا و لەمیانی بوون بە خاوەنی

یۆتۆپیایەك ڕێز لە خۆی نەگرێت، ئەوا لە ڕەوشێكی نەفرەت لێكراو هەرگیز ڕزگاریان نابێت. ئەگەر شانازی بە ڕاستینەی گەلەكەمانەوە دەكەین و ئەگەر بە شێوەیەكی نەفرەت لێكراو نا, بەڵكو هەتا دەچێ، خۆمان بە شێوەیەكی ڕوسپی دەردەخەینە سەر شانوی مێژوو. لەبەر ئەوەیە كە هێزی گرێدان بە باوەڕییەكی وەها و شەڕەكەیەوە نیشان دەدەین.

بەم هۆیەشەوە دەتوانم هەم بۆ هەمووتان لە ناو پارتی هەم بۆ تەواوی گەلەكەمان و هەم بۆ ئەو دۆستانەی كە پەیوەندیداربوونی خۆیان نیشاندەدەن، دیاری بكەم كە ئەگەر بە تەنهاش بم بە ساڵان گرێدان بەو باوەڕی و خەیاڵانەی خۆم، لە ژیاندا بە بنەما دەگرم. هەروەها دەبێ ئەوەش دیاری بكەم كە لەبەر ئەوەی كاتێك پێویست بوو، بە تەنیا خۆم ئارەزووی خەبات وەكو سوپایەك لە سەرووی هەموو شتێكەوە بە بنەما دەگرم، بۆیە بەو ئاستە گەیشتووم. لەسەر ئەم بنەمایەش هەندێك پابەندبوونی خۆیان نیشاندا و PKK ییەكانیش دەركەوتنە مەیدان. گەلەكەمان دەركەوتە مەیدان و دۆستانیش هەموو ڕۆژێك قات بە قات زیاتر دەبن و پشتگیری خۆیان نیشان دەدەن، لەوانەیە سبەی زیاتریش بن. هەربۆیە، ئەمڕۆ سڵاویان لێدەكەم و پیرۆزباییان لێدەكەم. هەروەكو بڕوام بەوە نییە كە جگە لەمە بە شێوەیەكی تر ڕەنج و ڕەنجدەران بە ڕێزەوە هەڵبسەنگێنرێن. دەبێ ئەوەش دیاری بكەم كە لەوانەیە ڕێزم هەبێ بۆ كاربەدەستێك، وەلێ **بۆ ڕەنجدەرێكی كۆیلە ڕێزم نییە و نابێت**. ئەگەر چۆن كاربەدەستێك كارەكەی دەزانێ و ئەنجامی دەدات، دەبێ ڕەنجدەرێكیش بە زانایی و تێگەیشتنەوە ڕەنجدەرییەكەی جێبەجێ بكات. دیسان ڕێزم هەیە بۆ ئەو هێزە تایبەتییانەی سوپای داگیركەر كە بەرامبەر ئێمە باش شەڕ دەكەن. وەلێ هەتا بۆ گەلەكەشمان هیچ ڕێزێكم نییە لەكاتێكدا كە نەتوانێ لە بەرامبەری ئەودا شەڕی ڕەوای خۆی بەڕێوەببات و ڕێكبخات. هەتا ڕێزم نییە بۆ جەنگاوەرانی بەمجۆرە لەناو ئێمەشدا. لەگەڵ ئەوەشدا، بە لایەنی كەمەوە، ڕێزم بۆ ئەو ڕەنجدەر و ڕەنجدەرانەی شەڕ و سوپای خۆیان بە قەد هی دوژمن بە شێوەیەكی ژیرانە و سەركەوتووانە بەڕێوەدەبەن، هەیە. سەرۆكایەتی PKKش مسۆگەر وەهایە. لەدەرەوەی ئەمەش با هیچ كەسێك نە گرێدان نیشان بدات نە چاوەڕوانی ڕێز و حەزكردنیش بكات.

ئەوەی كە كۆیلەیە و سەرنەكەوتووە و مانای نەداوەتە كۆششی خۆی، لە نێو ئێمەدا جێگەی نابێتەوە. با هیچ كاتێكیش چاوەڕوانی پەیوەندیدار بوون لە ئێمە نەكات. ئەوانەی بەم شێوەیەن هەرگیز خۆشەویستی و بەها و ڕێز و ئابڕووش بەدەست ناهێنن و شایستەی ئەوەش نابن. هەربۆیە ئێمەش هیچ كاتێك بە شانازییەوە یادی ئەوان ناكەینەوە.

كەواتە, لەگەڵ كێ دا دەبێت؟ ئەو كەسەی كە بیسەلمێنێ كە بە لایەنی كەمەوە بە ئەندازەی دوژمنەكەی ژیان شایستەی خۆی ببینێت، بە ئازاد كردنی ئەم وڵاتە و ئەم گەلە،

بتوانێ بژیت، ئەگەر پێویستیش بکات، بە قارەمانێتییەکی سۆسیالیستی هەموو جۆرە فیداکارییەك نیشان بدات و بەبێ ناسینی هیچ ئاستەنگییەك بەڕێوەی برد، ئەوا ئەو کاتە هێزا ترین یانە. پێویستە لە سەرووی هەمووشیانەوە دابنرێت. ئەو گەلەی کە هەردەم شایستەی حەزکردن و ڕێزگرتن بێت، بەو واتایە دێت کە رووەمەتی خۆی بەدەست خستووە. هەروەها گەلێکی پێشەنگە و بەهای ئەو چینەش کە بەناوی ئەو پێشەنگایەتی دەکات، بەهاکەی بەهای چینی پێشەنگە، ئەگەر پارتیش بێت، ئەوا پارتی پێشەنگە.

ئەمرۆ لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستیمان بەمە هەیە. ئەمە بە تەنیا کار و نان فەراهەم ناکات. بەڵکو شەرەف و دەستێکی ئازاد دەئافرێنێ. ئەو شتەی کە پێی دەڵێن ئۆمێد و یۆتۆپیا، خەیاڵی ئازاد دەردەخاتە مەیدان. کاتێك خەیاڵی ئازاد هاتە کایەوە، دەستی ئازادیش دێتە کایەوە. کە دەستی ئازادیش هاتە کایەوە، دەستی خەباتکار دێتە ئاراوە. کاتێکیش دەستی خەباتکار هاتە ئاراوە، ئەو کاتە کار و نانیش دێتە ئاراوە.

دەڵێن نازانم، ئاستەنگی هەیە، پێویستی بە شەڕ دەکات. بەهیچ شێوەیەك ئەمە نابێتە کێشە؛ ئایا خەبات لەمە بەهادارتر دەبێت. شەڕێکی بەم جۆرەیە کە تەواوی زنجیرەکانی دەست و پێ پارچە دەکات. کەوابێ ئەم کارە بە زەوق ترین کارە. ئەم هەوڵدانە، رەنج و هەوڵێکی بەرهەمدارە کە لە یەکا هەزاری لێدەکەوێتەوە. واتە، رەنجی شەڕە و قارەمانێتییەکەشی قارەمانێتی هەرە مەزنی گەلە. ئێمە ویستمان لە گۆڕەپانی نێو نەتەوەیی و هەروەها لە راستی خۆشماندا، وەڵامێکی هەم رەنج و رەنجدەران، هەم گەلەکەمان لەم واتایەدا بدەینەوە. ئەوەشمان بینی کە گەلەکەمان لە سەرەتادا گەلێکی رەنجدەرە، وەلێ ئەوەش دەزانین کە کەوتۆتە رەوشێکی پێچەوانەی رەنجی خۆی و هەموو بەهاکانی رەنجی لێی سەنراوە. هەروەکو وڵاتەکەشی کە ڕەنجی تێیادا دەئافرێنرێ، لەدەست گیراوە. ئەوەمان بە بنەما گرت کە شەڕێکی وڵاتپارێزی گەورە پێویست دەکات. هەروەها موتڵەقە بۆ ئەوەی بتوانێ وەکو گەلێکی ئازاد بۆ خۆی ببێت بە خاوەنی بەهاکانی رەنج، دەبێ خۆی ئاوا بکات. بۆ ئەمەش لە هەموو شتێك زیاتر جەختی لەسەر بکرێت، ئەو پارتییەش میلیتانان ئاوا بکات، میلیتانی سۆسیالیست. کاتێك کە ئەم ئەرکە کەوتە سەر ملی ئێمە وتمان ئەرکێکی مێژوویی ئەوەندە پیرۆزە کە باوەڕ ناکرێت. هەروەهاش پەسندمان کرد. بەسەرەنجێکی زۆریشەوە کەوتینە ژێر کاریگەرییەوە. هەروەها گوتمان هەوڵدانەکانی زۆر بەبەرهەمە و بەمجۆرەش بە شێواز و خێرایی خەباتێکی وەها کە باوەڕ ناکرێت، کەوتینە نێو ئەم کارە. ئەنجام، بە شەڕیکی وەها کە بە خۆڕایی ناچێت، لەوانەیە لە مێژوودا بێ پایان رووەمەت بە مرۆڤ دەبەخشێت، رووی مرۆڤ سپی دەکات و هەتا نەك تەنها هیوا، بەڵکو رزگاریش دەهێنێت.

هەرچۆنێك بێت هەموو شتێكی خۆمان بینی كە لە نوێوە ئاواكراوەتەوە. لەمەش بەنرختر شتێكی تر نییە.

بەڵێ، ئەمە سۆسیالیزمە.

ئەمە دۆزی رەنجدەرانە كە جارێكیتر لە رۆژگاری ئێمەدا بەرژەوەندییەكانیان لە میانە هۆشیاری پێكدێت و لە پارتی دا بەرجەستە دەبێت. هیچ دۆزێك ناتوانێت لەمە پیرۆزتر بێت و ئەنجامی سەركەوتووتریش بەدەست بهێنێت. لەسەر ئەو بنەمایە ئەگەر بەری رۆژی ئەمرۆمان هەندێك تاریكیش كرابێت، ئێمە بە یۆتۆپیاییەكی سۆسیالیستی بەمجۆرەی باوەڕمەند؛ بە ئارەزووی خەباتێكی سۆسیالیست بە روومەتی یەكێتی، پشتگیری و تێكۆشانی ئەو، سڵاو لە رۆژی هەموو رەنجدەرانی نێونەتەوەیی و هەموو گەلان، دەكەین.

جارێكیتر بە بۆنەی ئەم رۆژەوە دەستنیشانی دەكەین كە لە نێو پارتی ئێمەشدا نەهێڵین هەرگیز تۆزی بخەنە سەر، ئایدیۆلۆژیایەكی سۆسیالیستی وەها، كە بەمجۆرە ئێمە سەردەخات، هەموو ئەو سیاسەت و رێكخستن و رێبازە سەربازییەی كە سەرچاوەی خۆی لەوەوە دەگرێت، بێ ئامان شوێن هەڵگری دەبین. هەتاوەكو گەیشتن بە سەركەوتن لە شەڕدا. تا ئێستا سەركەوتنەكانمان نرخ و بەهایەكی سەرەتایی لە خۆوە دەگرێت، لە بنچینەدا شەڕی واتا دار و سەركەوتوو لێرە بەدواوە پێشدەكەون.

باوەڕ دەكەم بە هۆی ئەم رۆژەوە، وەڵامی هەرە واتادارمان لە سەریدا بۆ PKK ی سۆسیالیست و فەرماندە و شەڕوانە نوێیەكانی لە گۆڕەپانی شەڕدا، هەروەها PKK ییە سۆسیالیستەكان كە لە زیندانەكاندا بە قارەمانی بەرخودان دەكەن و هەروەها لایەنگرەكانیان و تەواوی گەلەكەشمان كە چاودێری ئێمە دەكەن، داوەتەوە. لەسەر ئەم بنەمایە سەركەوتنی بەردەوام دەخوازم و سڵاوی خۆم ئاراستە دەكەم.

# من بە مرۆڤ و مرۆڤی هەرە باش باوەڕ دەکەم.

"پیاوێتی کلاسیك دەکوژم"

PKK خۆی راستییە. بە بێ تێگەیشتن لە مەسەلەی PKK ، ناتوانرێت دەرك بە مەسەلەی رزگاری نەتەوەیی کوردانیش بکرێت. بە بێ تێگەیشتن لەمەش مەسەلەی بێ چارەیی دەبێتە جێگای باس. ئەگەر چارەسەرییەك بەدیش بێت، دەرکی پێ ناکرێت.

لێتوێژینەوە لەسەر PKK سوودی هەیە. پێویستە ئەوە دیاری بکرێت کە زۆربەی ئەوانەی PKK یان پێناسە کردووە، بە PKK یی بوون یاخود دیاردەی PKK بە شێوەیەکی زۆر جیاواز بووە. تەنانەت من باسی PKKییەکی جیاوازتر دەکەم لە زۆربەی ئەو PKK یی یانەی کە شیمانە دەکەن. واتە PKK مەسەلەیەکە، تێگەیشتنی زەحمەتە و بەشێکی گرنگیشی دەرکی پێ نەکراوە. بەتایبەتی باوەڕناکەم کە چەپی تورك و رۆشنبیران و تەنانەت سیاسەتمەدارانی تورکیاش کەمێکی لێ تێگەیشتبن. لەوانەیە دەوروبەرانی ئستخباراتی تا دەچێت بە شێوەیەکی بابەتیانە تێبگەن و هەندێك ئەنجامیش بەدەست بخەن. بەڵام یەکجار زەحمەتە هەمان شت بۆ رۆشنبیران و هەتا بۆ سۆسیالیستەکانیش بڵێین، ئەوانەی کە ئێستا لە هەرکەس باشتر لە من تێدەگەن شارەزایانی ئیستخباراتن. دەتوانین لەگەڵ ئەواندا زۆر بەباشی گفتوگۆ بکەین و بگەینە هەندێك چارەسەریش. لەوانەیە هەندێك لەو سەربازانەش کە مێشکیان کار دەکات، بکەونە نێو ئەم چوارچێوەیە. بەڵام بەداخەوە تا ئێستا دەوروبەرانی مەدەنی، رۆشنبیران و سۆسیالیستەکان و چەپەکان لە دان نانییان بە راستییەکان زیاتر، تێنەگەیشتن زیاتر پێشدەکەوێت و بە شێوەیەکی نکۆڵیکەرانە روبەڕوومان دەبنەوە. PKK نابێتە بزووتنەوەیەکی سۆسیالیستی وەکو ئەوەی کە پێیان وایە یاخود دەریانخستۆتە روو. بەڵکو بزووتنەوەیەکی جیاوازە. سەرباز و ئستخباراتەکان

ناچارن یاساکانی پێویست بۆ شەڕ و مەسەلەی شەڕ کردن بە شێوەیەکی باش بزانن. هەرچی غەیبەتکارانن لەبەر ئەوەی شەڕیان نەکردووە، لەهەرشتێك کاری خۆیان بە دەربڕین و زاراوەی گشتی بەڕێوەدەبەن. هەڵسەنگاندنێکی راست و لەجێدا ناکەن. ئەمە بە کەموکوڕیەکی مەزن دەبینم. من ناڵێم پەسنی ئێمە بدەن. بە پێچەوانەوە بیگرن و لە زەوی بخەن. بەڵام بە خستنەرووی سەنگینی و رەسەنایەتی ئەمە ئەنجام بدەن. بە پێویستی دەبینم ئەمانە بە هەموو سۆسیالیست و رۆشنبیر و شۆڕشگێڕ وهەتا ئیسلامییەکانیش بڵێم. بەلایەنی کەم بەقەد ئەو شەڕکەرە تایبەتانەی کە لە بەرامبەر ئێمەدان بۆ تێگەیشتن لە ئێمە کەمێك هەوڵ بدەن.

بۆچی رۆشنبیرەکان و زاناکان تەنانەت شۆڕشگێڕە سۆسیالیستەکان بەقەد شارەزایانی ئستخباراتی لە ئێمە فێر نابن؟ بەتایبەتی لە کاتێکدا ئەوانە دەڵێن ئێمە لەنێو تێکۆشانێکداین.

PKK ییەکانیش نازانن لێی فێر ببن. لەبەر ئەمەیە لەنێو PKK شدا شەڕێکی دژوار و گەورە بەڕێوە دەبەم. PKK ییەکان لەبەرامبەر کێ شەڕ دەکەن؟ ئایا دەزانن شەڕ بکەن؟ ئەمە یەکلا نەبۆتەوە! لەسەر هێڵی PKK نییە، بەشێکی گرنگ بە شێوەیەکی بابەتی کەوتۆتە سەر ئەو هێڵەی کە لە بەرامبەر PKK لەشەڕ دایە. رووداوێکی سەیرە!

دەتوانم ئەمە زیاتریش گشتگیر بکەم. 90٪ ئەوانەی لەنێو PKK دان لەژێر ناوی PKK دا، نا، بەڵکو لەدژی PKK شەڕ دەکەن. ئێستاکە سەرەڕای ئەمە، راستییەکی PKK ی شەڕکەر هەیە، ئەمە شتێکی سەیرە. ئێستا تورکیا لەسەر ئەمە سیاسەت بونیاد دەنێ. یاسای پاکانەکردن و پەشیمان بوونەوە دەردەخات. ئەمە لە بزووتنەوەی کوردیدا رووداوێکی تایبەتە. دەوڵەتان گەمە ئەنجام دەدەن. هەر یەکێکیان مێژێکیان سەبارەت بە PKK هەیە. هەرکەس دەڵێ "لەناوچوو، بەرەو لەنێوچوونە" یا "کەوت، بەرەو کەوتن دەچێت". بەڵام تا ئێستا بۆچوونی ئەمریکاییەکان جیاوازە و دەڵێن: " لە دونیادا رێکخستنی هەرە گەورەی گەریلا، یا مەترسیدارترین رێکخستنی ئۆرتۆدۆکسی مارکسییە". پێویستە هەڵسەنگاندنەکانی CIA لەبەرچاو بگرین.

هەرچی هەندێك رێکخراوی چەپی تورکیاشن دەڵێن "نەتەوەپەرستەکان، بورژوازیە بچووکە نەتەوەپەرستەکان" نە ئەمریکاییەکان بەتەواوی پێناسەیان کردووە، نە بەشێکی زۆریش لە چەپی تورکیا توانیویانە لەمە تێبگەن و نە ئەوانەی خۆشمان دەزانن کە خۆیان چی نە.

بەهەرحال ئەگەر ئێستاکە ئەوەی ئەنجامم داون بیخەمە روو، دەبنە کەرەستە بۆ پێناسەیەکی باشی PKK. بە گوێرەی من ئەم شەڕە هەر لەو کاتەی لە گوند بووم، لەتەمەنی

دە ساڵان شەڕێکی کۆمەڵایەتی بوو. لەدژی هەندێك داب و نەرێتی فیوٚداڵی بوو. دوای ئەوەی هەنگاوی یەکەمم نایە شار، بوو بە شەڕێکی کۆمەڵایەتی لە چوارچێوەیەکی فراوانتر. بۆچی؟ چونکە من نە لەگەڵ نرخ و بەها باوەکانی کۆمەڵگای گوند بووم بە یەك، نە لەگەڵ نرخ و بەها باوەکانی بورژوای شاریش بووم بەیەك. کاتێك ڕووبەڕووی دەوڵەت هاتم لەگەڵ دەوڵەتیش نەبووم بە یەك. لەراستیدا ئەمانە گوزارە لە سەردەمانێك دەکەن کە هێشتا بەناوی PKK هەنگاوم نەنابوو. ئەگەر دەتانەوێت تێبگەن، سەرەداوەکەیتان دەدەمە دەست بۆ ئەوەی من و خۆتان پێوانە بکەن. نەبووم بە گوندییەکی باش. نەبووم بە گوندییەکی ئاقڵیش. خۆی لە خۆیدا ئەو کاتە گوندیەکانی ئێمە وەهایان دەگوت " خودایە هیچ کەس، وەکو کوڕی فلان کەس نەبێ، لەڕێگا دەرکەوتووە، نازانم شێتێ کوێ" پێناسەی من وەها بوو. خۆی لە خۆیدا کاتێك بەرەو کۆمەڵی بورژوازی هەنگاوم نا، بێ چارە بووم. هیچ کەسێك لە مندا شانسی ژیانی نەدەبینی.

بەگوێرەی چی.

بەهەرحال یەکێك بە گوێرەی یاساکانی کۆمەڵگای گوند و ئەویتریش بە گوێرەی یاساکانی کۆمەڵگای بورژوازی. هەمان شت لە نزیك بوونەوەم لە چەپی تورکیش بەم شێوەیە بوو. ئاشکرا بوو کە بە هیچ شێوەیەك بە گوێرەی ئەو پێوانانە نابم بە چەپێك. لایەنی سەیری مەسەلەکە، تەنها لە پێش PKK و تەنانەت لە ریزەکانی چەپی تورکیش نا، بەڵکو بە درێژایی مێژووی PKK ش ڕەوشی زێدە ناگۆڕێت. پارتی ڕێکخستنێکە، کۆمیتەی ناوەندی، مەکتەبی سیاسی، سکرتێر و ئەندامانی ژێرەوەی هەن. ئێستا لەلای ئێمە ئەم دیاردانەش زێدە پێش ناکەون، "من نایەمە ژێر باری ئەندامێتی ڕێکخستن، نایەمە ژێر باری ناوەندیەوە، من نایەمە ژێر باری بەڕێوەبردنی سیاسەت بەشێوەیەکی فراوان. ئەمە ناکۆکییەك بوو. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دیاردەی PKKیەکی مەزن هەیە. ئەمە چۆن پێکهات؟ ئێستا کە دەوڵەتە ئیمپریالیستییەکان لە PKK دەترسن، لەبەر ئەوە دەترسن بەم شێوەیە بێ مانا و هەروەها بەو رك و کینەی کە لەم ترسەوە وەریان گرتووە، هێرشە بەرفراوانەکانیان ڕێکدەخەن.

ئێستا من نەفرەت لەوە دەکەم کە خۆم بە شتی وەکو " کەسی بێ هاوتا، کەسی ئافرێنەر، سەرۆك ـ ڕێبەری مەزن پێناسە بکەم. بەڵام خویەك یاخود شێوازێکی من هەیە کە پێویستە مسۆگەر بزانرێت تاوەکو ئەو شتانەی کە دەقەومێن لێی تێبگەن.

هەمووکەسێك زۆر بێ هێز دەبینم. بێ هێزی لە شێوازەکانی ژیانی ئەواندا دەبینم. ئەوکاتە شێوازی مندالی لەباوەش گەورەبوو، کە "بەبە" دوجاران بگری و هەڵبگری و ماچی بکەیت و بخەیتە ئەملا و ئەولا. بەگوێرەی من لە ئاستێکی بڵندا کەسایەتی لێدانی

بەردەکەویت. تەنانەت هێنانە بەرچاوی ناکۆکی خێزانیش لە مندا هەستێکی پێشخست: خۆزیا لەو خێزانە نەبوومایە! دوای ئەوە سەبارەت بە کوردایەتی، خۆزیا لەو نەتەوە دواکەوتووە نەبوومایە. تەنانەت لەو چینە کۆمەڵایەتییە نەبوومایە.

دوای ئەوەش لەو دەوڵەتە نەبوومایە. لە بنەڕەتدا هەستی وەها هەیە لە مندا. ڕەتکردنەوەیەك هەیە. زۆر سەرسوڕهێنەرانە! نەحەزکردنم وەکو حەزکردنی هەرکەسە، نە ژیانم وەکو ژیانی هەرکەسە. نەبیرکردنەوەم وەکو بیکردنەوەی هەرکەسە، نەخواردن و نەخواردنەوەم وەکو خواردن و خواردنەوەی ئەوانە، لە هەموویاندا دیاردەی ڕەتکردنەوە لە ئاستی نەخۆشی دایە. هەرکەس دووعای خۆی بەم شێوەیە دەخوێنێ. نوێژی خۆی بەم شێوەیە دەکات. ئەمەش بۆ من کێشەیەکی گەورە بوو. بەگوێرەی داب و نەریتەکانمان، کور و کچەکانمان بەم شێوەیە بەشو بدەین یاخود ژنیان بۆ بهێنین. ئەمە بۆ من ڕووداوێکی زیاتر سەرسوڕهێنەرە.

نەخێر، وەها نابێ!

ئەمەیە سۆسیالیزم:

سۆسیالیزم وەهایە. تیۆری و پراکتیکەکەش بەم شێوەیە دەخرێتە ڕوو" نەخێر، بەم شێوەیە ناخرێتە ڕوو! هەمووی جیاوازە، نەگونجاوە! ئێستا ئەم ڕەوشە ئایا منی بەرەو کوێ دەبرد؟ بەڵێ! ئەمە دەردێکە، تەنها بوونە، لەوانەیە شێتبوونێکە.

یەکێك بووم هەوڵم دەدا خاوەن تەربیە بم. بە هەست بووم، هوشیار بووم. یەکێکم کە پێشتریش بێ واتا پێ نەنانە پارچە گیایەکیشم بۆ خۆم کردبووە پرەنسیپێك. هەر لە سەرەتاوە لەبەرامبەر هەموو شتێك پەیوەندیداربوونی هەرە مەزنم هەبوو. بەڵام سەرەڕای ئەمەش ئەوەندە ناکۆك بوون، ئەمە دوایی دەرکی پێ دەکرێت، واتە، تەنیا بەمانە هاوسەنگی خۆم دەبینمەوە. لەسەر قاچەکانی خۆم رادەوەستم، پێوان و شێوە بەخۆم دەدەم.

هیچ شتێك وەك ئەوەی من دەمەوێت نییە؟ هەستەکانم، پیشبینییەکانم پێم دەڵێن ئەمە بەم شێوەیەیە. هی باش مەیسەر دەبێ، بەگوێرەی ئەمە ئەوانەی کە هەن خەراپن. ئەمە ڕەوشی هەستیاریەکە تەماشای هەر کوێەك بکەم، مسۆگەر بە پێی ئەم زاراوە دوولایەنە بیر دەکەمەوە. لەمە باشتر هەبوو، ئەمەی کە لە ئارادایە، یەکجار خەراپە. ئەوە هەڵەیە، گرێدانیش، گرێدانی زوو کەسایەتی لەنێو دەبات. لە سایکۆلۆژیشدا بەم شێوەیەیە.

لە هەمان کاتدا لایەنگرێکی "فرۆید"ی باشم.

لە ڕەوشێکدام کە ئەم شێوازەم زۆر بەباشی پێشخستووە. لە باوەشی دایك بەتوندی بە دایکەوە گرێبدرێ خۆپەرست دەبێت. لە هەمانکاتیشدا دەیەوێت بە هێزی دەرەوە لەسەر پێی

خۆی رابوەستێت. چونکە بەردەوام لە دایکی دەگەڕێت و دەیەوێت خۆی بسپێرێتە دایکی. ئەو کاتە ئەم منداڵە لەناوچوو، جارێکیتر بەسەر خۆیدا نایەتەوە.

نموونە، شێوازی حەزکردن:

لێگەڕینی ژن و پیاو. ئێستا ئەمە گرێدانێکی ریشەییانەیە. لەراستیدا، کۆیلایەتییە، کە کەوتە ناوی ئیتر دەرناکەوێت. دواکەوتوویەکەیشی کۆمەڵگا تەواوی دەکات. کاتێک دێتە کۆمەڵگای فیۆداڵی و بورژوازی و دەوڵەت خۆی لە خۆیدا ئەو لەنێو چووە. مرۆڤی کورد و تورك و هەتا هی رۆژهەلاتی ناوینیش کاتێك لەبەرامبەر دەوڵەت چاوی خۆیان هەڵێنا؛ ئەو کەسێکی بێچارەیە. لەدەست پان کردنەوە زیاتر هیچی تری لەدەست نایەت. چونکە پێش ئەوەی بگاتە دەوڵەت لەنێو چووە. بە گوێرەی من کاتێك هێشتا لە گوند بووە یاخود لە نێو خێزاندا بووە، لەنێو چووە. شەڕیش ناکات.

ئەوەی شەڕ نەکات، نابێتە خاوەن کەسایەتی! بۆ ئەوەی ببی بە جەنگاوەرێك پێویستە لەسەرەتادا رازی نەبیت؛ واتە، رەتی دەکەیتەوە. رووخاندنی هەندێك شت و بونیادنانی هەندێك شت دەخەیتە مێشکی خۆت. ئەگەر لە خۆت رازی بیت، ئەوا شەڕی چی دەکەیت؟ کاتێك لە خێزانی خۆت و کۆمەڵگا رازی بیت، پێویستی شەڕ لە گۆڕێ دا نامێنێ. لەژێر ناوی شەڕ بە ئاژاوەنانەوە خەریك دەبیت. هەروەکو ئەوەی لە کەمالیزمدا هەیە.

لە هەمانکاتدا ئەمانە دەبنە شێوازی هەرە خەراپی نەبوونی ململانێ. هەوڵ نەدان، پووچ بوونە، چوونە ناو یەکترییە.... لە تورکیادا ململانێی بە جوێن و ساختە زۆرن. بەڵام هەرچی هونەری ململانێی راستەقینەیە لەئارادا نییە. شەڕوانی لەپێناو گەل و شەڕوانی لە پێناو سۆسیالیزم لە ئارادا نییە. ئەمە زیاتر بنەمای مێژوویی خۆی هەیە.

شەڕی کۆمەڵگا بوونی نییە.

چی هەیە؟ درۆ و دەلەسە. لە جێگایەکدا ئەگەر راستی نەبێت، ئەوا درۆ دەردەکەوێت. ئەوەتا لە تورکیادا جنێودان بە یەکتری زۆر بەربڵاوە. لەبەر ئەوەی ململانێیەکی راست لە ئارادا نییە. درۆ و سووکایەتی لە جێگای ئەوەدا هەیە. یەکێتی دەستە و پێڕەکان زۆرن، بۆچی؟ چونکە رێکخستن بە پێی پرەنسیپ دانەمەزرێنراوە. ئێستاکە ئەمە لەلای ئێمەش لە ئاستی کارەساتێکدایە. لەبەر ئەوەی ژیان بە پێی تیۆری، نییە. لە ئەنجامدا بێبەش بوون لە شەڕی کۆمەڵگا و لە شەڕی گەل و شەڕی چینایەتی و شەڕی سۆسیالیزم دەبێتە جێگای باس.

ئێستاکە رەوشی من لەگەڵ ئەمانە هەمووی دژبەری پێك دەهێنێ. مەزن بوون یاخود جودابوونی من لێرەدایە.

بەگوێرەی من لەهەل و مەرجی بەم شێوەیەدا ژیان نابێت. ژیانی بێ هەوڵ و تێکۆشان نابێت.

بەڵام لەژێر ناوی هەوڵ و کۆششی بەمشێوەیەش عەنتەری عەیبە، بێ پرەنسیپ بوون عەیبە.

لەڕاستیدا ئەمە کێشەی گەلێکە، کارەکتەرێکە. ئەگەر فکریشم نەبێت، رەوشتم هەیە. پێویستە مرۆڤەکان تا ئەو رادەیە بێ کەسایەتی نەبن. یەکتری هەڵدەخەڵەتێنن. من ئەمانەم لەزووەوە دەستنیشان کردووە. لەنێو خێزانی خۆمدا ئەمانە دەزانم. دایك و باوك رەبەنن. تەنانەت دەکەونە رەوشێکی پێچەوانەی خۆزگەکانی منداڵێکی 7 ساڵانە. بۆچی زۆریان باوەڕ پێ بکەم؟ ئەمانە بۆ مردن ئامادەی دەکەن. دڵخوازنین. بێ دڵن. چونکە لەگەڵ هەموو جۆرە هەڵەیەك یەکدەگرن. ئەو کاتە بۆچی وەکو ئەوان بم.دەتوانم ئاماژە بەگەلێك تایبەتمەندی تری سایکۆلۆجی هاوشێوەی ئەمە بکەم. دەمەوێت ئەمە بخەمەڕوو کە: هەوڵ نەدان بەشێوەیەکی گشتی لەکۆمەڵگادا هەیە؛ لەشوێنی ئەمە هەوڵ و کۆششی ساختە هەیە؛ بێ پرەنسیپە و رێکخستنی نی یە.

حەزرەتی محەمەد گوتوویەتی، شەڕی نەفس گەورەترین جیهادە. واتە ئەو شەڕەی کە لەگۆڕەپانی شەڕدا ئەنجامدەدرێت شەڕێکی بچووکە. گەورەترین شەڕیش ئەو شەڕەیە کە لەبەرامبەر گەوهەری خود ئەنجام دەدرێت. دەرکەوتنی هەندێك لە کەسایەتییە مەزنەکان لە نێو ئیسلاماندا؛ وەکو وەلی یەکان، فەرماندەکان و سەرۆکەکان لەسەر ئەم بنەمایە بوو.

لەمێژووی وەلیەکاندا نموونەی ئەمە زۆرن. مێژووی بەساڵاچوان (پیران) پڕە لەم نموونانە ئەوەی بتەوێت لەپەرتوکەکاندا دەتوانێت بە سەدانیان ببینێتەوە. ئێستا لە هەل و مەرجی تورکیا ئەمە لەنێو چووە. شێوازی پێگەیاندنیان مەترسیدارە. باڵادەستی ئایدیۆلۆژی کۆماری تورکیا، تاك بەڕادەیەکی مەترسیدار دەخات. لەهەمان کاتیشدا خێزان و کۆمەڵگاش کاریگەری لەسەر کردووە کە ئەوانیش لەژێر سێبەری دەوڵەتدان و شوێن پێی ئەوون بەمەش مرۆڤ بەرەوشێك دەگەیەنن کە زیاتر ئیفلیج بێت. چەپی تورك لێی رازی نەبوو. چی پەسند دەکرد؟ لەنێو چۆن لێگەڕینێك دابوو؟ قوڵ نەبۆوە لەوانەیە خواستی لەفیوداڵیزمدا نمونەی ببینێتەوە. نازانم هەرە دوایی، ئەمرۆ سەرمایەداری رۆژئاوا بۆ ئەوان مۆدێلێکی باشە. لەوانەیە ئەگەر شتێکی نوێ دەربخاتە مەیدان، خوازیاری ئەویش دەبن. لێرەدا ئەوەی هەیە دیسان، خۆنەبینینە.

لەشێوازی مندا لاسایی کردنەوە نییە. پێویستە راستییەکان لەنێو خۆتدا پێك بهێنێ و خۆت ببینی. ناچاریە کە شەڕی نێوخۆ ( شەڕی خود) زۆر قووڵ بێت. بەگوێرەی من تێکۆشانی نێوخۆ و شەڕی خود لەئێوەدا تابلێی لاوازە. هیچ یەکێك لەمیلیتانەکانمان ناخوازێت لەسەر پراکتیکێکی خۆی بفکرێت. دەترسێت، کاتێك سەیری ئەو کەسانەی کە ئێستا لێکۆڵینەوەمان لەگەڵدا ئەنجام دان، دەکەم، بەردەوام ئەم شتانە دووبارە دەکەنەوە

"ئەوەی منی خۆش نەوێت PKK شی خۆش ناوێت. ئەوەی منیشی خۆش بووێت PKK ی خۆش دەوێت، منی خۆش بوێت گەلیشی خۆش دەوێت، منی خۆش بوێت مرۆڤی خۆش دەوێت، من هەمموو شتێکم " لێرەدا شەڕی نێوخۆ ( شەڕی خود) و شەڕی سۆسیالیستانە لەئارادا نی یە. لەنێو خۆیدا تووشی نەخۆشی خۆ بەزل زانین بووە.

هەرچەندی مەزن دەبێت، دەبێتە نەخۆشێکی خۆ بەمەزن زان و بەشێوەیەکی سەیر لەخۆی رازی دەبێت. من ئێستا دەڵێم بەتەواوی نەمتوانیوە ببمە مرۆڤێك. رەوشی لەیەکچوی هیچ پیاوێکم نییە. لەو واتایەی کە ئێوە تێیگەیشتوون نەمتوانی ببمە پیاوێك، ئێستا بەباشی ئەمە پێوانە دەکەم. لەدەرەوەی ئەمە هیچ رێگایەکی تر نی یە بۆ تێکشکاندنی پیاوێتی ساختە. کابرا چواربەچوار خۆی پیاو نیشان دەدات، ئێستاکە من باش لەپیاوێتی تێدەگەم. لەنێویدا دیکتاتۆریەت هەیە، گەلێك پیسی هەیە.

پیاوێتی شرۆڤە دەکەم.

پیاو دەکوژم. لە بنچینەدا پێویست بوو ببوایە پرەنسیپێکی بنچینەی سۆسیالیزم. کوشتنی پیاوێتی کوشتنی دەسەلاتە. کوشتنی بالادەستی یەکلایەنە و نایەکسانییە کوشتنی بەدبینییە، هەتا دەچێت واتای کوشتنی فاشیزم و دیکتاتۆریەت و دەسپۆتیزمە.

بۆچی کچان دێنە نێو ریزەکانمانەوە؟ بۆچی دێن؟ چونکە تاڕادەیە ئەو پیاوێتی یەم تێپەڕاندووە لەبەرئەوە دێن. ئەمە زۆر ئاشکرایە، پیاوی کلاسیك بن دەکەوێت.

ئەمەش هەروەکو لەچالاکی "زەینەب کەناجی" یە کانیشدا دەبینرێت. رێگا لەبەردەم قارەمانێتی و پەیوەست بوونێکی مەزن دەکاتەوە. لەبنچینەدا ئەوەی ئەوی بەرەو چالاکیەکی وەها برد، سەرکەوتنی ئێمەیە بەسەر پیاوێتی. ئەمە لەلایەك. باس لەوە دەکەم کە بۆچی وەکو ئەوان نەبوومەتە فەرماندەیەك.

هیچ رەوشێکی وام نییە کە راستینەی فەرماندەیەتی پێکبهێنێ. ئێستاکە خۆی خستۆتە نێوچوارچێوەی فەرماندەیەتیەکی وەها کە (هەلواسین. هەڵدەواسێ، سەربڕین، سەردەبڕێت. ئێستاکە ناچارم ئەمە دەرخەمە روو، کە بۆچی بۆ بەربەست کردنی ئەمە بوم بەکەسێك بەهەزار حال، بەگوێرەی هێڵی سەربازی هەوڵ دەدەم خۆم لەسەرپێ بگرم.

هەوڵ دەدەم زۆر بەباشی کەمالیزم هەڵبسەنگێنم. من ئەوانە بەربەست دەکەم کە وەکو کەمالیزم بەساختە مەزن دەبن. " هەڤاڵ" دەڵێم هێشتان من نەبوومەتە مرۆڤی یەکەم، تۆ چۆن دەبیت بەمرۆڤی دووەم؟. ئەو هەڵوێستانەی لای من غەریب نیین. هەمووی بەرەو تێکشکانی خەیاڵ ئاراستە دەگرێت. چۆن وا دەڵێن، "سەرەڕای ئەوەی ئەوەندە هێزمان بەدەست هێناوە، ئەوەندە هۆشیاریەمان بەدەستهێناوە، چالاکی سەربازیمان ئەنجامداوە، ئەوەندە بەهێز بووین، تۆش تائێستاکە رۆڵی پیاوێتی ناگیرێت، سەرۆکایەتی وەها دەبێت "

بەڵێ، من دەڵێم سەرۆکێکی بەم شێوەیەم، ئەمەیە میکانیزمی منە. بەپێچەوانەی ئەمە گەلێك لەو دیکتاتۆر و ئەوانەی مرۆڤ لەپشتەوە خەنجەر دەکەن. لە کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی ناویندا دەردەکەونە مەیدان. بەبێ رەچاوکردنی راستی چینایەتی، پاکتاوکردنی یەکتری دەردەکەوێتەڕوو.

لێرەدا ئەمە دەردەکەوێتە مەیدان. شێوازی بەڕێوەبردنی یەکێتی من بەچییەوە گرێدراوە. هەڵوێستێکی نائاسایی یەکخەرانەیە. لەکاتێکدا لەلایەکدا ئەوان بۆ شەڕ هاندەدات، لەلایەکی تر ئاراستە کردن بەرەو کۆك بوون و سادەبوون و سەنگینی لەئارادایە. سەرنج بدەن، رەوشێکی زۆر هاندەرانە و سەرهەڵدانیانەیە. تایبەتمەندییەکی دی سەرۆکایەتی ئەوەیە کە زۆر دڵنزمە.

ئایا دەبم بەمرۆڤ. تائێستاکەش بەم شێوەیەم. ئەمە لەخودی خۆشم دا پێك دەهێنم. "سەرکەوتم، ناوبانگم دەرکرد" بەڵام دیسان ئەمانە بەس نابینم. لە رەوشێکی پێچەوانەدا ئەم هەستە، کۆتاییم پێ دەهێنێت. نەفرەت لەمە دەکەم.

پەیوەندی لەنێوان رەگەزەکاندا: بێگومان ئەمە لێرە بەدواوە دەبێتە خەباتێك کە سۆسیالیزم و بەتایبەتیش من, زیاتر هەڵوەستەی لەسەر بکەین، تەنانەت لەو باوەڕەدام سەدەی 21 م دەبێتە سەدەی زیاتر رێکخستنی پەیوەندی نێوان رەگەزەکان. یەکەمین دژە شۆڕش لەگۆڕەپانی پەیوەندی جنسیدا هاتە ئاراوە، هەروەها گەورەترین شۆڕشی کۆتایش لەپەیوەندی رەگەزیدا ئەنجام دەدرێت. ئەو ئەنجامەی تر کەمن پێی گەیشتووم، پەیوەندی نێوان رەگەزەکان خاوەنی کارەکتەرێکی زیاتر تێکەڵ و پێکەڵترە لەوەی کە باوەڕ دەکرێت، مژۆکداری زۆرداری زیاتر حەشار دەدات و گشتگیری دەکات، هەتا مەترسی گەورەتر، ناکۆکی نێوان چینەکان و نەتەوەکان لەپەیوەندی نێوان رەگەزەکاندا شاراوەیە. لەلایەکی تریش زۆر گشتیگیرانەیە و مرۆڤێك کە نەبووبێتە ئامرازێك بۆ ئەمە، ئەوەندە کەمە، دەتوانرێت بگوترێ  نییە. لە رەوشێکی وەهادا لەداهاتوو، ئەو گۆڕەپانەی کە زیاتر خەباتی ئازادی، پێشکەوتنی شۆڕشگێڕی و رێکخستنی لە سەر بەڕێوەببرێت، گۆڕەپانی پەیوەندی نێوان رەگەزەکان دەبێت.

ئەم گۆڕەپانە لەئاین تەسکتر، وەکو تابۆ بیری لێدەکرێتەوە. پێویست دەکات بەسەر ئەمەدا بچین. لەخەباتی خۆمدا یەکێك لەو بابەتانەی کە لەئاستێکی گرنگدا لەسەری راوەستاوم ئەمەیە. بەئاینەوەش خەریك بووم، بەڵام بەقەد قوڵ بوونەوەم لەسەر پەیوەندی رەگەزەکان، زەحمەتیم نەبینی، (جەهالەت) نەزانی لەئاستێکی زۆر بڵندایە. دیسان لەم بوارەدا ژیان خستنە ژێر هەڕەشە و پیسکردنی لەئاستێکی بڵندایە. لەهەمووش گرنگتر خۆشی و هێزی ژیانی کۆمەڵگا بەڕێکخستنی ئەو پەیوەندیانەوە گرێدراوە.

بەدرێـژایی مێـژوو هـەموو کۆمەڵـە چـینایەتیەکان، هـەر هێزێکـی مرۆکـدار تاڕادەیـەك رەگەزیشـی مـژیوە و پلیشـاندویەتەوە. لێـرەدا رووبـەڕووی ناکۆکییـەکی رەگـەزین کـە زۆر لـەوڵاتری نـاکۆکی چـینایەتیە. لـەو بـاوەڕەدام کاتێـك تایبەتمەندیـە سروشـتیەکان و جیـاوازی لەنێوان رەگەزەکان لەسەرئەمە زێدە دەکەین، هەروەها بەکارهێنانی ئەمانەیە، هەم لەلایـەنی پیاو هەم لەلایەن ژن دەبێتە جێگای باس، یەکـەمین بنچینـەیی تـرین و گشتگیرترین نـاکۆکی کۆمەڵگا رووبەڕوومان دەبێتەوە. هەر چینێك کە هاتووە، شتێکی لەسـەر ئەمـە زیـاد کـردووە. کۆیلایـەتی هەنـدێك, فیـوداڵیزم هەنـدێك، سـەرمایەداری هەنـدێکی هەڵمـژیوە و هـەروەها ئیمپریـالیزمیش بەشـێوازێکی تـر مرۆکـداری قـووڵ دەکاتـەوە. ئەمـەش بەشـێوەیەکی وەهـا بـەردەوامی هەیـە، مەحاڵـە لێـی نەترسـێی. یـەکێك لەلایەنـە هـەرە ژێرەکـانی منـیش بەخۆپاراستن لەبەرامبەر ئەمە دەرکەوتە روو. ئێستاکە خۆی لەخۆیدا ژن لەمێـژە لەژنایـەتی دەرکەوتووە. پیاویش چی پیاوێك بێت، رەوشێکە، من نەمتوانیوە بەباشی بیناسم.

بەگوێرەی من هەردوو لاش لەژێر ئەشکەنجەدان.

لەم بابەتەدا تاڕادەیەك خۆم ئازاد کرد و رزگار کرد. ئەم ئازادیەم، تا ئـەو رادەیـەی کـە بـە هـیچ شـتێکی تـر ناگۆڕدرێتـەوە، بـەنرخ دەبیـنم. لەواتایـەکی کلاسـیك دا بەچـاوی زەلامێـك سەیری خۆم ناکەم. ئەگەر ئێوە لەڕەوشی مندا بوونایە بەرگەتان نەدەگرت، مسۆگەر ئەمـەتان شایەستەی پیاوێتی خۆتان نەدەدیت، ژیانێکی زۆر زەحمەتە. بەڵام بۆ من ژیانێکی شۆڕشگێڕی زۆر گرنگـە. تائێسـتاش لێکـەڕینی ژن و پەیوەنـدی ژن، بـۆ مـن کێشـەیەکی زۆر جددیـە و لەپێناویدا هەوڵدەدەم.

مەترسی بوون بـەپیاوێکی کلاسیك لەبەرامبـەر ژن، بـۆ مـن زۆر گرنگـە. بـەردەوام لەسـەر ئەمە فکر و هەڵوێست بەرهەم دێنم.

بەقەد ناسینی خـودی کۆمـەڵگا، ناچـارم تاکـەکانیش بناسـم. دیسان ناچـارم بەسیاسـەتەوە گرێـی بـدەم. بابـەتێکی هەسـتیارە (حەساسـە): لەهـەمووی گـرنگتریش ئەوەیـە کـە گەیشـتۆتە رەوشێکی وەها بۆتە کێشەیەکی هەرە بنچینەیی کۆمەڵگا. نموونە کێشـەی ژمـارەی دانیشـتوان، بەسەری خۆی کێشەیەکی کۆمەڵگایە. بەرهەم، خـاك، بـەش ناکات بۆیـە مسـۆگەر ئـەم بابەتـە پێویستی بەچارەسەری هەیە.

لەلایەکی تر یەکتری خۆش نەویستن لەئاستی هەرە بڵندی دایـە. رەگـەزەکان زۆر بەئاسـانی بـە یـەکتر نـامۆ دەبـن. ئەمـەش بەشـێوەیەکی سـەیر چـۆنایەتی ژیـان دادەمـەزرێنێ و لاوازی دەکـات. بـەگوێرەی مـن ئەمـەش مەترسـیەکی جددیـە. لـەم رووەوە رەوشـێکی نـوێ پێویسـتە. خراپ بوونێکی مەترسیدار لەئارادایە. لەهەمووش گرنگتر ئەوەیە کە ئەمە پێچەوانەی ژیانە، نامۆبوونێکی مەزن لەئارادایە. لەم لایەنەدا هێشتا مەودایـەکی زۆر هەیـە کـە سۆسـیالیزمیش

ببینرێت. لەم رووەوە پێویستە گەلێك زیاتر گرانی بدرێتە سەر پێگەیاندنی مرۆڤی سۆسیالیست.

کێشەی پەیوەندی جنسی کێشەیەکە کەلەلایەن وەستایەکانیش (مامۆستاکان) پشت گوێ خراوە. مسۆگەر چەمك و پەیوەندی مارکس سەبارەت بەژن پەیوەندیەکە لەنێو سنوورەکانی بورژوازیەتدایە. بەئەشق و خۆشەویستی خۆی، ئەمەی تێنەپەڕاندووە. ستالین لەبەرامبەر ژندا بەتەواوی وەکو فیۆدالێکە. لینینیش لەم رووەوە بورژوازیەکی بچووکە.

کێشەی پەیوەندی جنسی (سێکسی) وەکو بابەتێکی کۆمەڵایەتی هەڵنەسەنگێنراوە. سەربەخۆ گرتوویانەتە دەست. بەڵام ئێستا هەموو شتێك ئەوە بە ئێمە نیشان دەدات، بابەتێك نییە کە بەتەنها و سەربەخۆ بگیردرێتە دەست. کێشەی رەگەزی چارەسەر نەبێت، کێشەی سیاسی چارەسەر نابێت، دیموکراسی کۆمەڵایەتی بەدی نایەت. ئەگەر تۆ پەیوەندییەکانت لەگەڵ رەگەزی بەرامبەر یاخود لەگەڵ ئەو رەگەزە رێکنەخەیت، کە لەگەڵیدا دەژیت کامە سیاسەت و دیموکراسی پێشبخەیت؟

پیاوێك کە ژنێکی خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە، نابێتە دیموکرات

بنچینەکانی پەیوەندی، یا لەمیانی ئارەزووی جنسی پێشدەکەوێت، یالەچوارچێوەی ئایدیۆلۆژیای خێزان پێشدەکەوێت. واتە هەرکەس خێزانی پێکهێناوە، منیش پێکی بهێنم. بەگوێرەی من 90٪ لەسەر ئەم بنەمایە پێشدەکەوێت، لەبەرئەوەی بۆتە داب و نەرتێکی باو، لەلایەکیتریش ئارەزوو بخە سەر ئەمە، لە 99٪ پەیوەندی نێوان رەگەزەکان بەمرەنگە دەرکەوتۆتە مەیدان.

ئەمە کێشەیەکی گەورەیە و لەداهاتووشدا زیاتر سوتێنەر دەبێت. جیابوونەوە و دەستبەردان لەیەکتری (تەلاق دان)، نەبوونی داخوازی بوون بەخاوەنی منداڵ، زۆر بەربڵاوە. ئێستا لەروسیا و ئەو دەوڵەتانەی کە سۆسیالیزمی بونیادنراو تێیدا پێشکەوتبوو، لەنێو تێکچوون و خراپ بوونێکی گەورەدا دەژین. کەواتە ئەم کێشەیە داپۆشرابوو، سەرکوتکرابوو.

**"هێشتا ژن پێناسەی خۆی نەدۆزیوەتەوە"**

نەخێر، ئەو ژنەی کە پێویستە، تا ئێستا دروست نەبووە. هەروەکو چۆن مرۆڤی سۆسیالیست دروست نەبووە، ژنی سۆسیالیستیش دروست نەبووە. ناوی ژن هەیە بەڵام بەخۆی هەبوونی نییە. یاخود لەشێوەدا هەیە، لەناوەرۆکدا نییە. پەیوەندییەکی جنسی (مەبەست کاری سێکسی یە) قەبە هەیە، بەڵام دیسان بەخۆی لەئارادا نییە. تەنانەت مەوداکانیش تابڵێی زۆرن ( درێژن). پێشخستنی کەسایەتییەکی سۆسیالیستی چەندە زەحمەتە، پێشخستنی ژنی سۆسیالیست و پەیوەندییەکی سۆسیالیستانەی نێوان ژن و پیاو ، گەلێك لەوە زەحمەت ترە.

چونکە تابوو هەیە و هەرکەس لەم بابەتەدا جاهیلێکی رەشە. لێرەدا داب و نەریت و ئارەزووەکان تابلێی باڵادەستن. ئەمەش تا بڵێی مەترسیدارە.

هەموو کاتێك ژن نزیکی چین و نەتەوە و توێژ و تاکی چەوساوەیە. واتە لەپێکهاتەی سیستەمدا زێدە بەرپرسیارێتی ناگرێتە ئەستۆ. هۆکارەکەی زۆر روونە. چونکە لەژێر دەستپێشخەری پیاودا ئەو دابەشبوونانە (رێکخستنانە) پێشکەوتوون. ژن تا دوارادە بێکاریگەرە و لەدەرەوەی کارەکان هێڵراوەتەوە. لەبەر ئەوە نەهێشتنی داگیرکەری و پێشکەوتنی ئاشتی و رێکخستن و بەهاکانی ژیان، بەشۆڕشی ژنەوە پەیوەندیدارە و هەروەها لەدایکبوونەوەی لەسەر ئەم بنەمایە دەبێت. لەڕەوشی ئاشتی و زیاتر دەوڵەمەندکردنی ژیاندا، ژن دەتوانێ پێشبکەوێت. بەڵام لەجێگایەکدا کە شەڕ هەبێت، پیاو بەهێز دەبێت و پێشدەکەوێت. چونکە ئەوەی پیاوی کردۆتە پیاو، شەڕ خۆیەتی. ئەمە لەهەمانکاتدا گوزارە لەگیانلەبەرێکی مەترسیداریش دەکات. بەئەندازەی ئەوەی سۆسیالیزم توندوتیژی لەئارادا ناهێڵێ، ئەوا بۆ ژنیش بەواتای کۆتایی هاتنی ئەو توندوتیژیە دێت، کە لە کەسایەتی پیاودا بەرجەستە بووە. بەدامەزراندنی سیستەمی سۆسیالیست، لەهەمانکاتدا ناوەندبوونی توندوتیژی پیاویش تێدەپەڕێنرێت. بەمە چی روودەدات؟ لەهەمانکاتدا دەبێتە هەنگاونان بەرەو ئاوابوونی تاکی ئازادیش. هەنگاونان رووەو ئاوابوونی تاکی ئازاد لەهەمانکاتدا بۆ ژنانیش دەبێتە مایەی خۆ ئازادکردن، ئێستاکە لەم قۆناخەدا ژن هەرچەندی لەمیانی ئەدەبیاتی حەزکردنی کوێرانە دەکەوێتە ناو مەسەلەکە. بابکەوێتە ناوی. بەڵام مەودایەکی ئەوتۆ وەرناگرێت. و هەروەها چەندی سەرکوتی دەکەیت، سەرکوتی بکە (بۆ پیاو دەڵێت ــ چارەسەری )، دیسان بەو رادەیە، ناتوانێ خێزان بەیەکەوە بنێ. هەردووکیشیان زۆر مەترسیدارن. پیاو چەندی دەبێتە خاوەن پەیمان و ناموس بابێت!... ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کە لەم مەسەلەیەدا شتێك هەیە. ئەم زاراوانە بەشێوەیەکی زۆر سەیر کراونەتە تابوو و دەپەرسترێن. لەبەرئەوەی هەردووکیان راست نین، پێویستە بگاتە هەلومەرجی سروشتی خۆی.

بۆیە دوبارە پەنا دەبەمە بەر تێزی " مرۆڤی سۆسیالیست". مرۆڤی سۆسیالیست مرۆڤێکە باوەر بەخۆی دەکات. مرۆڤی سۆسیالیست خاوەن توانست و بەهرەیە. مرۆڤی سۆسیالیست دەستی لێبەرنادرێت. مسۆگەر لەپەیوەندی نێوان ژن و پیاویش ئەمانە پێویستن. کاتێك پەیوەندی لەرێگای گوشار و فشار و زۆرەملێ پێشکەوت، مسۆگەر خەراب بوون پێشدەکەوێت. کاتێك مرۆڤی سۆسیالیست خوڵقا، ئەوکاتە دەبێتە مایەی خوڵقاندنی پەیوەندی جوانیش. با هەرکەس چاوەڕوانی پەیوەندییەکی ئازادی یەکاویەك نەکات. هەتا باوەڕ بەوەش مەکەن کە خۆی تا چ رادەیەك موکەممەل بووە. تەنانەت من کە لەم بابەتەدا نامەوێت ببمە پیاوێك

لەواتایەکی کلاسیکدا، دەمەوێت ببم بە سۆسیالیست. بەڵام دیسان ئەمە لەو رەوشەی کە لەئێستا هەیە تابڵێی زەحمەتە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەوڵ و کۆششانە خۆیان جۆش و خرۆشم پێ دەبەخشن و هەروەها بەئەندازەی ئەوەی کاریگەری لەهەموو ژنان بکەم و لەهەڵبژاردەترین پیاویش بەهێزتر بم دەمکاتە خاوەنی بانگەشە.

لەبنچینەدا مرۆڤ چەندی ئازاد دەبێت، دەتوانێت دواکەوتوویی خۆی بەشێوەیەکی بوێرانەتر ببینێ. بەگوێرەی من ئەوەی ئازاد نەبێت دواکەوتوویی ( پاشڤەرۆیەتی) خۆی نابینێ. جددی نابێت و سەنگین نابێت. هەربۆیە نابێتە سەرچاوەی حەز و رێزگرتن. لەبەرئەوەی ئاستی ئازادی هەندێك پێشکەوتووە، تا دەچێت ئەو پەیوەندییە لەلایەن منەوە باشتر دەرکی پێدەکرێت. تیۆری بەرهەم دێنم و تابڵێی بەخۆم باوەڕ دەکەم. لەتێگەیشتنی سایکۆلۆژی جەنگاوەر بگرین تا تێگەیشتن لەپادشا، بەپشتنبەستن بەپەیوەندی دەتوانم ئەمە بە باشترین شێوە چارەسەر بکەم. لەهەموو گرنگتر تا رادەیەك بەگوێرەی ئەم پەیوەندییە سەربەخۆیی خۆم بەدەست هێناوە. ئەمە هێزێکی پێدام کە باوەڕ ناکرێت.

تا ئێستا هیچ سوپایەك ژن و پیاوی بەم شێوەیە نەهێناوەتە لای یەکتری. پێویست بوو بەپێی چەمکە نەریتییەکان و بەپێی یاساکانی سوپای مۆدێرنی شەڕ، وەها نەبوایە. بەڵام بوو. هەڤاڵانمان لەو باوەڕەدان ئەمانە هەمووی لەخۆیەوەو لەدەرەوەی سیستەمێك پێشکەتوونە، وەیا زۆربەیان هەڵدەخەڵەتێن. لەڕاستیدا سیستەمێك هەیە کە دامەزراندووە: ئەوەی لەناو ئەو سیستەمەدا چارەسەر دەبێت چییە؟ هەموو شتێکە، شەڕی مەردایەتییەکی گەورە و ئەزموونێکی گەورەیە. ئەمە تاشەڕی جوانبوون دەڕوات.

رەوشی من جیاوازە. پیاوێکی وەها نیم وەك ئەوەی ئێوە دەیزانن. بەئەندازەی من پەیوەندی جنسی چارەسەر ناکەن. بەئەندازەی من ژن هەڵناسەنگێنن.

40 ساڵە لەسەری قووڵ دەبمەوە. بەگوێرەی من ژن و پیاو لەبەرامبەر یەك، هەریەکە وەکو دەست و پێ سپی یەك وان. دەڵێم " ئایا دەتوانن سەیری یەکتری بکەن؟ " زۆر گرنگە کە بەتێگەیشتن و بێ شەرم کردن سەیری یەکتری بکەن. سەیر کردنێك کە گونجاوی ئازادی و یەکسانی بێت. زۆر گرنگە بەتێگەیشتنەوە سەیر کردن زیاتر گرنگە. بەڵام ئەمە لەئارادا نییە.

بەتایبەتی کەس نایەوێت باوەڕ بەکات کە ژن ببێتە لایەنێکی بە هێز و گرنگ ئەگەر هەبێت ئارەزوویەکی دەسەڵاتە، ئەمەش زۆر مەترسیدارە. بەشێوەیەکی یەکلایەنە لەتیۆردا لەبەرخۆیەوە قسە دەکات، هەقە، دەسەڵاتە، داب و نەریتە. پیاو نابێتە دیموکراسی ئەگەر تایبەتمەندییە بنچینەییەکانی دژ بە دیموکراسی تێك نەشکێنێت، ئەگەر پرەنسیپەکانی دیموکراسی لەپیاودا پێشنەخەن، ئەوا خیانەت لەدیموکراسی دەکەن.

ئایا ئەگەر ئێمە ئەو پەیوەندییە ئەوەندە بەنرخ بخولقێنین، یەکێتی مسۆگەر بەپێی ئەم پرەنسیپە بهێننە دی، ئەوا هێزێکی بێ پایان بەدەست ناهێنین؟ بۆ تێپەڕاندنی هەموو کەموکورتییەکان نابێتە هەنگاوێکی مەزن؟ بۆ دیموکراسییەکی یەکگرتوو، زامنکەری هەرە تۆکمە نابێت؟ ئایا ئەمە نابێتە زەمینەی خێزان و پەیوەندی ژن و پیاو؟ هەروەها ئەمە نابێتە هەنگاوی هەرە مەزن رووە و ئاشتی؟ کەواتە پەیوەندی ئەوەندە گرنگە. ئێستا هی ئێمە بێ ئامادەکارین، بۆ ژن و پیاوانیش دەڵێم: " کاتێك پەیوەندییەکانتان لەسەربنەمایەکی راست ببینم، ئەوا من بەهێزترین چەپڵەتان بۆ لێدەدەم. لەنێو کۆمەڵگادا تاوانە ئەگەر کچ تەنانەت هەنگاو بهاوێژێتە بەر دەرگاش، بەڵام لەلای ئێمە گەیشتۆتە رەوشێك لەسەر چیاکان دەتوانن لەتەنیشت یەکتری بخەون. دەڵێن " تۆ گورگ و بەرخ بەیەکەوە دەژیێنێ "ئەمانە زێدەڕۆیین" مەزنکردنن. ئەوە راستی شەڕ لەمەیداندایە. لەڕوانگەی ژن و پیاودا ناکۆکییە. ئەم ناکۆکییە ناکۆکییەکی بنچینەییە پێویستە نکۆڵی لەمە نەکرێت. ناکۆکییەکی وەها نییە کە سەرچاوەی خۆی لەرەگەز یاخود تایبەتمەندییە سروشتییەکان گرتبێت. ئێستا تا دەچێت زانستیش ئەمە دەستنیشان دەکات. پێویستە ئەم ناکۆکییە روون بکەینەوە. هەموو جۆرە شەڕێك زەحمەتە. شەڕی داگیرکاری زەحمەتە، شەڕ لەدژی ئاغایەتی زەحمەتە، شەڕی پەیوەندی ژن و پیاویش زەحمەتە, ئەوانەی دەڵێن ئاسانە، ئەوا ئەم رەوشە بێواتایە. ئەو رەوشەی کە گرنگی خۆی لەدەست داوە دەردەخاتە مەیدان. بۆچی لەڕۆژێکدا پەیوەندی بەرەو خراپ بوون دەبات؟ بۆچی فرێژییەکان گەیشتوونەتە ئەژنۆ؟ خیانەتیشی لەگەڵدا، بۆچی بەم رادەیە رێگا لەبەردەم ئەو رەوشە دەکاتەوە؟ چونکە لەسەرەتادا شەڕ نازانێت، لەسەرەتادا ئاگای لە شەڕی ژن، شەڕی ئازادی و یەکسانی نییە، ئەمەش ئاسایی دەبینێ, بەپشت بەستن بەپلە و پایە هەڵپەرستە. ئەمە لەتورکیادا بەناو و دەنگە. ئێوە دەزانن جیابونەوەی ژنێك چۆن پەیوەندی بەهەڵپەرستییەوە هەیە. دەتوانین بڵێین لەهەر پەیوەندییەکدا بەکاری هێناوە.

مۆدێلێکی دەوڵەتی ئەفلاتونیش هەبوو. مۆدێلێکی بەبانگەشە بوو. ئێمە ناچارین بەگوێرەی سۆسیالیزم ئەم مۆدێلە پێشبخەین. لەناو ئەودا تەنها خاوەن کۆیلەکان هەبوون. باوەڕ دەکەم هیچ ژنی تێیدا نەبوو. هیچ کۆیلەکەیشی تێدا نەبوو. ئەوەی باسی لێوە دەکەین ژنان و هەموو رەنجدەرانیش لەنێویدا جێگە دەگرن. بەڵام ئەم مۆدێلە هەڵبژاردەیەکی خاوەن ئاستێکی پێشکەوتووتر لەهەڵبژاردەی ئەفلاتون لەخۆوە دەگرێت.

بەڵێ، سۆسیالیزم هەڵبژاردەیەکە، بەم رادەیە لەبنکەوتنەوە مەزن بوون و سەرکەوتن دەئافرێنێ. باشە ئەم هەڵبژاردەیە چۆن پێکدەهێنیت؟ بەڵێ، فێرکردن و تێگەیاندنی ئەمە گەورەترین شەڕە. پەیوەندییەکان بەگوێرەی ئەمە شەڕێکی مەزنتریشن. خۆزیا خولقێنەری پەیوەندییەکی وەها بایا.

بەهای هێنانی ژنێك بۆ ئێرە بۆتە 40 ساڵ نەژیان " واتە هێنانی ژنێك بۆ ناو شۆڕش، بەرامبەرەکەی 40 ساڵ دەستبەردانە لەژیانی شەخسی ـ چارەسەری". هەروەها من لەڕۆژێکدا هەزار جار پیاوێتی خۆم خنکاندووە. من ژن نادەم بەپیاوی وەکو تۆ پوچ. ئەگەر ژنت هەشبێت، ئەوا لێت وەردەگرم. ئێستاکە گەلێك لەڕێگای فێڵبازییەوە ژنانیان بەخۆیانەوە گرێداوە. ژن ژنێتی خۆی بەکارهێناوە و پیاوی خستۆتە دەستی خۆی. ئەمانە جددی ناگرم. چونکە جوانی نییە. دڵخوازی نییە. هەمووی هەڵخەڵەتاندنە. یەکێك ملی گەلێك کەچ کردووە و ملی گەلێك کەسی تریشی کەچ کردووە. یەکێك باوەڕی بەپارەی خۆی کردووە ئەویتریش باوەڕی بەزەبر و زەنگی خۆی کردووە. یەکێکی تریش باوەڕی بە پەیوەندی قەبەی جنسی خۆی کردووە.

**"لێگەڕینی پەیوەندییەك، لێگەڕینی ژنێك، شتێکی جوانە"**

بۆ هەموو کەسێك؛ لێگەڕین لەجوانی شتێکی جوانتریشە. لەچینیش بێت، " مەبەست وڵاتی چینە ـ چارەسەری" لێگەڕین شتێکی جوانە. بابەگوێرەی چینایەتی، نەتەوەیی بیر نەکەینەوە. زۆر بەڕوونی مەترسی دەبینم. ئەگەر لەو پەیوەندیەدا سیستەمێك دانەمەزرێنی، ئەوا نەکو شەڕ کردن بەساڵان، بەڵکو ناتوانی رۆژێکیش چی یە، میلیتانان بخەیتە نێو شەڕەوە. لەسەر پێ راگرتنی کچان نەك بەم شێوەیەی ئێستا، بەڵکو یەك رۆژ ناتوانی لەسەر پێیان رابگریت. لێرەدا پرەنسیپ و سیستەم زۆر گرنگە. دەزانیت پەسندکردنی بەئاسانی بەرەو چی دەبات؟ وەکو ئەوە وایە کە دەست بەسەر شتێکدا بگرێت بەبێ ئەوەی لەپێناویدا شەڕی کردبێت و مافی هەبێت. کوا دەڵێن ژن " ماڵی هەرە بەنرخە ". بەپشت بەستن بە هێزی رێکخستن تەنها ژن یاخود پیاو بخاتە دەست خۆی، هەموو شتێك تەواو دەبێت.

یەکێك لەو زاراوانەی لەم دواییە ویستم پێشی بخەم، شۆڕشی حەزکردنە. لەلای ئێمە کۆکوژی حەزکردنیش هەیە. تەنها هەڵوێستەکانی داگیرکەر نا کە دەبێتە مایەی پەرێشانی. ئەوانەی بەدڵ حەز دەکەن، لەئارادا نین. ئەگەر هەشبێت ئەوا دەبێتە مایەی کۆیلەکردن. ماوەیەکی درێژی ئەمەم هەڵسەنگاند و لەئەنجامدا: ژیانێکی کە خۆشەویستی تیایدا مەیسەر بێت، رێگای خۆشەویستی دروستکردنی پەیوەندی شەڕ لەگەڵ ئەمە، پێشکەوت.

مرۆڤێکی دیاری کراوم خۆش ناوێ. لەمە راستتر زۆر زەحمەتە حەز لەمرۆڤی هەیی بکەم. بەڵام لەمیانی بەیەکەوە گرێدانی مرۆڤی هەیی، لەگەڵ ئەو مرۆڤەی کە من بیری لێ دەکەمەوە، هەست بەجۆش و خرۆشێك دەکەم. بەبۆچوونی من مەسەلەی یەکخستنی ئەوەی هەیە و لەئارادایە، لەگەڵ ئەوەی کە من ئومێدی دەکەم، سەرچاوەی حەزکردنە. ئەگەر ئەمە پێشنەکەوێت، ئەوا دەقیقەیەك چی یە، لەلای نامێنم. ئەوەی ئومێدی نەبێت خۆشم ناوێت. هەڵبەتە ئەمەم بەگوێرەی هونەری شەڕی خۆم ئەنجامدا. ئەگەر مرۆڤێك هەنگاو هەنگاو

خۆی کردە خاوەنی ئومێد، ئەوا پەسەندی دەکەم تەنانەت خۆشم وەکو ببم بەشەیدای ئەو، هەڵدەسەنگێنم.

لەم وڵاتە و لەنێو گەلدا لەڕەوشێکی وەهادا نین کە بگوترێت مرۆڤ وەها ئاسودەیە. لەجێگایەك کە ئەم هەموو ئەشکەنجە و کۆکوژی و هەژارییە هەبێت، هەر مرۆڤێك بەخۆی بڵێت " من مرۆڤم " ئاسودە نابێت. هەر کەسێك بڵێت ئەو مرۆڤەم خۆش دەوێت کە لەئارادایە، ئەوا بەگوێرەی من هەڵەیەکی مەزن دەکات. تاکە مەرج ئەوەیە کە ئەمە هەندێك بەئامانج و ئومێدەوە گرێ بدەیت و بیجوڵێنیتەوە. ئەگەر باش بەڕێوەچوو، بەوەستایانە بەڕێوەچوو، گەیشتە سەرکەوتن، ئەوا چەپڵەی بۆ لێدەدەین. جێگای لەسەر سەرم هەیە.

**"ئازادی؛ مەسەلەی خۆ بونیادنانە بەشێوەیەکی قووڵ"**

ئێستاکە من کێم؟ من چیم؟ ئایا دەمەوێ چی بکەم؟ لایەنی سەیری مەسەلەکە ئەوەیە باوەڕ ناکەم کەس هەوڵی دابێت من بناسێت. هەر کەسێك کە هاتووە، دیار نییە کە خۆی یامنی هەڵخەڵەتاندووە!

گوتم " ناوبانگم بیستراوە و هەروەها حاکمییەتی گشتیشم پێش دەکەوێت". بەڵام ئێوە بەهام پێنادەن. شتێکە باوەڕ ناکرێت. بەڵام راستی یەکە. تەنانەت ئێوە بەئەندازەی بای بزنێکیش نرخ نادەن. جگەرە دەکێشن، بەئەندازەی دوکەڵەکەی نرخ نادەن. بۆچی؟ تەنها سودی لێی دەبینن. خاوەنی هێزم، دێن دەیانەوێ شتێك لەمە وەربگرن. دەتوانم ئەمە ببینم. ئەمە زۆر مەترسیدارە.

هەندێك دەڵێن " پادشا ". "پادشاکان چۆن بیر دەکەنەوە؟" ئەگەر وایە، پادشا بەندەکانی خۆی بەتەواوی گرێدەدات، ئەمە لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا زۆر باوە. خۆ ئەولاو ئەولا دەکەن و دەرازێننەوە، ئەگەر دەسەڵاتێکی وا پێش بکەوێت ئەوا دە جۆر گوشاری لەسەر بەڕێوە دەبات و کەسیش ناتوانێت خۆی بگەیەنێتێ. خۆی لەخۆیدا ئەوانەی بۆ ئێرەش دێن، وا باوەڕ دەکەن رووبەڕووی یەکێکی وامەزن دەبنەوە. وەکو بینا و ئاو دەلەرزن. من خۆشم وام. دەچمە لای هەندێك باڵادەستان، تا مۆخی ئێسقانم دەلەرزم.

دەیانەوێ رێزێك نیشان بدەن. بەڵام تا ئەو رادەیەی کە باوەڕ ناکرێت، دووروونە. دەڵێ، " هاتم "، یەکسەر ئەو مەبەستەی دەستنیشان دەکەم کە لەژێر ناوی رێزەوە هەیەتی. لەرێزگرتن ئەوە تێگەیشتووە کە هەندێك هێز وەربگرێت و بۆ خۆی جیای بکاتەوە. ئێستا کە لەنێو پارتی لەمەرکەزی ئێمەوە بگرین تا ئەوەی نوێ تەقلی دەبێت، شەیدایی بۆ سەرۆکایەتی، یا پەرستنی هێزە، یا بەدوای ئەوەوەن کە هەندێك هێزی لێوەربگرن. ئەگەر بەگوێرەی حاکمیەتی ئێستا هێز بپەرستم، ئەوا دەتوانم ببم بەپادشایەکی باش. ئەوە دەڵێم " کاریگەریەکی وەکو پادشایانم هەیە". بەڵام لەم لاشەوە دەڵێم " رەوشێکی وەهام نییە کە

ببمە پیاو ". بەم شێوەیە ناكۆكی دەهێنمە زمان. لەنێو كورداندا زێدە مرۆڤ ناكەن بەپادشا. ووزە و توانای پێویست بۆ بوون بەپادشا نییە؛ زەحمەتە كۆمەڵگا ئەو هێزە نیشان بدات. چونكە ئەو ئەوهێزەی لەدەست دەرهێنراوە.

ئەمە لەنێو كۆمەڵگای توركیادا لەوانەیە ببێت. بۆ خوڵقاندنی سەرۆك گونجاون، لەتوانایاندا هەیە. لەكۆمەڵگای ئێمەدا تەنانەت مەسەلەی هێزێكی وەها جێگای باسیش نییە. ئەوەی دەستنیشانكەرە زیاتر دزینی هێزە. لەڕاستیدا لەنێو مەركەزی ئێمەدا یا لەناو پارتیدا ئەمە زۆر دەبینم. تا دەچێ دەستی خۆی درێژ دەكات و دەڵێت "هەندێكیش من وەریبگرم" شێوازی بەخشینیشی راست نییە. ئەگەر شێوازی بەخشینیش بەگوێرەی سۆسیالیزم دیموكراسی بێت، ئەوا زۆر باشە. دیموكراسی پێشدەكەوێت، سۆسیالیزم پێشدەكەوێت. بەڵام كاتێك دەیدات، وەكو كۆیلە دەیدات. وەكو حەمباڵێك دەتەوێ لەشێوەی وشتر دایقورتێنێ.

كەسانی واش هەن كە دوژمن خواستویەتی كاریگەری لێ بكات زۆر بەئاشكرا دەیبینم تەماشای ناو چاوم دەكات و دەڵێت " سەرۆكی من تۆ نەبیت منیش نازیم" ئەمە دەستنیشانكردنێكی راستە. بەڵام لەژێر ئەم قسەیە چی شاراوەیە. كەم تازۆر سەرۆك هێزێكی دیاریكراوی كەڵەكە كردووە . ئیدی بەگوێرەی وەستایی خۆی بەگوێرەی بەڕێوەبردن و چالاكی خۆی ئەوە زۆر باش دەبینێت. ئەو پیاوەی ئێمە بناوی (X)ی بۆ دابنێین لەژیاندا 40 تەقەلە لێبدات كەس پێی ناڵێت " مەرحەبا فلان بەگ، ژنانیش ناڵێن چۆنی" بەڵام لەنێو PKK دا بەگوێرەی خۆی هەندێك هەڵكشاوەتە سەر و گەیشتۆتە ئاستێكی دیاری كراو. ئەم ئەشقە لەخۆیدا دەبینێت: " چ مەعریفەتێك لەمندا هەیە" باشە دوێنێ كەس لەجێگای فلسێكی دانەناوە، ئێستا لەسەر دە هەزاران چۆن حوكم دەكات. لەمەش زیاتر چۆن دەتوانێ مرۆڤەكان هەتا مردن بەپارتی و ئامانجەكانیەوە گرێدەدات. ئەمە حەزكردنێكی كوێرانەی مەترسیدار پێشدەخات. تەنانەت دەڵێت" لەم ئاست و جێگایەدا كێ من بەربەست دەكات". ئیدی ئێستا لێرەدا هێواش هێواش ئاستەنگ بوونی من لەپێش خۆی جێگای باسە. یەكێك لەیاساكانی تری رۆژهەڵاتی ناوین دەردەكەوێتە مەیدان. دەبێت بەپادشا بەڵام دەبێت هی پێش خۆت لەسەر تەخت بهێنیتە خوارەوە. خۆزیا هەندێك بەشێوەیەكی دیموكراتی بێت، دەڵێم تكا دەكەم " من دەمەوێت خزمەتی ئێوە بكەم، كاری رێكخستنت لەگەڵدا دابەش بكەم، لەگەڵ تۆدا گفتوگۆ لەسەر شێواز و خێرایی و بڕیاری هاوبەش بكەم، بەشی زۆری توانستی دەسەڵات بۆ ئێوە بێت" نەخێر یا دەبێتە كۆیلەیەكی باشی پادشا، یا پادشا لەسەر تەخت دەهێنیتە خوارەوە. شێوازێكی هەرە باوی رۆژهەڵاتی ناوین، دژە دیموكراسی و زاڵمانەیە. ئەمەی لەپراكتیكی خۆیدا ئەنجام داوە. باشە ئێستا تاوەكو كەی بەمنەوە گرێدراوە؟ زۆر بەباشی لەدیالێكتیكی رۆژهەڵاتی ناوین تێدەگەم و دەزانم، تا ئەو رادەیەی كە باوەڕ ناكرێت

هەستیاری نیشان دەدەیت. ڕێزی زۆرە دەڵێت " سەرۆکی من بێ سنوور خۆشەویستی، بێ سنوور ڕێز، بێ سنوور پەیوەست بوون" بەباوەڕیشەوە ئەمانە دەڵێت.

دەیەوێت ببێتە پادشا. پادشایەکی لێهاتوو؟ پادشای کۆمێدی! لەمیانی ئەو سیاسەتەی بەڕێوەم بردووە ئەمە مەحاڵە. بەڵام کولتوور ئەمەیە، لەتورکان فێر بووە. لەڕاستینەی کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی ناوین فێر بووە. لەمە زیاتر شتێکی تری بەمێشکدا نایە. دڵ و مێشکی بەتەواوی پڕە لەمانە. من زەحمەتی هەرە گەورە لەبەرامبەر ئەم جۆرە کەسانە دەبینم. بەگوێرەی ڕەنجی خۆی سۆسیالیستە. زۆر بەباشی تیۆری سۆسیالیستی دێنێتە زمان. لەنێو گەل دێت دەست و پێ سپی یە، بێ دایك و بابە، وەها گەورە بووە. ئەگەر ئەم ڕاستییەی بێتەوە یاد ئەوا مسۆگەر پێویستە ببێتە دیموکرات و سۆسیالیست. بەڵام ئەگەر بەگوێرەی خۆت بەپێ پلیکانی سیاسەتدا هەڵبکشێیت ئەوا ناتوانی بیگەیتێ. ئێوە بڵێن؛ کولتووری سەرمایەداری کولتووری دیموکراسی لەئارادا نییە. هەموو ئەمانە ڕاستن. دەڵێن ڕاستینەی ڕۆژهەڵاتی ناوین وەهایە، ئەمەش ڕاستە. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە سەرناکەوین؟ یاخود ئایا بەسەر سەردەمدا تێپەڕم.

کێ من دادەنێتە شوێنی سەلاحەدینی ئەیوبی؟ نازانم کێ... بەڵێ لە ڕۆژنامەیەکدا بینیم، نووسرابوو ماویزم لەگەڵ ئیسلامییەت یەکبخات، بێ وێنە دەبێت موشەکی هەرە پێشکەوتووی ڕۆژئاوا ناتوانێ شتێك بکات. هیچ پێویست ناکا من وەها بەخۆم باوەڕ بکەم. بەڵام هەڵبەتە لەمیانی پراکتیکێکی دیار و قووڵبوونەوەیەکی دیار وەکو تاکێك بەرخۆدان دەکەم.

پێویستە ئەوە دیاری بکەم کە لەنێو شێوازی بەرخۆدانێکی سۆسیالیستییانەی سەیر دام.

ئەمە ڕەوشێکە زۆر لەولاوەی بوون و بوونە پادشایەتیەوەیە. بەگوێرەی من، ملکەچ نەکردن بۆ پێوانەکانی کۆمەڵگای کلاسیکی ئێستا زیاتر گرنگە. بێ سنوور نەفرەت لە بەندایەتیش دەکەم هیچ نییەتی وەهام نییە ببم بەپادشا.

ئەی باشە دەتوانم ببم بەچی؟ ئێوە دەڵێن" ئەوەیە ڕاستی ئاستی هەرە بڵندی مەزنایەتیش ئەمەیە 99٪ی حاکبوونیش ئەمەیە. ئەمە ڕاستییەکە پێویستە بیهێننە بەرچاوی خۆتان. بەڵام بەگوێرەی من دیسان ئازادی شتێکی گرنگە، تابڵێی پێویستە لەم بابەتەدا شێوازی من لەبەرچاو بگیردرێت.

بەهیچ شێوەیەك نامەوێت ئێوە بچووك بکەمەوە. ئازادیخوازان بەهەند وەردەگرم. ڕێزم هەیە بۆیان. بەڵام سەرەڕای ئەوەش لەمەسەلەی سۆسیالیزم و ئازادیدا ڕەوشی ئێوە بەدڵسوتاوی دەبینم.

لەم ڕووەوە هەمووتان بچووك دەکەمەوە. وەك بڵێی خۆم بەتاقانە لەقەڵەم دەدەم. پێویستە ئەم تاقانەییە وەکو پاشایەتیەك هەڵنەسەنگێنرێت. دەتوانن بڵێن " ڕەنجدەری

مەزنی بەتەنیا ماوی ڕێپێوانی ئازادی و سۆسیالیزمیش". چونکە لەکوێ لێکۆڵینەوە لەسەر ژیانم دەکەن بکەن، کەسایەتییەکە بۆخۆی خۆی بەڕێوە دەبات. بەڵام پاشا بەم شێوەیە نییە. پاشا لەسەرشانی هەندێکیتر بەرز دەبێتەوە. یان بەپێی خەڵك، یا بەگوێرەی ئایین، یاخود هێزێك هەیە کە ئەو بەرز بکاتەوە. بەئەندازەی میلیمێکیش هێزێکی وەها بۆ من لەئارادا نییە. زیاتر لەڕەوشی کەسێك دەچێت کە لەتەمەنی 7 ساڵانەوە تائێستا بەڕادەیەك کە باوەڕ ناکرێ بەهەستیاری و وشیاری یاخود بەڕۆشتن لەهەڵدێرانەوە، بەهەنگاوەکانی خۆی هاوسەنگی خۆی خولْقاندووە و بەڕێوەی بردووە. مسۆگەر رەنجی سۆسیالیستانە هەیە؛ هەم لەڕووی فکری هەم لەڕووی پراکتیکیەوە کارزانی هەیە. هەستیاری مەزن هەن، پەیوەستبوون، ئارەزوو، کین، نەفرەت، حەزکردن ئەمانەی هەموو هەن.

ئەوە پەسند دەکەم کە لەگەڵ مرۆڤێکی ئاساییدا بم بەڵام بۆ تێگەیشتن لەمرۆڤە مەزنەکانیش هەوڵ دەدەم، لەگەڵ ئەمانەدا نامۆ نیم. ئەمانە هەمووی لای من وەکو شێوازێکی ژیان وایە. بۆ سەرکەوتنێکی سنووردار و ناوبانگ دەرکردن سیاسەت ناکەم. پارتی و سوپاش بۆ ئەمە دانامەزرێنم. خۆئازادکردن بەپێی پێوانە سۆسیالیستیەکان بۆمن بەرجەستەکردنی راستییەکە. بەبێ ئەوەی بەرگە بگرێت.

چۆن لەئازادی تێدەگەم؟ کاتێك هەندێك راستی دەهێنمە زمان, ئەم راستیانە بە گوێرەی هەندێکان هێڵی سیاسییە. بە گوێرەی هەندێکان تایبەتمەندییەکی دیموکراسی ئەم هێڵەیە, تایبەتمەندییەکی سۆسیالیستی ئەم هێڵەیە. بە گوێرەی هەندێکانیش تایبەتمەندی ئابووری,کلتووری ئەم هێڵەیە و....هتد. ئێستا ئەمانەش بەو رادەیە گرنگ نین.

ئازادی، مەسەلەی خۆی بونیادنانە بەقووڵی. دەتوانین وەکو مەسەلەی خۆ گەیاندنە ئیرادەیەك و گوزارە کردن لەخۆ لەبەرامبەر هەموو ئەو خووانەی کە سەدان ساڵ پێش ئێستا بەدەزگا بوونە؛ پێناسەی بکەین. دەتوانن رەهەندی ئیمپریالیزمیش لەمە زێدە بکەن، هەر کەس دەزانێت کە داگیرکەری و ئاغایەتی و دامودەزگاکانیان....هتد. تا چ رادییەك رێگای لەبەردەم کاردانەوە کردۆتەوە, لە بەرامبەر ئەمانەش لەتێکۆشانی ئایدیۆلۆژی و سیاسی و رێکخستنی دا هیچ درێخیمان نەکردووە.

تیۆریزانێکی زۆر باشم. پێکهێنەرێکی هێڵی سیاسی زۆر باشم، رێکخستنێکی تێر و تەسەل، کەم تازۆر لەبەرچاوگرتنی ئسلوبی ئەو خیتابەتەی ئەو، ئەمانە هەمووی هەن. بەڵام ئەمانە بۆ من تەنیا شێوەکارین بۆ دەرەوە، یاخود وەڵامدانەوەی ئەوانەی دەورووبەرمانە، هەتا بۆ خەریککردنی ئەمانەیە.

کاری بنچینەیی تاڕادەیەك جیاوازە. لەکاتی خۆ بونیادناندا؛ قووڵبوونەوە، تێپەڕاندنی تاقیکردنەوەی راستیەکان. رووداوێکی جیاوازترە. نموونە، شێوازی سیاسەتکردنی چەپی

تورك، زۆر گشتی یە و پەیوەندی زۆری بەرووکارەوە هەیە. پەیوەست بەناوەڕۆکەوە و دان پیانانێك لەئارادا نییە. ئەمە بۆ هەموو بنكەی خۆشمان دەڵێم: داننان بەشتان زۆر ساختەکارانەیە، بۆ ئەوەیە کە خۆی هەندێك زیاتر بشارێتەوە. لەڕاستیدا پێویستە وەها نەبێت. تەنانەت نزیکی خۆشی نابێتەوە ئەگەر نزیکیش بێتەوە زۆر بەلەرزۆکییەوە لەزووەوە تەواو بووە و کۆتایی پێهاتووە، لەترسان بەشێوەیەکی سەیر دەکەوێتە پاراستنی روخساری کۆن. لەهەموو ئەمانە تێدەگەم و شییان دەکەمەوە و چارەسەرییان دەکەم. یەکێك کەهەموو ئەمانە بەم ڕادەیە بگرێتە دەست، بائەوە لەو لاوە بمێنێ کە دەتوانێ ببێتە پاشا، لەواتایەکی کلاسیکی دا. لەسەر تەخت لادانی پاشای بەمشێوەیە کاری رۆژانەی ئەوە. لەبەرامبەر بێ ئیرادەیی، لەبەرامبەر کۆیلایەتی... یەکەمین شەڕم لەبەرامبەر ئەم رەوشانە دەستپێکرد، من ترسام لەدامودەزگاکان و پێگەیشتن و ژیانکردن بەپێی ئەم داب و نەریتانە. ئەو کاتانە لەنێو گوند دا دەیانگوت " شێتی چۆڵەوانی " گەلێك ناوی وەهایان پێوەکرد. بەدڵم نەبوو. بەکەناری کۆبوونەوەکانی غولامەکانی ئەواندا تێنەدەپەڕیم بیر بکەنەوە؛ تیۆر و میلیتانێتی وەها لەئارادا نییە. منالێکی گوندی ئاسایی ناخوازێت بچێتە نێو ئەم کۆڕ و کۆبوونەوانە، کاتێك بشچێت بۆ شتێکی جیاواز دەچێت، ئایا ئاخافتنێکی سەرنج راکێش هەیە؟ مسۆگەر بۆ ئەوە دەچم کە بتوانم شتێك ببینمەوە.

هەموو هەڵسوکەوتەکانم بەگوێرەی داخوازی ئازادی تاکە.

شەڕێکی مەزن لەبەرامبەر چەمك و پاشماوەکانی کۆیلایەتی و بەندایەتی هەیە. ئەمانە من بەرەو کوێ دەبات؟ تا ئەو رادەیەی کە توانیویەتی ببینێ لەڕاستینەی کوردانـدا گەلێکی هەڵسەنگاندووە کە؛ کۆیلەترین گەل بوو و ببوەمایەی سەرسوڕمانی هەموو کەسێك، بەڵام ئێستا هاتۆتە رەوشی گەلێك کە بەگوێرەی پێوانەکانی دونیا شەڕ دەکات. پەیوەندیەکانی داگیرکاری نا، بەڵکو تەنانەت رەوشی داگیرکەری لەڕۆحیشیدا تەنها بەمشێوازە دەتوانرێ بشکێنرێت.

ئەگەر بگاتە شێوازی من ئەوا تێکی دەشکێنێت، بەڵام ئەگەر بێت و پێی نەگات ئەوا مسۆگەر هیچ شتێك سەرناخات. بەگوێرەی من ئەمە مۆدێلێکی راستینەی رۆژهەڵاتی ناوینە.

ئازادی دەیانەوێ؟ تاڕادەیەك وەکو من دەکەن؟ لەنێو خۆم دا سیستەمێکم دامەزراندووە. ئەمە سیستەمێکە بەگوێرەی زانست و مۆڕاڵ و فەلسەفە و سۆسیالیزم.

بەردەوام بەڕای گشتی و بنگەی خۆمان دەڵێم بەهەندی وەربگرن. بەڵام ناتوانن بەهەندی وەربگرن. بۆچی ناتوانن بەهەندی وەربگرن؟ چونکە ئەو دەوروبەرەی کە تیایدا مەزن بووە ئەوی بەدیل گرتووە. گوتیان تۆ ژیان لەئێمە دەدزیت دوژمنیش گوتی ئێوەی هەموو لەڕێگا دەرخستوە. لەبنچینەدا هەم لەناو ئێمەدا و هەم لەدەرەوە بەهەمان زمان قسە دەکەن. بەڵام

سەرەڕای ئەمەش زۆر بەکاریگەرم. باوەڕ دەکەم کە ئەمە تاڕادەیەك قەناعەتی ئەوە دروست دەکات کە سیستەمێکمان پەیدا کردووە.

مۆدێلی کەمالیزم و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە زۆر بەرفراوان و باڵادەستە مۆدێلی وەهان کە تەنازولیان بۆ ناکەم. ئەگەر بەدەسەڵات بوون وەهابێت من هیچ نزیکیشی نابمەوە.

لەبنچینەدا نامەوێت وەکو تاکێك بژیم. پێویستە هیچ کەسێك وا بیر نەکاتەوە کە نکوڵیم لەتاك کردووە. ئەو کۆمەڵگایەی کە بتوانێت تاك پەسند بکات هۆکارێکی بنچینەییی شەڕە. بەڵام مسۆگەر دامەزراندنی کۆمەڵگا بۆ ئەوەی تاك ژیانی خۆی بەردەوام بکات دەبێتە هۆکاری شەڕ. پێویستە کۆمەڵگا تاکی خۆی تێر و تەسەل بکات، یاخود تاکی خۆی لەبەرچاو بگرێت. سوسیالیزمی بونیادنراویش بەتەواوی چاوپۆشی لەمەکرد. شتێکی وەهایان ئەنجامدا کە تاکیان لەنێوکۆمەڵگادا پەرێشان کرد دەتوانین بەمە بڵێین دژە دیموکراسیش. مسۆگەر ئەمە پەسند ناکەین. کۆمەڵگا بۆ من ئەوەیە کە بتوانم پەسندی بکەم و لەنێویدا هەناسە بدەم.

دەمەوێت بیرەوەریەکی خۆم بەبیر بهێنمەوە، چوومە وولاتێکی سۆسیالستی سەیرم کرد رۆحم تەنگەتاو دەبێت. هیچ لەڕەوشێکی واشدا نەبووم کە رەخنەی تیۆری لەسۆسیالیزمی بونیادنراو بگرم. تەنانەت رۆحم تەنگەتاوبوو بەس، گوتم لێرەدا شتێکی بەگومان هەیە. لەو جێگایەی کە روحم بەباشی هەناسە نەدات. ئەوا بەگوێرەی من نابێتە سۆسیالیزم. ناکۆکی خۆم خستە مەیدان.

مسۆگەر پێویستە کۆمەڵگا گوزارە لەهەناسەدانی تاك بکات. هەڵبەتە پێویستە تاکیش ئەوە بزانێت کە لەئاستێك بەدواوە ئازادیەکان پەیوەندی بەشێوەبەندی کۆمەڵگاوە هەیە. بێ سنوور مەزن کردنی تاك لەبەرامبەر پێشکەوتنی کۆمەڵگا و کۆمەڵکاری کۆمەڵگا، زۆر مەترسیدارە. پێشکەوتنی دژە دیموکراسی تا ئەو ئەندازەیە هۆکارەکەی هەڵوێستی دژبەرانەی تاکە لەبەرامبەر کۆمەڵگا.

ئێستا پاوانەکانی (مۆنۆپۆلەکانی) ئیمپریالیزم گەورەترین مەترسین لەسەر مرۆڤایەتی. بۆچی؟ هێزێکی تاکڕەوی وەهایان بەدەستهێناوە و لەگەڵ تەکنیك بەشێوەیەکی وەها بەهێزیان کردووە کە پیرۆزترین بەهای کۆمەڵگا، واتە ئەو بەهایانەی کە مرۆڤیان کردۆتە مرۆڤ، هەروەها پەیوەندیەکانی سروشت، پەیوەندی سروشت و کۆمەڵگایان گەیاندۆتە بەردەرگای دارمان.

لەبەرئەوەی پاوانخوازی گونجانی کۆمەڵگای بەتەواوی تێکداوە، کارەکتەری ناکۆکییەکانی، بەتەواوی گۆڕیوە. ناکۆکی چینایەتی، ناکۆکی نەتەوەیی کەوتۆتە پلەی دووەم. لەهەمان کاتدا ئەمە دڕندەکردنی تاکە. روخاندنی ئەو بەهایانەی کە مرۆڤیان هێناوەتە رۆژی ئەمڕۆ و کردویەتی بەکۆمەڵگا، لەنێوبردنی کۆمەڵگا، دابڕاندنی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و سروشت...

لەئەنجامـدا بەتـەواوی بـەئاژەڵ بـوون لەبنچـینەدا لەسۆسـیالیزمی بونیادنراویشـدا هەنـدێك درنـدەی کۆمـەڵگا پـێش کـەوتن. دەتـوانین بەمـە بڵـێین درنـدەی دەوڵـەتیش، هەرچـی لەئەمریکاشـە تاکـە درنـدەکان پێشکەوتن. لـەژێرناوی کۆمـەڵ نـەنکوڵی کردنـی تـاك راسـتە، نەبگوترێت هەرشت لەپێناو کۆمەڵگا و دەوڵەت راستە. لەتورکیاشدا تاك سفرە. ئایـدیۆلۆژیای (هەر شت لەپێناو دەوڵەت) باڵادەستە. لەدواییـدا ئـەم تاکـە مسۆگەر هـەروەکو رێـزی دونیـای کۆنەکردۆتەوە، هەرکەس بەکەمی دەبینێ. بەئەندازەی سەرلەنوێ گرتنە دەسـتی تـاك، کـە بـۆ تێپەڕاندنی ئەمانە رێگا لەبـەردەم پێشکەوتنی تـاك بەشێوەیەکی تۆکمـە دەکاتـەوە پێویسـتە کۆمەڵگاش بێهێنرێتە بەرچاو. مسۆگەر پێویستە پەیوەندی تاك و کۆمەڵ لـەم چوارچێوەیەدا لەمیانی نزیك بوونەوە بەپرۆگرامێکی رێکخستنی، لەمیانی شەڕدا رێکبخرێتەوە. لەم بابەتەدا باوەڕدەکەم کە هەم زانام و هەم بەئەزمونم.

بـەمرۆڤ و مرۆڤـی هـەرە بـاش بـاوەڕ دەکـەم. لەمـە راسـتتر لەمنـدا خوڵقانـدن لەئاسـتی پەیوەستبوندایە. بەشەو و رۆژ کارم خەریك بوونە بەمرۆڤـەکان. کـاری هـەرە گەوهـەری چـی یـە؟ خـەریك بـوون بەئایدیۆلۆژیـەوە. خـەریك بـوون بەئاسـتی رێکخسـتنی ئەمـە. قارەمـان و جـوانی دنیـاش بێـت، بـەڵام ئەگـەر بێـت و لایـەنی ئایـدیۆلۆژی و رێکخسـتن و پێکهێنـانی (پراکتیزەکردنـی) نـەبێت، ئـەوا دەڵـێم پێـنج فلس ناهێنێـت و ڤینێکـی مـەزن نیشـان دەدەم. بەئەندازەی ئەوەی شێوازی پێگەیاندنی مرۆڤی سۆسیالیست خـاوەنی پرەنسیپ دەبێـت، ئـەوا ناچارە لەڕووی پراکتیشیدا کـارزانی هـەبێت. بـەم شـێوەیە مرۆڤـی سەرکەوتوو دەردەکەوێتـە مەیـدان. ئەگـەر مرۆڤـی سـەرکەوتووت دەرخسـتە مەیـدان، ئـەوا بزووتنەوەیـەکی رزگـاری نەتەوەیی سەرکەوتوو و، سۆسیالیزمی زانستیش دەردەخەیتە مەیدان.